

# ڕۆڤار

97
پاییزی
2023

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک



# د. مارف خەزنەدار

## ئەوینێکی ڕەنگرێژ بۆ ئەدەب و نیشتمان


ژمارە ٩٧
پاییزی ٢٠٢٣
ڕۆڤار
ڕۆڤار، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێکی کورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
سێ مانگ جارێك دەریدەکات
یەکەم ژمارەی ڕۆڤار ٥-٥-١٩٩٩ دەرچووە

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
بەختیار حەمەسوور

گرافیك دیزاین
ئارام عەلی

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ: ٢٥٠٠

ناونیشان
سلێمانی- شاڕێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.sardem.org

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

سەرۆکی فەخری
شێرکۆ بێکەس

سەرۆکی دەزگا
ئازاد بەرزنجی






بەڕێز فاروق مەلامستەفا سپۆنسەریی ئەم ژمارەیەی کردووە.

# کورتەیەك لە ژیاننامە و کاروکردەوە زانستی و ئەدەبییەکانی

# مارف خەزنەدار



ناوی تەواوی (مەعروف عەبدولقادر مەعرووف عەزیز ئاغای خەزنەدار)ە. لە نێوەندی ئەدەبی و زانستی و لە نووسینەکانیدا بە (مارف خەزنەدار) ناسراوە.

لە ١٩٣٠/١١/١ لە شاری هەولێر لە گەڕەکی سەعدوناوە لە دایکبووە. خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی (ئەربیل ئوولا) لە هەولێر تەواو کردووە. خوێندنی ناوەندی لە هەولێر و پۆلی چوارەمی دواناوەندی بەشی وێژەیی لە کەرکووک تەواو کردووە. ساڵی ١٩٥١ بڕوانامەی دواناوەندی لە شاری هەولێر بەدەست هێناوە.

ساڵی ١٩٥٢ دەبێتە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی لە هەولێر، لە پاشاندا وەک فەرمانبەر لە بەڕێوەبەرایەتی مەعاریف (پەروەردە) دادەمەزرێت. دواتر ڕاژەکەی دەگوازرێتەوە بۆ شارەکانی (کوت) و (بەغدا) تاساڵی ١٩٥٧ بەردەوام دەبێت.

ساڵی ١٩٥٧ بڕوانامەی بەکەلۆریۆسی لە زمان و ئەدەبی عەرەبی لە کۆلێژی ئاداب و زانست لە زانکۆی بەغدا بەدەست هێناوە. لە ماوەی خوێندنی زانکۆدا لە هەمان کاتدا فەرمانبەریش بووە.

لەسەر داوای خۆی دەبێتە مامۆستای زمانی عەرەبی لە قوتابخانەی ناوەندی شەرقیە، هەروەها مامۆستا بووە لە دواناوەندی کەرکوکی ئێواران لە نێوان ساڵانی (١٩٥٧-١٩٥٩).

لە ئاداری ساڵی ١٩٦٠ پەیوەندی بە نێردەی زانستی عێراقییەوە دەکات، بۆ خوێندنی باڵا ڕوودەکاتە وڵاتی ڕووسیا (یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو). سەرەتا بۆ ماوەی ٩ مانگ وەک قوتابی لە پەیمانگەی فێربوونی زمانی ڕووسی بۆ قوتابیانی بیانی لە مۆسکۆ دەمێنێتەوە، دواتر دەچێتە شاری سانت پیترسبورگ وەک قوتابی خوێندنی باڵا لە بەشی خوێندنی کوردی لە ئامۆژگای خوێندنی ڕۆژهەڵاتناسی سەر بە ئەکادیمیای زانستی ڕووسی، لەم شارەدا نیشتەجێ دەبێت. هەموو قۆناغەکانی خوێندنی باڵای بە سەرکەوتوویی بەڕێ کردووە، لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ پلەی دکتورای لە بواری خوێندنی زمانەوانی و ئەدەب











بەدەست هێناوە. گفتوگۆی تێزی دکتۆراکەی لە کۆلێژی ڕۆژهەڵاتناسی لە زانکۆی سانت پیترسبورگ ئەنجامدراوە و بە کۆی دەنگی ئەندامانی لیژنەی گفتوگۆ، بڕوانامەی دکتۆرا و نازناوی زانستی پێدەدرێت.

لەبەر ئەوەی بابەتی تێزی دکتۆراکەی بە ناونیشانی (مێژووی ئەدەبی کوردی نوێ ١٨٩٠-١٩٦٠) زۆر گرنگ بووە، بۆیە لیژنەی گفتوگۆ بڕیاریاندا تێزەکە لە دووتوێی کتێبێک چاپ بکرێت. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٦٧ لە لایەن دەزگای چاپی سەر بە ئەکادیمیای ڕووسی لە مۆسکۆ بە زمانی ڕووسی چاپکرا، ئەمەش یەکەمین کتێبە دەربارەی ئەدەبی کوردی کە بە زمانێکی بێگانە چاپ بکرێت.

لە نێوان ساڵانی (١٩٦٣-١٩٦٨) دەبێتە کارگەریی زانستی لە ئامۆژگای خوێندنی ڕۆژهەڵاتناسی لە شاری سانت پیترسبورگ. لە ماوەی کارکردنی لەم دەزگا زانستیەدا بەشداری کردووە لە ئامادەکردنی فەرهەنگی کوردی - ڕووسی لەگەڵ چەند لێکۆڵەرەوەیەکی تر، ئەم فەرهەنگە لە ساڵی ١٩٨٣ لە مۆسکۆ چاپکراوە. هەر لەو ماوەیەدا کۆمەڵێک کاری زانستی دەربارەی هەردوو شاعیری کورد نالی و میسباح دیوان ئەنجامداوە. دواتر ئەم لێکۆڵینەوانە لە شاری بەغدا چاپکراون.

مامۆستای زمانەکانی کوردی و عەرەبی بووە بۆ کارگەران و توێژەرانی زانستی لە بەشی کوردی و بەشی عەرەبی لە ئامۆژگای خوێندنی ڕۆژهەڵاتناسی.

لە ماوەی کارکردنی لە ئامۆژگا بەشداری لە هەموو کۆنفرانسە زانستیەکاندا کردووە بە پێشکەشکردنی توێژینەوە، ئەم توێژینەوانە لە کتێبی تایبەت بە کۆنفرانسەکان بڵاوکراونەتەوە.

بەشداری لە ژمارەیەکی زۆر لە کۆنفرانس و سیمینار و کۆڕبەندی ڕۆژهەڵاتناسی کردووە، کە لە وڵاتی ڕووسیا ئەنجام دراون، هەروەها بەشداری کردووە لە کۆڕبەندی جیهانی بۆ خوێندنی ئەدەبی ڕۆژهەڵاتی، کە لە مۆسکۆ لە پاییزی ساڵی ١٩٦٧ ئەنجامدراوە. بەشی هەرە زۆری ئەو بابەت و توێژینەوانەی کە لەم چالاکیە زانستیانە پێشکەشی کردوون بە زمانی ڕووسی بڵاوکراونەتەوە.

دوای گەڕانەوەی بۆ نیشتمان لە ساڵی ١٩٦٨ دەبێتە مامۆستای ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی لە بەشی زمانی کوردی لە کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی بەغدا، دواتر دەبێتە سەرۆکی ئەم بەشە، وەک مامۆستا بەردەوام دەبێت لەم بەشە تا ساڵی ١٩٨١ کاتێک کە بە بێ ویستی خۆی خانەنشین دەکرێت.

لە ١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٩ نازناوی زانستی (مامۆستا)ی پێدەدرێت. لە ١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٣ نازناوی زانستی (پرۆفیسۆری یاریدەدەر)ی پێدەدرێت، و لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٩ نازناوی زانستی (پرۆفیسۆر) وەردەگرێت.

لە ساڵی ١٩٧٣ بەشی زمانی کوردی لە کۆلێژی پەروەردەی زانکۆ بەغدا دامەزراندووە، کاروباری بەڕێوەبردنی ئەم بەشەی لەئەستۆ گرتووە و لە هەمان کاتدا سەرۆکی بەشی کوردیش بووە لە کۆلێژی ئاداب تا ساڵی ١٩٧٦، لەم ماوەیەدا توانراوە کۆمەڵێک کادیری زانستی بۆ ئەم بەشە ئامادە بکرێت.

یەکەمین هاوسەرگیری لە ساڵی ١٩٥٧ بووە لەگەڵ خاتوو (سەعدیە سالح عەلی)، دوو منداڵی هەیە بە ناوی: میدیا لەدایکبووی ١٩٥٨ و بنیاد لەدایکبووی ١٩٧٥. دووەمین هاوسەرگیری لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا بووە لەگەڵ خاتوونێکی ڕووس بە ناوی (یانە)، لەویش کوڕێکی هەیە بە ناوی زاگرۆس لەدایکبووی ١٩٦٥.

وەک مامۆستای بابەتەکانی مێژووی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی و مێژووی ئەدەبی جیهانی و ڕێگەکانی توێژینەوەی ئەدەبی و مێژووی ڕۆژهەڵاتناسی و مێژووی ڕۆشنبیری کوردی و زمانی کوردی و زمانی عەرەبی لە ئامۆژگای خوێندنی ڕۆژهەڵاتناسی سەر بە ئەکادیمیای زانستی ڕووسی و زانکۆی سانت پیترسبورگ و هەردوو کۆلێژی ئاداب و پەروەردە لە زانکۆی بەغدا

و کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی سلێمانی و کۆلیژی پۆلیس لە بەغدا و پەیمانگەی زمان و ئەدەب لە زانکۆی عەننابە لە وڵاتی جەزائیر وانەی وتووەتەوە.

زمانەکانی کوردی و عەرەبی و ڕووسی بە تەواوی زانیوە، قسەی بە هەردوو زمانی فارسی و تورکی کردووە و توانیویەتی زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی بخوێنێتەوە.

وتاری لە هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان بڵاوکردووەتەوە کە لە عیراق دەردەچوون، هەروەها وتاری لە کۆمەڵێک ڕۆژنامە و گۆڤاری عەرەبیش بڵاو کردووەتەوە.

وەک ئەندامی دەستەی نووسەران و سەرنووسەر لەم گۆڤار و ڕۆژنامانەی خوارەوە کاری کردووە:

- ڕۆژنامەی (هەولێر- اربیل)، کە بە زمانی کوردی و عەرەبی لە شاری هەولێر دەردەچوو، لە نێوان ساڵانی (١٩٥٠-١٩٥٣)دا، لەم ڕۆژنامەیەدا کاری کردووە.
- گۆڤاری (الصحیفة)ی هەفتانەیی، کە لە بەغدا بە زمانی عەرەبی دەردەچوو، لە نێوان ساڵانی (١٩٥٣-١٩٥٤) دا، لەم گۆڤارەدا کاری کردووە.
- ڕۆژنامەی (الرأي العام)ی ڕۆژانەیی، کە لە ساڵی ١٩٥٥ بە زمانی عەرەبی لە بەغدا دەردەچوو.
- گۆڤاری (شەفەق)ی مانگانە، کە بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لە کەکووک دەردەچوو، لە نێوان ساڵانی ١٩٥٨-١٩٥٩ وەک ئەندامی دەستەی نووسەران و دواتر وەک سەرنووسەر کاری لەم گۆڤارەدا کردووە.
- ڕۆڵی هەبووە لە دەرکردنی گۆڤاری (پرشنگ)، کە لە لایەن کۆمەڵێک ڕۆشنبیر و ڕووناکبیری کورد لە ئەورووپا بە زمانی کوردی دەردەچوو لە نێوان ساڵانی (١٩٦٦-١٩٦٧)دا.
- گۆڤاری (دەفتەری کوردەواری – الدفاتر الکردیة)، کە گۆڤارێکی ڕۆشنبیری کوردییە لە ساڵی ١٩٧٠ لە بەغدا دەردەچوو، مارف خەزنەدار و جەمال خەزنەداری برای خاوەنی ئەم گۆڤارە بوون.
- گۆڤاری (نووسەری کورد – الکاتب الکردي) ی بە زمانی کوردی لە بەغدا دامەزراند، کە



















زمانحاڵی یەکێتیی نووسەرانی کورد بوو، لە نێوان ساڵانی (١٩٧١-١٩٧٣)دا سەرنووسەری ئەم گۆڤارە بووە.

- ڕۆڵی هەبووە لە دامەزراندنی گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان – شمس کوردستان)، کە گۆڤاری کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی بوو، ساڵی (١٩٧١) بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی دەردەچوو، و سەرپەرشتیاری بەشی عەرەبی گۆڤارەکە بووە.

- بەشێکی کوردی لە گۆڤاری (مجلة كلية الآداب) لە زانکۆی بەغدا دامەزراند، ئەم گۆڤارە بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی دەردەچوو. لە ساڵی ١٩٧٢ەوە سەرپەرشتی ئەم بەشەی کردووە تا ساڵی ١٩٨١، ئەو کاتەی کە بەشی زمانی کوردی لە کۆلیژی ئاداب لە زانکۆی بەغدا داخرا.

لە نێوان ساڵانی (١٩٦٩-١٩٧٠)دا ڕۆڵی هەبووە لە دامەزراندنی یەکێتیی نووسەرانی کورد و کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی لە بەغدا، کۆمەڵێک لێپرسراویەتی لەم یەکێتی و کۆمەڵەیە پێ سپێردراوە.

ئەندام بووە لە سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقی لە کاتی دامەزراندنیەوە لە ساڵی ١٩٥٩ تا ساڵی ١٩٧٨، کە ئەندامیەتی لەم سەندیکایە کێشایەوە. لە ساڵی ١٩٦٠ بۆتە ئەندام لە یەکێتیی ڕۆژنامەنووسانی جیهانی. لە ساڵی ١٩٧٠ بووەتە ئەندام لە کۆمەڵەی ئارەزوومەندانی پوول لە عێراق.

لە ١٩ی شووباتی ساڵی ١٩٨١ بە زۆرەملێ بە بڕیارێکی کۆماری، کە لە لایەن سەرۆککۆماری عێراقەوە ئیمزا کرابوو خانەنشین کرا، وەک سزایەک بەرانبەر بە ڕۆڵ و چالاکییەکانی لە پێشخستنی کولتوور و ڕۆشنبیری نەتەوەیی گەلی کورد.

لە نێوان ساڵانی (١٩٨٣-١٩٨٨)دا ڕوو دەکاتە وڵاتی جەزائیر و وەک مامۆستا لە پەیمانگەی زمان و ئەدەب لە زانکۆی عەننابە دەستبەکار دەبێت. لەم ماوەیەدا وانەکانی مێژووی ئەدەبی جیهانی و ڕەخنەی ئەدەبی و ڕێگەکانی توێژینەوەی

له زۆربەی قۆناغەکان وتووەتەوە و سەرپەرشتی ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی خوێندنی باڵای کردووە. هەر لە ماوەی مانەوەی لە وڵاتی جەزائیر بەشی هەرەزۆری کارەکانی نووسینەوەی کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی) تەواو کردووە، کە دواتر لە دووتوێی حەوت بەرگدا چاپکرا. هەر لەو ماوەیەدا بەشداری لە پێنج کۆنفرانسی زانستی کردووە. سەرپەرشتیاری کۆمەڵێک تێزی دکتۆرا و نامەی ماستەری کردووە، هەروەها سەرپەرشتی ٣٠ توێژینەوەی دەرچوونی قوتابیانی بەکەلۆریۆسی کردووە لە زانکۆی عەننابە لە نێوان ساڵانی (١٩٨٣-١٩٨٨)دا.



لە ساڵی ١٩٨٨ وەک مامۆستا بە پلەی پرۆفیسۆر لە زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر دەستبەکار دەبێتەوە. وانەی لە بەشەکانی زمانی کوردی و عەرەبی بۆ هەموو قۆناغەکانی خوێندنی بەکەلۆریۆس و خوێندنی باڵا وتووەتەوە. لە ماوەی کارکردنی لە زانکۆی سەلاحەدین نوێنەری مامۆستایان بووە لە ئەنجوومەنی زانکۆ و ئەندام بووە لە لیژنەی باڵای بەرزکردنەوەی پلەی زانستی لە زانکۆی سەلاحەدین و ئەندامی دەستەی نووسەران لە گۆڤاری (زانکۆ) و سەرۆکی لیژنەی بەرزکردنەوەی پلەی زانستی لە کۆلێژی ئاداب.






ساڵی ١٩٩٢ نازناوی مامۆستای یەکەمی لە سەر ئاستی زانکۆی سەلاحەدین و زانکۆکانی عێراق لە لایەن وەزارەتی خوێندنی باڵای عێراقەوە، پێدەبەخشرێت. هەر بەم بۆنەیەوە میدالیا و بڕوانامەی پێدەدرێت.

ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی بووە لە کاتی دامەزراندنیەوە لە ساڵی ٢٠٠٠ و بووەتە سەرنووسەری گۆڤاری وەرزی (ئەکادیمی) و سەرۆکی لیژنەی ئەدەب.



مارف خەزنەدار کۆمەڵێک کتێبی چاپ کردووە، کە ئەمانەی خوارەوەن:

- (العدل الأجتماعي)، وەرگێڕانە لە کوردی بۆ عەرەبی، ساڵی١٩٥٤
- أغاني كردستان ساڵی ١٩٥٦
- کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، ساڵی ١٩٦٢




- میژووی ئەدەبی کوردی نوێ (١٨٩٠-١٩٦٠) بە زمانی ڕووسی، ساڵی ١٩٦٧
- الأكراد-ملاحظات و انطباعات، وەرگێڕانە لە ڕووسییەوە بۆ عەرەبی، ساڵی ١٩٦٨
- دوازدە سوارەی مەریوان و پازدە چیرۆکی تری کوردی، بە زمانی ڕووسی، ساڵی ١٩٦٨
- بووکەشووشە، چیرۆکێکی کوردییە، ساڵی ١٩٦٩
- ئەڵەمان کوردی و چەند چیرۆکێکی تری کوردی، ساڵی ١٩٦٩
- عەبدوڵلا بەگی میسباح ـ دیوان شاعیری گەورەی خاکی موکریان، ساڵی ١٩٧٠
- زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، ساڵی ١٩٧١



- دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی، دانانی عەلی تەرەماخی سەدەی حەڤدەمی زایینی، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە و پێشەکی، ساڵی ١٩٧٧
- دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە، ساڵی ١٩٧٧
- مخطوطات فريدة و مطبوعات نادرة، دراسات كردية، الجزء الأول، ساڵی ١٩٧٨
- تاريخ الأستشراق و الدراسات العربية و الكردية في المتحف الآسيوي و معهد الدراسات الشرقية في لينينگراد (١٨١٨-١٩٦٨)، مقدمة و تعليق و ترجمة من الروسية الى العربية، ساڵی ١٩٨٠




- الرحالة الروس في الشرق الأوسط، مقدمة و تعليق و ترجمة عن الروسية، ساڵی ١٩٨١
- نالی لە دەفتەری نەمریدا، ساڵی ١٩٨٠
- لە بابەت میژووی ئەدەبی کوردییەوە، بریتییە لە چواردە لێکۆڵینەوە، ساڵی ١٩٨٤
- کوردیادە، داستانێکی شیعرئامێزە، ساڵی ١٩٨٥
- گەشتێک بۆ ئەرزەڕۆم، نووسینی پووشکین، وەرگێڕان

لە ڕووسییەوە، ساڵی ١٩٩٥
- ئەدەبی ڕووسی و کێشەی پاسترناک، ساڵی ١٩٩٩
- رذاذ الذاكرة، ساڵی ١٩٩٩
- مێژووی ئەدەبی کوردی، حەوت بەرگ، لە نێوان ساڵانی (٢٠٠١-٢٠٠٦)
- دیجلەی هزرم، ساڵی ٢٠٠٦
- بەرەو ڕۆژ، ساڵی ٢٠٠٦
- ڕۆژگاری من، یادداشت، چاپی یەکەم ٢٠٠٩. چاپی دووەم لە ساڵی ٢٠٢٣دا لە لایەن "دەزگای فام"ەوە.

پاش کۆچی دوایی، ئەم کتێبانەش چاپ بوون:
- مارف خەزنەدار دنیایێک لە وشە و مەملەکەتێک لە کتێب ١٩٣٠ ـ ٢٠١٠، ئامادەکردنی: حەمید ئەبوبەکر بەدرخان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان، چاپی یەکەم، هەلێر ٢٠١٠.
- د. مارف خەزنەدار لە گۆڤاری رامان‌دا، ئامادەکردنی: ئازاد عەبدولواحید، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠١٨.
- ئەرشیفی نامەکانی مارف خەزنەدار، کۆکردنەوە و ئامادەکردن و پەراوێزنووسینی: بێتاد خەزنەدار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای فام، چاپی یەکەم ٢٠٢٣. ئەم کتێبە پێکهاتووە لە ١٠٦ نامە، کە لە لایەن نووسەران و کەسایەتییە دیارەکانی کوردەوە بۆ مارف خەزنەدار نێردراون.




مارف خەزنەدار بەشدار بووە لە نووسین و نووسینی پێشەکی بۆ ٥٤ کتێب. لە نێوان ساڵانی (١٩٨٦ ـ ٢٠٠٧) سەرپەرشتی ١٩ نامەی ماستەر و ٩ تێزی دکتورای کردووە. هەروەها سەرۆکی لیژنەی گفتوگۆی ١٩ نامەی ماستەر و سەرۆکی لیژنەی گفتوگۆی ٩ تێزی دکتورا بووە.

لە ٢٠١٠/١٠/٢٥ دوای ماوەیەکی کەم لە نەخۆش کەوتن، کۆچی دوای کردووە و لە گۆڕستانی (چراغ) لە هەولێر، لە مەراسیمێکی بەرچاودا، بەخاک سپێردراوە.




**ئامادەکردنی: بنەماڵەی مارف خەزنەدار و ڕۆڤار.**

عومەر مەعروف بەرزنجی

# زانای ئەدەبی کوردی...

## پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەدار

لە ڕاستەوە: عومەر مەعروف بەرزنجی، د. مارف خەزنەدار - ئوتێل چوارچرا لە هەولێر - ئابی ٢٠٠٠



شەوی 25/10/2010 دا، مامۆستایەکی سەنگین و
ویەکی ناسراوی زانستگاکانی (سانت پیترسبورگ)
ڕووسیا و بەغداد و عەنابە و پایتەختی جەزائیر و
ەلاحەدین و سلێمانی، نووسەر و توێژەرێکی بەئەزموون
زانایەکی بالای مێژووی ئەدەبی کوردی، کەسایەتییەکی
ەسبەرز و لێبووردە و دلاوا و گەردنکەشی نەتەوە،
وانە و خولیا و پەپوولەیەکی بالهەلگرووزاوی دەوری
یعرەکانی نالی و لاپەڕە ون و پەرشەکانی ئەدەب،
ەرێکی بەردەوامی وانە و خوێندن و نووسین و کاری
ژنامەنووسی، خاوەنی ناوەدانترین کتێبخانەی تایبەت
چاپەمەنی دەگمەن و ئارشیفێکی سەرڕێژ، نووسەری
ەرمانێک کتێبی ناوازەی لێکۆلینەوە و وەرگێڕان و چیرۆک
یادەوەریی ڕۆژانی دێرین، ڕێبوارێکی شەکەتی هەورازی
ەبات و ژیان و هەلوێست و میوانێکی زیندانەکانی ولات،
تابییەکی بەئەمەک و درەختێکی هەلچووی بەرداری ناو
خ و کتێبخانە تایبەتییەکانی توفیق وەهبی و ڕەفیق حیلمی
ڕۆژبەیانی، برا و هاوەلێکی بەوەفا و دۆستی گیانی
ران و شێخ مارفی بەرزنجی و برایم ئەحمەد و شێخ
ەلام و حەمەسالح دیلان و سەجادی و نەجمەدین مەلا و
ەبدولخالق مەعروف و محەمەد مەولوود (مەم)، دۆستی
اعیری نوێخوازی ئەدەبی عەرەبی (بەدر شاکر سەیاب)،
ای بەرێکردنی 80 سال تەمەنی خزمەت و سووتان و
وسین و دلسۆزی و میوانپەروەری و ڕاستگۆیی، ڕووی
جیهانی جاویدانی کرد و گۆڕستانی (چراغ)ی شاری
ولێری کردە دواهەواری خۆی.

١

کتور خەزنەدار وەک کەسایەتییەکی نموونەیی و پسپۆڕێکی
دەب، خاوەنی بەرنامە و تێڕوانین و لێکدانەوەی تایبەتی
ری بوو، لە بواری داهێنانی ئەدەبی و لێکۆلینەوەی
انستی و سەرپەرشتی توێژینەوە زانستییەکاندا گەیشتبووە
ختێکی بالا، لە ژیان و هەلسوکەوتی ڕۆژانەدا کەسێکی
دەرپێتەو و گەشبین بوو، خۆی لە قسە و باسی بێتام
ور دەخستەوە و کەسێکی یەکڕوو بوو، وەک زانایەک
ورتر دەیڕوانی و خۆی بە شتەنزمەکانەوە خەریک
دەکرد، وەک قەلای هەولێر بۆ ڕۆژ و دوو ڕۆژ نەژیا، ئەو

عاشقی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی بوو، هاوڕازی وشەی
جوان و ورشەداری کوردی بوو، خەزنەدار قەسیدەیەکی
بالابەرز و غەزەلێکی تەڕ و پاڕا و بوو، ئەگەر شەرەفخانی
بەدلیسی مێژووی هەموو کوردی بۆ هەموو کورد نووسی،
خەزنەداریش مێژووی هەموو وشە و داهێنانی کوردی بۆ
هەموو کورد نووسی.*(١)
دیارە مالئاوایی ئەم زانا ئازیزەمان لە ژیان و نووسین و
سۆزی برایەتی و نامە و کۆڕ و دانیشتنە تایبەتییەکانی بووە
مایەی دلتەنگی و خەمێکی زۆر، بەتایبەتی بۆ کەسێکی وەک
من، کە زیاتر لە چل سالە تا ئەوپەڕی سنوور و مەبەست
نزیک و جێی متمانەی یەکتربووین، بەم بۆنەیەوە بە کول و
دل دەمەوێ لە یادی ئەم برا و مامۆستا دلسۆزەدا، هەندێ
لە سۆزی تایبەتی دەرببڕم، ئەوەیشی لێرەدا دەیبینن چەند
دلۆپێکە لە هەست و باوەڕ و ئاسەم، نووسین و کاری
فراوانتریش بۆ ڕۆژانی دواترە، بابەتەکانی دکتور لەسەر
یەک تەرزی تایبەتی نەگیرساونەتەوە و فرەلایەنن، پەلیان
هاویشتووە بۆ چەندین بواری داهێنان و توێژینەوەی
زانستی. لەلایەکی ترەوە کارەکانی دکتور قوولن
و پەراوێز ئاسایی نەنووسراونەتەوە، ژیرانە
کاریان لەسەر کراوە، بوونەتە سەرچاوەیەکی
باوەڕپێکراوی ئەوتۆ کە پڕن لە مانا و لێکدانەوە،
ئێمەیش لێرەدا و بەپێی مەودای ئەم نووسینە، کە
نامانەوێ بابەتەکە تەنیا لە گێژەنی بیرەوەریدا
بخولێتەوە، بەلکو لە هەر باخێک گولێک و لە
هەر گولەی بۆنێک دەکەین و برووسکەئاسایی
چمکێکی ژیان و کار و بەرهەم و هەلسووڕانی
بەسەر دەکەینەوە.

٢

سەرەتا و چووزەرەی یەکەم بەرهەمی
بلاوکراوەی دکتور خەزنەدار دەگەڕێتەوە بۆ
هاوینی سالی 1943، لەو کاتەدا تەمەنی سیانزە
سالان بووە و لە پۆلی شەشەمی قوتابخانەی
سەرەتایی (ئولا)ی هەولێر خوێندوویەتی
و بەرەو پۆلی یەکەمی ناوەندی هەنگاوی



ناوه، بابەتەکە وەرگێڕانی شیعری (لە خەو هەڵسن...)ی (ئەحمەد موختار جاف 1898 ـ 1935) بووە بۆ سەر زمانی عەرەبی، لەرێی پۆستەوە ناردوویەتی بۆ رۆژنامەی (الاتحاد)، کە لە بەغداد دەرچووە، پاش ماوەیەک لە هاوینی ئەو ساڵەدا بڵاوکراوەتەوە. بەڵام یەکەم بەرهەمی بە زمانی کوردی بابەتێک بووە کە ساڵی 1948 سەبارەت بە چیرۆکنووسی رووس (چیخەف1860 ـ 1904)ە و لە چەند سەرچاوەیەکەوە ئامادەی کردووە و ناردوویەتی بۆ گۆڤاری (گەلاوێژ 1939 ـ 1949) و لە ژ. (5)ی ساڵی (9)ی مایسی (1949)دا بڵاو کراوەتەوە و لەو کاتەیشدا قوتابی پۆلی چوارەمی ئامادەیی بووە لە کەرکووک.

دکتۆر سەبارەت بەم بابەتە لە نووسینێکدا وتوویەتی: "هێشتا قوتابی پۆلی چوارەمی ئامادەیی بەشی ئەدەبی بووم لە کەرکووک، کە بڕیارمدا نووسینێک بە زمانی کوردی بڵاو بکەمەوە، پێشتر نووسینم بە زمانی عەرەبی هەبوو، لەو سەردەمەی ژیانمدا بایەخێکی زۆرم بە زمانی عەرەبی دەدا، هەندێ ساویلکانە بیرم دەکردەوە، وامدەزانی هەرچۆنێ بێ کوردی زمانی خۆمە و لە دەستم راناکا، بەڵام گرنگ ئەوەیە فێری زمانی عەرەبی ببم، لە گۆڤارێکی عەرەبیدا مێژووی ژیانی چیرۆکنووسی رووس (ئەنتۆن چیخەف) و چەند چیرۆکێکم بەرچاو کەوت، بەکورتی مێژووی ژیانی ئەم نووسەرەم وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی، وتارەکەم پاکنووس کرد و لەگەڵ نامەیەکدا بۆ بەهەشتی -عەلائەدین سەجادی-م رەوانە کرد، بەپێی ئەو ناونیشانەی کە لە گەلاوێژدا نووسرابوو. بەبێ ئەوەی بە کەس بڵێم، یان پیشانی کەسێکی بدەم، چونکە لەوە دڵنیا نەبووم کە بە دڵی برایم ئەحمەد و عەلائەدین سەجادی دەبێ، لەو سەردەمەدا منداڵێکی حەڤدە ـ هەژدە ساڵی ئەگەر زۆر بزێو نەبوایە نەیدەتوانی خۆی لەقەرەی گۆڤاری گەلاوێژ بدات، پاشماوەیەک وتارەکە لە گۆشەی -ئەوانەی نامرن-دا بڵاو کرایەوە، ئەم سەرکەوتنە بێ وێنەیە گەورەترین هاندەر بووە بۆ من کە واز لە قەڵەم نەهێنم."(٢)

٣

یەکەم بەرهەم و کاری نووسینی دکتۆر خەزنەدار لە شێوەی کتێبێکی سەربەخۆدا، وەرگێڕانی نامیلکەی (دادی کۆمەڵایەتی)ی ئەندازیار (بەکر دلێر 1929 ـ 1981)ە بۆ سەر زمانی عەرەبی. نامیلکەکە بە ناونیشانی (العدل الاجتماعي)یە و ساڵی 1954 بە ناوی (مفخر)ەوە بڵاوی کردووەتەوە. دکتۆر لەو نوسخەیەدا کە بە دیاری پێشکەشی کردووم نووسیویەتی: "مفخر-وەک نازناو یا ناوی نهێنی تەنیا بۆ ئەم بڵاوکراوەیە بەکار هێنراوە، لە بنجدا ناوەکە لە پیتی یەکەم و دوایی- معروف خزندار- پێکهاتووە و وشەکە بە عەرەبی مانای شانازی و فەخرکردن دەگەیەنێ."(٣)

نامیلکەکەی (بەکر دلێر) و وەرگێڕانەکەی (خەزنەدار) هەریەکەیان هەژدە لاپەڕەن و لە چاپخانەی-مەعاریف – چاپکراون. بابەتەکە باسی دادی کۆمەڵایەتی و پەیوەندی لەگەڵ خوێندن و تەندروستی و یاسای ژیان دەکات. د. مارف خەزنەدار بۆ ئەم نامیلکەیە لاپەڕە و نیوێکی وەک سەرەتا بۆ نووسیوە و باس لە هەوڵەکانی (بەکر دلێر) دەکات سەبارەت بەو زنجیرەیەی کە بە ناوی "زنجیرەی خوێندەواری کوردی"(٤)یەوە بڵاوی دەکردنەوە و مێژووی 15/11/1954ی بۆ داناوە. لە کاتی وەرگێڕان و چاپکردنی ئەم نامیلکەیەدا خەزنەدار هێشتا قوتابی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگای بەغداد بووە. دووەم کتێبی (خەزنەدار) لە رۆژگاری خوێندنیدا و لەو کاتەدا کە لە بەشی عەرەبی خوێندوویەتی، کتێبە ناوازەکەی (اغاني كردستان)ە کە ساڵی 1956 لە شەستودوو لاپەڕەدا و بە زمانی عەرەبی بڵاوی کردووەتەوە، پێشەکی کتێبەکە (دکتۆر عەبدولحەلیم ئەلنەجار) کە مامۆستای خەزنەدار بووە بۆی نووسیوە و بە چەپکەگوڵێک شوبهاندوویەتی. ناوەرۆکی کتێبەکە پێکهاتووە لە ژیان و گۆرینی هەندێ

ـەمی شیعری شاعیرە ناودارەکانی کورد، بەپێی ـ ڕۆژگارەش کتێبەکە بە چاپێکی جوان و چەندین ـۆی هونەری ڕازاوەتەوە، وێنە و تابلۆکان دەستکردی نەرمەندی ناودار (بەدیع باباجان)ە. خەزنەدار سەبارەت ـم کتێبە وتوویەتی: "لەسەر پێشنیاری دکتۆر عەبدولحەلیم نەجار کتێبەکەم پێشکەش بە کۆمەڵێک نووسەر و ـایانی میسر کرد، لەوانە تەها حسێن و عەباس عەقاد عەبدولحەمید یونس و یەحیا نامی و ئەحمەد ڕوشدی ـڵح و یوسف ئەسعەد داغر و هی تر، هەر خۆیشی بە ـی هاوڕێیەکی میسری بۆی ڕەوانە کردن، لە پاشاندا موویان سوپاسنامەیان بۆ ڕەوانە کردم."(٥)

ـم کتێبە لەو ڕۆژگارەدا دەنگی داوەتەوە، کەسایەتییەکی کو (سەعید قەزاز 1904 ـ 20/9/1959)ی وەزیری ـخۆی ئەو سەردەمە، نامەیەکی بۆ دەنێری و تێیدا ـسیویێتی: "گۆڕینی شیعرە کوردییەکان بۆ زمانی ـرەبی، داهێنانێکی تازەیە، چۆن شاعیری گەورەی گلیز- فیتز گراڵد- هەناسەیەکی تازەی دایە چوارینەکانی ـیام، خاوەنی-اغانی کردستان-یش هەناسەیەکی تازەی ـەتە شیعرە کوردییەکان کە گۆڕیویەتییە سەر زمانی ـرەبی"(6) و داوای بینینی دەکات و خەزنەداریش ـەنییەکە بەجێ دەهێنێ.

٤

ـنەخشەی نووسین و بەرنامەی کار و ژیانی ژنامەنووسیدا، بە دەگمەن نووسەرم بەدی کردووە کە ئەندازەی دکتۆر خەزنەدار، توانیبێتی مامەڵەی لەگەڵ ژنامە و گۆڤارە کوردی و عەرەبییەکاندا کردبێت. جگە ـ بابەتە نۆبەرەیەی کە ساڵی 1943 لە ڕۆژنامەی تحاد)دا و لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا بڵاوی کردووەتەوە، ساڵی 1947 بەدواوە تا ڕۆژی (16)ی مارتی 1960 ـە مەبەستی خوێندن ڕووی لە دەرەوەی وڵات کردووە ـەشبەحاڵی خۆم ئەو ماوەیە بە قۆناغی یەکەمی کار ـووسینی دەزانم، لەو ماوەیەدا (1947 ـ 1960)، ـسارییەکی کارای لەگەڵ ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا کردووە، ـعر و وتار و لێکۆڵینەوە و وەرگێڕان و بابەتی هەمەجۆری بۆناردوون، سەرەڕای ئەمانەیش لە هەندێ ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی و عەرەبیدا، کەسێکی بە توانست و باوەڕپێکراو بووە، لە هەندێکیاندا سەرپەرشتیکردنی لاپەڕە و بەشی ئەدەبی بەرەوڕوو کراوەتەوە، وەک (ڕۆژنامەی هەولێر 1950 ـ 1953)، کە زیاتر لە پەنجا بابەتی سەبارەت بە ئەدەبی کوردی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بڵاوکردووەتەوە، کە لە هەولێریش دوورخراوەتەوە وەک پەیامنێر کاری تێدا کردووەتەوە. ئەمە جگە لە هەردوو گۆڤاری (الصحيفه) و(الصياد) کە ساڵی 1954 لە شاری بەغداد بڵاوکراونەتەوە و سەرپەرشتیاری بەشی ئەدەبی هەردووکیان بووە. ساڵی 1958 لە شاری کەرکووک لەگەڵ مامۆستایان (شێخ قادری بەرزنجی و برایم ئەحمەد و شێخ مارف بەرزنجی و عەبدولسەمەد خانەقا و عومەر عارف و عەبدولعەزیز خانەقا و عەلی باپیر ئاغا)دا گۆڤارە بەناوبانگەکەی (شەفەق 1958)یان لە شاری کەرکووک بەڕێوە بردووە.

عەبدولسەمەد خانەقا سەرپەرشتیاری بەشی عەرەبی و مارف خەزنەداریش سەرپەرشتیاری بەشە کوردییەکەی بووە و ماوەیەکیش کراوە بە سەرنووسەر. لێرەیشدا حەز دەکەم لیستی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە بخەمە بەرچاو (1947 ـ 1960)، کە ڕەنگە لای هەندێ لە خوێندەواران ئاشنا نەبن:

(الأمل 1947، قوتابخانەی هەولێر بڵاوی کردووەتەوە، گەلاوێژ 948، هەولێر 950 ـ 953، الجبل 953، الرأی العام ٩٥٣- ٩٥٤، العراق اليوم 954، الصياد 954، الصحيفه 954، الشعب 955، هەتاو 955 ـ 956، الهاتف 956، المعلم الجديد ٩٥٦ ـ ٩٥٧، صوت الاحرار 1958، خەبات 959، الانسانيه 1958، 14 تموز، شەفەق 958 ـ 959، خەبات 959، ژین 958 ـ 960، نەورۆز 959، ڕۆژی نوێ 960، هیوا 960).

ئەم لیستی ڕۆژنامە و گۆڤارانە هەموویان بابەتی خەزنەداریان تێدایە و ئێمەیش لێرەدا نامانەوێ لەم کاتەدا بیبلیۆگرافیایەکی تێر و تەسەل بڵاو بکەینەوە، چونکە کارێکی



ئێجگار قورسە و ماوەی دەوێ، بەڵکو ئەوەیان بۆ کاتێکی دواتر دادەنێین و لە یەکەم بابەتی ساڵی 1943 تاکو ڕۆژی ماڵئاوایی لە کارێکی گەورەدا بەئەنجام دەگەیەنین. بەڵام هەر بۆ نموونە ناونیشانی چەند بابەتێکی خەزنەدار دەخەینە بەرچاو کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ساڵانی (953 ـ 954)دا بە زمانی عەرەبی بڵاو کراونەتەوە:

**جريده ـ الجبل ـ اليوميه**

**في بغداد 953**

١/ استاذي رفيق حلمي، بحث عن كتاب الشعر والادب الكردي، (31) اب 953

٢/ ديوان الحاج قادر الكويي، طبعه مطبعه كردستان في اربيل، (10) ايلول 953

٣/ نشرات اجتماعيه، عن الرسائل التي كان يصدرها المهندس بكر دلير، (20) ايلول953

٤/ المرأه الكرديه (بمناسبه اسبوع حقوق المرأه الكرديه)، (25)تشرين الأول 953

٥/ الأذاعه الكرديه، وكيف تنهض، (13) تشرين الثاني 953

٦/ المفتي الزهاوي، كتاب للشيخ محمد الخال، (14) كانون الأول 953، القسم الأول

٧/ المفتي الزهاوي، كتاب للشيخ محمد الخال، (15) كانون الأول953، القسم الثاني

**مجله ـ الصياد ـ الاسبوعيه**

**في بغداد 954**

مارف خەزنەدار سەرپەرشتی بەشی ئەدەبی گۆڤارەکەی کردووە و بابەتەکانی هەمووی لەلایەن خۆیەوە نووسراونەتەوە:

١/ كلمه الركن مع قصيده- الوطن الشاكر فتاح في كتاب ـ پرشنگ ـ العدد الاول، (12) ێزار954

٢/ كتاب الاستاذ رفيق حلمي ومارغريت، العدد الثاني، (20) اذار 1954

٣/ نزهه الربيع، عن كتاب ـ پرشنگ ـ العدد الثالث (27) اذار 954

٤/ انين الضمير، شعر مترجم، القسم الاول، العدد الرابع، (10) نيسان954

٥/ انين الضمير، شعر مترجم، القسم الثاني، العدد الخامس، (24) نيسان 954

٦/ عروس منكوده- لگوران ـ العدد السادس، (4) مايس1954

بەڵام قۆناغی دووەمی نووسین کارکردنی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی وڵاتدا لە ڕۆژی (20/2/1968)ەوە دەست پێ دەکات، ئەو ڕۆژەی کە دوای هەشت ساڵ گەڕایەوە وڵات تا ڕۆژی ماڵئاوایی، دیارە بیبلیۆگرافیای ئەم قۆناغە تابڵێی فراوانە بەتایبەتی ئەم دەساڵەی دوایی ژیانی(2000 ـ 2010).

٥

هەرچەندە کاری سەرەکی د. خەزنەدار وەک زانەیەکی باڵای مێژووی ئەدەبی کوردی، توێژینەوەی زانستی بووە و لەم لایەنەوە کاری گەورەی کردووە و دواتر لێیان دەدوێین، بەڵام لەگەڵ ئەمانەیشدا لایەنێکی گرنگی بەرهەمی قەڵەمی دکتۆر سەر بە بابەتی داهێنانی ئەدەبییە، وەک نووسینی پەخشانەشیعر و چیرۆکی هونەری.

دکتۆر لە سەرەتای ژیانی ئەدەبیدا هەندێ جار شیعری نووسیوە و بڵاویش کراونەتەوە، بەڵام لە سەردەمێکی زوودا دەستی لێهەڵگرتووە و لە کار و بەرهەمی داهێناندا خەریکی چیرۆکی هونەری و هەندێ جاریش پەخشانەشیعر بووە.

یەکێک لەو کارە ئەدەبیانەی کە دوو جار چاپکراوەتەوە، کتێبی (کوردیادە)یە، ساڵی 1985 چاپی یەکەمی لە لەندەن بە ناوێکی خواستەمەنی (سیمیرۆس کوردستانی) و جاری دووەمیش ساڵی 1998 لە هەولێر بڵاوکراوەتەوە. کتێبەکە بابەتێکی هونەری شیعرئامێزە و وەک داستانێکی شیعری سەبارەت بە مێژووی ژیانی کورد دەدوێت بە

مێژوو. دکتۆر لە ڕوونکردنەوەیەکدا لەبارەی چاپی
ە وتوویەتی: "تاقیکردنەوەی هەستی ئەم بەرهەمە
ماوەیەکی زۆری خایەند، تۆوی جینەکەی لە سالانی
968 لە شاری سانت پیترسبۆرگ) لە مێشکمدا
پەروەردەبوونی زیاتر لە پانزە سالی پێچوو، ئەمە
ی نیشتمانی خۆشەویستدا بوو، لە پاییزی سالی
لە باکووری ئەفەریقا لە شاری عەننابەی جەزائیر لە
ی بوونی بیرمدا چرۆی دەر کرد و تۆمار کرا. لە هاوین
ی سالی 1984 لە پاریس لەلایەن خۆمەوە تایپ
ێکی وەکو چاپێکی تاقیکردنەوە بۆ جاری یەکەم لە
سالی 1985 لە لەندەن بلاوکرایەوە، تیراژی کەم
ا بە دیاری بۆ دۆست و برادەر و ئەدەبپەروەران.
پە لەوەی پێشوو پوختترە، چاپی داهاتووش لەمە
دەبێ. لەپاش نووسینەوەی بەتەمابووم ناوی بنێم
ندی بەفر و گول- بەلام -کوردیادە-م پێ باشتر و
بوو، ڕەنگە بلێن بۆچ کوردیادە؟! دەلێم ئاورێک لە
ە-ی هۆمیرۆسی گریک و-ئینیادە-ی ڤیرجیلۆسی-
ی بدەنەوە، ئەوجا -کوردیادە- ڕوون دەبێتەوە،
کوردیادەم لە سالی 1985 لە لەندەن بە ناوی
استراو-سیمبرۆس- کوردستانی- بلاوکردەوە،
سیمبرۆس- لە هیچ فەرهەنگێکی زمانی گریکی و
تازەدا نییە، خۆم دروستم کردووە، بێگومان ئەم
ەش بەسەرهاتی خۆی هەیە."(٧)

هەمەی خەزنەدار بە بێدەنگی بەسەر خوێندەواراندا
یوە، بەلکو بە بۆنەی چاپی یەکەمی کتێبەکەوە،
ی (هەلوێست) کە لە لەندەن بلاو دەکرایەوە،
ویتی: "ئەم نامیلکەیە بریتییە لە تۆمارێکی مێژووی
بە شێوەی شیعری پەخشانی، لە کۆمەلە تابلۆیەکی
نە و سەرنجڕاکێشدا، نووسەر تیشکی لێکدانەوە
دەخاتە سەر لاپەڕە هەرە گرنگ و درەخشانەکانی
ی کورد، هەر لە سەرەتای مێژووەوە تا سەردەمی
ە زمانێکی سادە و ئاسان، بە بەکارهێنانی ئەفسانە و
، مرۆڤی کورد بەرابوردووی خۆی ئاشنا دەکا، تەلە
فروفێلی داگیرکاران ئاشکرا دەکا، خوێندنەوەی ئەم
ۆ تێگەیشتنی لایەنی سیاسی و شارستانی مێژووی
مان زۆر پێویستە."(٨)

لەلایەکی ترەوە دکتۆر خەزنەدار لە بەرگی دواوەی چاپی دووەمی کتێبەکەدا نووسیویتی: "لە تەمموزی 1988 دانەیەک لە چاپی یەکەمی کوردیادە و پاکنووسی ئامادەکرا و بۆ چاپی دووەم پێشکەش بە قوتابی و هاوڕێی هەرە نزیک و خۆشەویستم -دلشاد مەریوانی- کرد، بەم دێڕانە هەست و نەستی خۆی بەرانبەر بە کوردیادە دەردەبڕی: ئەم نووسینە بابەتێکی نوێیە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە، بۆ یەکەمجار وادەزانی مانادیار و ئاشکرا و بێگرێیە، بەلام لە دواییدا بۆت دەردەکەوێ قوول و قورس و تەماوییە، مەگەر مامۆستای گەورەم مارف خەزنەدار خۆی نهێنییەکانی ئاشکرا بکا، بەلام ئەمە نەکا چاکترە، پیرۆزباییم بۆ خۆی و هەموو خوێنەرێکی کورد."(٩)

***

نووسینی چیرۆکی هونەری وەک داهێنانێکی ئەدەبی، بەشێکی گرنگی چالاکییەکانی دکتۆر خەزنەداری گرتووەتەوە لە سەرەتادا هەولی نووسینی داوە، بەلام کەمتر بلاوی کردوونەتەوە، سالی 1969 کۆمەلەچیرۆکێکی بە ناونیشانی (ئەلەمان کوردی و چەند چیرۆکێکی تری کوردی) بلاو کردەوە، کە حەڤدە چیرۆکی گرتبووە خۆ، هەر لەو سالەدا چیرۆکێکی درێژی بە ناونیشانی (بووکەشووشە) خستە کتێبخانەکانەوە. سالی 2006 کۆی چیرۆکەکانی کە (33) چیرۆکن بە ناوی (بەرەو ڕۆژ) بلاو نەکراونەتەوە. دکتۆر لە سەرەتای کۆی چیرۆکەکانیدا نووسیویتی:

"ئەم چیرۆکانە بەشی زۆری بەرهەمی داهێنراوی لەم بابەتەمن، وەک لە ڕۆژی نووسینەوەیاندا دەر دەکەوێ، بەشی هەرە زۆریان لە دەرەوەی ولات و لە سەردەمی دیاریکراوی جیاوازدا نووسراونەتەوە، هەندێکیان لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا، لە ولاتی ڕووسیای ئەو کاتەی دەسەلاتی سۆڤیەت تۆمارکراون، هەندێکی دیکەیان لە هەشتاکانی ئەو سەدەیەدا لە ولاتی جەزائیر و هەندێ لە ولاتانی ئەورووپا، بەتایبەتی فەرەنسا و بەریتانیا و ئەلمانیا نووسراونەتەوە.

بەشێکی ئەم چیرۆکانە چاپکراون،



هەندێکیان بۆ یەکەم جار دەکەونە بەرچاوی خوێنەر و خوێندەوارانەوە، ئەو بەچاپگەیەنراون بەشێکیان لە کۆمەڵەچیرۆکی – ئەڵەمان کوردی: 1969 و بووکەشووشە: 1969 لە بەغداد چاپکراون، برێکیشیان لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی وڵات و ئەورووپا بڵاوکراونەتەوە.(١٠)

لە یەکەم چیرۆکی کۆمەڵەی (بەرەو ڕۆژ)دا مێژووی ساڵی 1952ی بەسەرەوەیە، مانای وایە نووسینی چیرۆک لە مێژووی ژیانی ئەدەبی دکتۆر خەزنەداردا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دەسپێکردنی جمووجووڵی ئەدەبی و کارکردنی لە ڕۆژنامەی (هەولێر1950 - 1953)دا.

دکتۆر خەزنەدار لە مێژووی نووسینی چیرۆکی کوردیدا، ناوێکی گەشاوەیە، بەشبەحاڵی خۆم 32 ساڵ بەر لە ئێستا و لە کتێبی (لێکۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی 1978)دا سەبارەت بە چیرۆکەکانی خەزنەدار بیروڕای تایبەتیم دەر بڕیوە، لەو لێکۆڵینەوەیەدا وتراوە: "دکتۆر خەزنەدار یەکسەر کەسانی چیرۆکەکانی لە کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە دەرهێناوە و سەرتاپا ئاووهەوای کوردستانیان هەڵمژیوە، لە واقیع دوور نەکەوتووەتەوە، زۆر لایەنی ژیانی کۆمەڵگەی وەک هەوێنێکی بێگەرد بەکار هێناوە بۆ بابەتەکانی، وەک کۆششی چین و توێژە جۆر بە جۆرەکانی کۆمەڵ و دەستگرتن بە داوێنی باوەڕ و نەرێتی بێبەهاوە، هەژاری و ڕەنجی لاوانی کورد لەپێناوی ژیانێکی ئاسوودەدا، گزیکردن لە فەلسەفەی خەبات و هەڵخلیسکاندن بۆ ورەبەردان و بێباوەری، ئاوڕدانەوەیەکی هۆشمەندانە بۆ بابەتی فۆلکلۆری و کەلەپووری نەتەوایەتیمان، ئەمانە و کۆمەڵێ بابەتی تریش ناوەرۆکی چیرۆکەکانی نووسەرن."(١١)

هەروەها لە شوێنێکی تری لێکۆڵینەوەکەدا نووسراوە: "چیرۆکنووس لە هەڵبژاردنی کەسانی چیرۆکەکانیدا شارەزایە، بەرگی زرنگی و چاپوکیان بەبەردا دەکات، لەسەرخۆیش هەڵدەسووڕێن و نموونەی کۆڵنەدانن، با ڕێگەی ژیانیش گوڵڕێژنەکرابێ و پڕ درک و داڵ بێ، وەک لە چیرۆکی –سەرینە بۆر–دا دەردەکەوێ، کە وێنەیەکی زیندووی ڕەنج و هەڵسووڕانی نەوەکانی گەلن لە سەردەمێکی دیاریکراودا، کە چاودێری هەست و نەستی مرۆڤ دەکرا، نەک هەر ئەمە بەڵکو نووسەر لە چیرۆکی– دوالنگەفرتێ–دا زۆر بەوردی توانیویتی کە بە ناخی مرۆڤی خزاودا ڕۆبچێ و وەک کەسانێکی زیانبەخش بیانهێنێتە بەرچاو، کە تاچ ڕادەیەک زیانیان داوە بە جووڵانەوەی نیشتمانی، لەلایەکی ترەوە ئەو دیاردەیە هەست پێدەکەین کە پەردەی ڕەش و نەهامەتی بەسەر ڕووداوەکاندا کێشراوە، کە ئەمەیش سروشتی بابەتەکە و سەردەمی نووسین سەپاندوویەتی بەسەر نووسەردا و ئاوێنەی واقیعە تاڵەکەیە، چەندیش لەبار و ناوازەیەکە دەڵێ: بەلام کەی کەسێکی ئابڕووڕژاو، دڵۆپێ هەستی نەتەوایەتی یا مرۆڤایەتی لەناو خوێنیدا دەبێ."(١٢)

چیرۆکەکانی دکتۆر سەرلەنوێ پێویستییان بە توێژینەوەیەکی هاوچەرخانە هەیە و ئومێدەوارم کە ئەو هەلەیش برەخسێ.

٦

یەکێک لەو بوارانەی کە دکتۆر خەزنەداری خەریک کردووە و پێوەیان ماندوو بووە، کاری وەرگێڕانە و لەم لایەنەوە بەرهەمی گەورە و بەهاداری پێشکەش کردووە. پێشتر و لە سەرەتای ژیانی خوێندەواریدا چەپکێ بابەتی ئەدەبیاتی کوردی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و نامیلکەی تایبەتیدا بڵاوی کردوونەتەوە.(١٣)

ساڵی 1968 لە کاتێکدا دکتۆر خەزنەدار لە یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو خوێندوویەتی، کۆمەڵێ چیرۆکی هەڵبژاردەی چیرۆکنووسە کوردەکانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ڕووسی و بە پێشەکییەکەوە بە ناوی (دوانزە سوارەی مەریوان و پانزە چیرۆکی تری کوردی) لە کتێبێکی سەربەخۆدا و لە بڵاوکراوەکانی (ئامۆژگای

ەلاتناسیی ئەکادیمیەی زانستی و زانستگای سانت
بورگ) بە چاپی گەیاندووە.(١٤)
کەی دکتۆر ئەم نووسەرانەی لەخۆ گرتووە:

فا ساڵح کەریم- چیرۆکی چەندم لێ ئەسێنی؟
ەم محەمەد ئەمین- چیرۆکی سەیرانێک لە ئەزمڕ
نیزامەدین – لەتێ نان و شیشێ کەباب
ل بابان – چیرۆکی دیسانەوە فس فس پاڵەوان
ئەحمەد ـ دوو چیرۆک :1. کوێرەوەری 2. خازێ
ن عارف – چیرۆکی چای شیرین
ان مستەفا – چیرۆکی سکالای مردوو
ن حوزنی موکریانی – چیرۆکی دز و ڕەبەن
مارفی بەرزنجی ـ دوو چیرۆک: 1. گای پیرۆز 2.
ێکی شادی
 قەفتان – چیرۆکی شەقێک لە تۆپەکە
ر فەتاح – چیرۆکی چۆن گرامافۆنەکەم کڕی
ەدین سەجادی – چیرۆکی نێرگسفرۆش
ێرد – چیرۆکی دوانزە سوارەی مەریوان

ر خەزنەدار ساڵی 1995 لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی
ەنگی سوید، کتێبی "گەشتێک بۆ ئەرزەڕۆم"(١٥)ی
کساندەر پوشکین"ی بڵاو کردەوە، ئەم کتێبە لە زمانی
سییەوە کراوە بە کوردی و کۆمەڵێ سەرنج و پەراوێزی
ستی خستووەتە پاڵ. بەڵام وەرگێڕانەکانی دکتۆر
ەدار لە زمانی ڕووسییەوە بۆ زمانی عەرەبی، بریتین
ێ کتێبی گەورەی مێژووی و ڕۆژهەلاتناسی، یەکەمیان
 "الاکراد ملاحظات والانطباعات"(١٦)ی (مینۆرسکی)،
ساڵی 1968 بڵاو کراوەتەوە. دووەمیان "تاریخ
شراف والدراسات العربیە والکردیە1980-"(١٧)،
38 لاپەڕەدا. سێیەمیان "الرحالە الروس فی الشرق
سط1981-"(١٨) لە 440 لاپەڕەدا. ئەمە جگە لە دەیان
ی تر کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە و
ر لە ڕووسییەوە کردوونی بە کوردی.

٧

ر خەزنەدار وەک نووسەرێکی باڵا و پسپۆڕێکی
ی ئەکادیمی، جگە لە دەیان وتار و بابەت و

چاوپێکەوتن و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی ناو ڕۆژنامە و گۆڤار و سیمیناره تایبەتییەکان خاوەنی کۆمەڵێک کتێبی ئەدەبییە کە هەموویان دەچنە خانەی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە، دیارە ئێمە لەم شوێنەدا بۆمان نالوێ کە لە سەرەتا و بنەتای ئەو بابەتانە بدوێین. کە هەریەکێکیان پێویستیان بە بابەتی سەربەخۆ هەیە، تا بتوانرێت مەبەست و کرۆکی نووسینەکان بەسەر بکرێنەوە، بەڵام تەنیا دەمانەوێ کە بە نووکەقەڵەمێکی درشت پێناسەی ئەو پرۆژە گەورەیە بکەین، کە لە ساڵی ٢٠٠١ تا ساڵی ٢٠٠٦ بە حەوت بەرگی تایبەتی و بە قەبارەی (٣٨٢٦) لاپەرە بە ناوی (مێژووی ئەدەبی کوردی)یەوە بڵاوی کردەوە، ئەم حەوت بەرگە ئەنجامی کۆشش و هەوڵ و تەقەللای چەندین ساڵە و گەورەترین و پوختترین پرۆژەی ئەدەبییە لەم بوارەدا کە توانیویتی گۆی هونەر و سەرکەوتن بباتەوە. دکتۆر لە بەرگی یەکەمی هەر حەوت کتێبەکەدا کە مێژووی ئەدەبی کوردی پێکدێنن، نووسیویتی: "ئەم بەرهەمە هێنانەدیی پرۆژەی نووسینەوەی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم."




گەر بە دوو چاوی سەرنج لەم حەوت بەرگە ورد بینەوە، بە ویژدانەوە لاپەڕەکانی بخوێنینەوە، دەگەینە ئەو ئەنجامە دروستەی کە ئەم زانایە بەوپەڕی وردی و رامانەوە دەقە ئەدەبییەکانی بینیوە و لەگەڵ چەندین سەرچاوە و دەستنووسدا بەراوردی کردوون و دوای دڵنیابوون بڵاوی کردوونەتەوە و لێکۆڵینەوەی لەسەر کردوون، لە لایەکی ترەوە هەڵە و ناتەواوییەکانی نووسەرانی پێشووی دووبارە نەکردووەتەوە و مێژوویەکی دروستی ژیانی شاعیر و نووسەرەکانی تۆمار کردووە. دکتۆر لە سەرەتای هەر بەرگێکدا و بەپێی قۆناغەکانی ئەدەبی کوردی سەربوردێکی مێژوویی تایبەتمەندییەکانی ئەو قۆناغەی باس کردووە کە ئەو شاعیر و نووسەرانەی تیایدا ژیاون. دکتۆر بۆ ئەم پرۆژە گەورەیە، پرسیار و سۆراخی زۆری کردووە، سەرنجی ئەو کەسانەی وەرگرتووە کە لەم مەسەلەیەوە نزیکن، داوای سەرچاوەی کردووە، گەراوە و

به کوڵ و دڵ نامەی ناردووە بۆ ئەوانەی زانیارییەکیان سەبارەت بەو شاعیرانە لابێت، دیارە ئەمەش کاری کەسانی زانایە و سەرنجی ڕاست لە هەموو کەسێک وەردەگیرێت، لە کاتی لێکۆڵینەوەکەدا چەندین نامەی ناردووە و داوای کەرەستەی لێکردوون، دیارە ئەو نامانەیش بۆ کەسانێک نێردراوە کە لێیان دڵنیا بووە و بە برا و دڵسۆزی خۆیی زانیون.

مەبەست لە یادداشت (Autobiography) نووسینەوەی سەربوردی ژیانی کەسێکە کە دەیەوێ بە قەڵەمی خۆی وردەکارییەکانی ژیانی بنووسێتەوە. دیارە ئەم جۆرە نووسینە ڕابردوویەکی دێرینی نییە و دەرکەوتنی ڕاستەقینەی وەک زاراوەیەکی باو دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەیەم یان ڕاستتر بۆ ساڵی ١٨٥٠، هەرچەندە پێشتر (جان جاک ڕۆسۆ ١٧١٢- ١٧٧٨) بە کتێبی (اعترافات) بووە پێشەنگی ئەم جۆرە نووسینە، ئەم یادداشتە هەر زوو ناوی دەرکرد و بڵاو بووەوە، هۆیەکەیشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ڕاستگۆیانە دواوە. یەکێک لە سیفەتە دیارەکانی کەسی یادداشتنووس دەبێ لەگەڵ خۆی و کۆمەڵگە و ڕووداوەکاندا ڕاستگۆ بێت، چونکە یادداشت نووسینەوەی مێژووی ناخە، باسوخواس و وردەکارییەکان وەک خۆی تۆمار بکات. سیفەتێکی تری ئەوەیە کە تانوپۆیەکی دڵگیری ببێ و لە چوارچێوە قاڵبێکی جواندا دارێژرابێت و بەمجۆرە دەبێتە بەشێک لە ئەدەب و مێژوو.

لێرەدا دەتوانین کە لە ئەدەب و فەرهەنگی عەرەبی و نووسینەوەی یادداشتدا (طفل من القرية)ی (سيد قطب) بێنین کە لە ساڵی ١٩٤٥ چاپ کراوە و پێشکەشی نووسەری گەورەی ئەدەبی عەرەبی (طه حسين) کراوە و لە سەرەتاوە وای نیشان داوە کە نزیکییەک لە ژیانی هەردووکیاندا هەیە، یان (الأيام) طه حسين، (حياتي في نصف قرن)ی ئەحمەد سوسە، ئێمە ئەم ناوانەمان وەک نموونە هێناوە، لەوە ئاگادارین لە مێژووی هەر میللەتێکدا لەم نموونانە هەیە، نووسینەوەی (یادداشت) یان (ئۆتۆبیۆگرافی) لە مێژووی فەرهەنگی کوردیدا نوێیە، لە نەخشەی ئەم جۆرە نووسینە چەند ناوێکمان دێتە پێشچاو، بەڵام ئەوەی مانای ڕاستەقینەی (یادداشت) بگەیەنێ، کارە جوانەکەی (ڕەفیق حیلمی ١٨٩٨ - ١٩٦٠/٨/٤)یە، کە لە سەردەمی خۆیدا شەش بەرگ و دواتریش بەرگی حەوتەمی چاپ کرا.

دکتۆر مارف خەزنەدار لەمێژە سەرقاڵی نووسینەوەی سەربوردی ژیانێتی. لەم ساڵانەی دواییدا دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی یادداشتەکانی بە ناونیشانی (ڕۆژگاری من) کە لە بنەڕەتدا حەوت بەرگە و تا ئێستا پێنج بەرگی بڵاو کراوەتەوە:

بەرگی یەکەم (١٩٣٠ - ١٩٤٩)، بەرگی دووەم (١٩٤٩ - ١٩٦٠)، هەردوو بەرگی سێیەم و چوارەم (١٩٦٠ - ١٩٦٨)، بەرگی پێنجەم (١٩٦٨ - ١٩٧٥)، بەرگی شەشەم (١٩٧٥ - ١٩٨٣)، بەرگی حەوتەم (١٩٨٣ - ١٩٩١)، کە لەم کاتەوە کۆتایی بە نووسینەوەی یادداشتەکانی هێناوە.

دکتۆر لەم بەشە چاپکراوانەدا لە سەرەتای ژیان و چوونە حوجرەوە دەست پێ دەکات و ڕاستگۆیانە لاپەڕەکانی ڕابردوو هەڵدەداتەوە. وردەکارییەکان ڕوون دەکاتەوە. خوێندنی قۆناغی سەرەتایی و تا ڕۆژانی دواتر، گرفتەکانی ڕێگەی سیاسەت و ڕیزەکانی بەچکەشێرانی هیوا و زیندانیکردن و دوورخستنەوە و گەڕان بە دوای کاردا. لە سەرجەم لاپەڕەکاندا باس لەو پەیوەندییە برایانە دەکات لەگەڵ نووسەر و شاعیر و کەسە ناسراوەکانی وڵات. ئەوەی زیاتر سەرنج ڕادەکێشێ ئەو دارشتن و ڕەوانیی نووسین و چنینی ڕووداوەکانە. دیارە دکتۆر لەپاڵ توێژینەوە و کارەکانی تریدا، یەکێکە لە چیرۆکنووسە دیارەکانی کورد، ئەم بەهرە و شارەزایی گێڕانەوەیە لە یادداشتەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە و دوورن لە ڕستەی ساردوسڕ و یادداشتێکی ڕۆمانتامێزە، دەتوانین بە ڕۆمانی کەسایەتی ناوی ببەین، وەک چۆن دۆستۆفیسکی لە ڕۆمانی (ذكريات في بيت الموتى)دا پەیڕەوی کردووە و لەو ڕۆژگارانە دەدوێت کە لە (سیبیریا)دا ژیاوە. پێویستە ئەو ڕاستییەش بڵێم کە ئەم کورتە باسە ناتوانێ باس لە یادداشتەکانی دکتۆر خەزنەدار بکات و پێویستیان بە

ێکۆڵینەوە و بەسەرکردنەوەی هەمەلایەن هەیە.
ەمانە بوون بە نووکەقەڵەمێکی درشت هەندێ لایەنی ژیان
 هەڵسووڕان و بەرهەمەکانی د. خەزنەدار، دیارە ئەم
ورتەباسە تەنیا بە بۆنەیماڵئاواییەوە نووسراوە و لە
ۆژانی تردا پەرەی پێ دەدرێت و سەرجەم لایەنەکان
ەگرێتەوە، لە دوادێرەکانی ئەم باسەدا هێندە دەڵێم: هەزاران
ڕوود بۆ گیانی پاکی زانای کورد دکتۆر خەزنەدار، ئەو
انایەی تا ژیا بۆ کورد و مێژووی ئەدەبی کوردی ژیا.

**ەراوێز و سەرچاوەکان:**

**- فەرهاد شاکەلی، پاشکۆی فەرهەنگی ڕۆژنامەی هەولێر، ژ. ٥٤، شرینی دووەمی ٢٠١٠.**

**- دکتۆر مارف خەزنەدار، گۆڤاری ڕامان، ژ. ١٥٣، ٢٠١٠/٢/١٥.**

**- پیتی یەکەم و دووەمی (مفخر) سەرەتا و کۆتایی (معروف)ە و پیتی ێیەم و چوارەمی سەرەتا و کۆتایی (خزندار)ە.**

**- (زنجیرەی خوێندەواری کوردی) پرۆژەی ئەندازیار (بەکر عومەر یەحیا ١٩٢ - ١٩٨١) بوو، کە بە (بەکر دلێر) ناسرا بوو، خوالێخۆشبوو لە ۆیە لەدایکبووە، بە یەکێك لە نووسەرە ناسراوەکانی ڕۆژگاری خۆی ادەنرێت و لە گۆڤاری (گەلاوێژ)یشدا بەرهەمی بڵاوکردووەتەوە. لە تێبە چاپکراوەکانی: ئەشکەوتی گندۆك ١٩٥١، هەرەوەزی ٩٥٣، دادی ۆمەڵایەتی ٩٥٤، ئامۆژگاری دڵداری (شانۆنامەیەکی وەرگێڕاوە) ١٩٦.**

**- دکتۆر مارف خەزنەدار، ڕۆژگاری من، بەرگی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٩، ١٤٩، جگە لەوەی دکتۆر خەزنەدار پێش چاپکردنی چەند جارێك سی بۆ کردووم، چونکە دەیویست کە من ئاگاداریم لەسەر هەموو رهەمەکانی هەبێ.**

**- هەمان سەرچاوە، ل١٥٠.**

**- د. خەزنەدار، کوردیادە، چاپی دووەم، هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیری، ١٩٩، ل٣.**

**- هەڵوێست، گۆڤار، لەندەن، ژ. ٥، ساڵی دووەم، تەمووزی ١٩٨٥، ١١٠-١١٢.**

**- سەرچاوەی حەوتەم، بەرگی دواوەی کوردیادە.**

**١- دکتۆر مارف خەزنەدار، بەرەو ڕۆژ، سلێمانی چاپخانەی سیما، ٢٠٠، ل٥.**

**١- عومەر مەعروف بەرزنجی، لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیای چیرۆکی وردی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٨، ل١٤٧.**

**١- سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٧ - ١٤٨.**

**١- خەزنەدار ئەو بابەتانەی لە ڕۆژنامەی (هەلێر - اربیل) و ڕۆژنامە گۆڤارەکانی بەغداد بڵاو کردووەتەوە، سەرباری ئەمانەیش کتێبی - ڵنی کردستان سێ چاپ کردووە، کە ژیان بەسەرهاتی چەند شاعیرێکی کوردە.**

**١٤- بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەم کۆمەڵەچیرۆکە وەرگێڕاوە بڕوانە: عومەر مەعروف بەرزنجی، برایم ئەحمەد لە کارە زانستی و ئەدەبییەکانی پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەداردا، سلێمانی، چاپخانەی شڤان، ٢٠٠٤، ل٤٩ - ٥٠ - ٥١.**

**١٥- گەشتێك بۆ ئەرزەڕۆم، لە سەردەمی هێرشی ساڵی ١٨٢٩دا، وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە بۆ کوردی: تێبینی و پەراوێز: دکتۆر مارف خەزنەدار، ١٩٩٥، ١١٢ لاپەڕەیە.**

**١٦- الاکراد، ملاحضات الانطباعات، تالیف: ف. ف. مینورسکی، باللغة الروسیة، ثتر وغراد - ١٩١٥، ترجمة وتعلیق وتقدیم: الدکتور معروف خزندار، بغداد ١٩٦٨.**

**١٧- تاریخ الستشراق الدراسات العربیة والکردیة فی التحف الاسیوی ومعهد الدراسات الشرقیة فی لینینغراد ١٨١٨ - ١٩٦٨، الفه بللغة الروسیة، مجموعة من المستشرقین السوفیات، ترجم وعلق علیه وقدم له الدکتور معروف خزندار، بغداد، مطبعة المعارف، ١٩٨٠، ٣٨٨ لاپەڕەیە.**

**١٨- الرصالة الروس فی الشرق الاوسط، تالیف ب. م. دانتسیغ، ترجمة وتعلیق الدکتور معروف خزندار، بغداد، ١٩٨١، ٤٤٠ لاپەڕەیە.**



# مارف خەزنەدار:
# ئەوینێك سەرتاپێی هەبوونی ڕەنگڕێژ کردبوو؛ نەتەوە و نیشتمان

**فەرهاد شاکەلی**



شتر لەوەیە بەرهەم و نووسینیم بەرچاو کەوتبێت، یا وێندبێتەوە، بەڵام باوەڕ ناکەم بە شێوەیەکی تایبەت ەرنجمی ڕاکێشابێت. دەزانم یەکەم کتێبی ئەو، کە ەستم کەوت و خوێندمەوە (بووکەشووشە) بوو. ئەمە میلکەیەکی بچکۆلە بوو، نازانم یەک چیرۆک بوو یا لە ەندێک کورتەچیرۆک پێک هاتبوو. تا ئەو کاتە خۆیم بینیبوو.

سی کەسێک دەکەم کە زانا و نووسەر و ئەکادیمیکار مامۆستایەکی بەڕێز و گران و ڕەوشتبەرز و وەفادار و. ماوەی دوو ساڵ ڕاستەوخۆ مامۆستام بوو، لە شی کوردیی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا دەرسی پێ تووەتەوە. سالانێکی دوورودرێژیش وەک دوو هاوڕێ وەندییەکی گەرم و دۆستانەمان هەبوو، نامەمان بۆ کدی دەنووسی، کە دەچوومەوە بۆ کوردستان سەرم لێ ەدا، کە هات بۆ ئاڵمانیا، چوومە سەردانی، بەرهەمی خۆی نووسەرانی دیکەی بۆ دەناردم، زۆریش شانازیی بەوەوە ەکرد کە ڕۆژێک لە ڕۆژان خوێندکاری بووم و مامۆستام وە. پیاوێک بوو تا دوایین ڕۆژەکانی ژیانی کاری دەکرد دەینووسی و ماندووبوونی نەدەزانی و نەخشەی بۆ اری سالانی داهاتوویش دادەنا. باسی مامۆستا دۆکتۆر ارف خەزنەدار (١٩٣٠-٢٠١٠) دەکەم.

کۆنگرەی دووەمی یەکێتیی نووسەرانی کورددا، کە انگی تەمووزی ١٩٧١، لە هەولێر بە ڕێوە چوو، ئەویش بەشێکی زۆری نووسەرانی کوردیشم چاو پێ کەوتن. تر لەوێوە و لەوساوە لەگەڵ هەندێکیاندا ئاشنایەتی و ستایەتیم پەیدا کرد و هەندێکی دیکەیشیان، مەگەر هەر کۆنگرە و سەمینارەکاندا یەکدیمان ببینیبێت، ئەگەرنا وەندییەکەمان هیی ئەوە نەبوو ببێتە دۆستایەتی و شنایەتیی تەواو.

کێتیی نووسەرانی کورد، ئەگەر باشم لە بیر مابێت، اڵێک پێشتر دامەزرابوو. دامەزرانەکەی بەو شێوەیە کێک بوو لە بەرهەمەکانی ڕێککەوتننامەی یانزدەی ئازاری ١٩٧، کە بۆ یەکەم جار دەستەلاتدارانی عیراق بەڵێنی یەجێکردنی ئۆتۆنۆمی [حکم ذاتي]یان بە کورد دابوو. کۆنگرەی دامەزراندندا بڕیاردەری سەرەکی نووسەرانی ەر بە پارتیی دیمۆکراتی کوردستان بوون (باڵی سەرۆک بارزانی، کە لەناو خەڵکدا بە مەلایی ناو دەبرا). هەر لەبەر ئەوەیش بوو کە مامۆستا هەژاری موکریانی وەک سەرۆک هەڵبژێردرا. هەوڵدان بۆ دامەزراندنی یەکێتییەکی تایبەت بۆ نووسەرانی کورد، بیرێک بوو کە هەر لە سەرەتای کوودەتاکەی عەبدولکەریم قاسمەوە لەناو نووسەر و ڕووناکبیرانی کورددا هەبووە، ئەگەرچی نووسەر و ڕووناکبیری کورد، بە ژمارە، هێندە زۆر نەبوون کە بتوانن قورسایی و سەنگێکی زۆریان هەبێت بۆ جێبەجێکردنی. هێندەی بیستوومە مامۆستایان ڕەفیق حیلمی و گۆران، وەک دوو نووسەری کورد، لە یەکێتیی نووسەرانی عیراقدا چالاک بوون. یەکەمیان کەسێکی سەربەخۆ و نەتەوەیی، گۆرانیش ئەندامی پارتیی کۆمونیستی عیراق بوو.

ئەم بیرە جارێکی دی لە نیوەی دووەمی شەستەکاندا سەری هەڵداوەتەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە پارتی دیمۆکراتی کوردستان بوو بە دوو بەشەوە. ئەو بەشەیان کە لەگەڵ ڕێژیمی عیراقدا بوو پێی دەگوترا (باڵی مەکتەبی سیاسی یا جەلالی). کە بەعس لە هاوینی ١٩٦٨دا بۆ جاری دووەم دەستەلاتیان گرتە دەست، ئەم باڵە چالاکییان لە شارەکاندا زۆر پەرەی سەند. لە ڕووی فەرهەنگییەوە ڕۆژنامەی [النور]یان بە عەرەبی و گۆڤاری [ڕووناکی و ڕزگاری]یان بە کوردی بڵاو دەکردنەوە. نووسەر و ڕووناکبیرانی کورد، بە تایبەت ئەوانەی لەو باڵەوە نزیک بوون، کەوتنە خۆیان بۆ دامەزراندنی یەکێتییەکی سەربەخۆ بۆ نووسەرانی کورد. کۆمەڵێک نووسەر، بە شێوەیەکی ڕەسمی داوایان لە هەردوو وەزارەتی ناوخۆ و ڕۆشنبیریی عیراق کردبوو کە ڕێگە بدەن یەکێتیی نووسەرانی کورد دابمەزرێت. لەناو ئەمانەدا، لە هەموویان چالاکتر بۆ بە دواداچوونی کارە بیرۆکراتییەکانی ئەو داوایە کاکەمەم بۆتانی بوو. وەک خۆی دەیگێڕایەوە و لە نووسینێکیشدا باسی دەکات، لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠دا بە ڕەسمی ڕێگەیان پێ درابوو، بەڵام بە بڵاوبوونەوەی بەیانی یانزدەی ئازار، ئیدی ئەو باڵە نەخشی سیاسی و فەرهەنگییان بڕایەوە. جا



دەگوترێ ئەو یەکێتیی نووسەرانەی لە بەهاری ١٩٧٠دا دامەزرێنرا هەر لەسەر بناغەی ئەو داوایەی کاکەمەم و هاورێکانی هەڵچنرابوو. خۆشبەختانە لەو یەکێتییەدا و لە زۆربەی سەندیکا و کۆمەڵە و یەکێتییەکانی قوتابیان و ژنان و لاوان و نووسەران و مامۆستایاندا، کورد یەکگرتووانە پێکەوە کاریان دەکرد.

من لە رووی تەمەنەوە وا نەبووم کە لە خۆم راببینم بچم بۆ کۆنگرەی دامەزرانی یەکێتیی نووسەران یا ببمە ئەندامی. راستییەکەی بەرهەمم هەبوو. چەند نووسینێکم بە عەرەبی و چەند شیعرێکیشم بە کوردی بڵاو کردبوونەوە. شیعرێکیشم تەرجەمە کرابووە عەرەبی و لە رۆژنامەیەکی عەرەبی-کوردیدا لە بەغدا بڵاو کرابووەوە. بێجگە لەوانە شیعری دیکەیشم هەبوون کە دەکرا دیوانێکی بچکۆلەیان لێ پێک بهێنم. پێم وایە تا ئەو کاتەیش هیچ نووسەرێکی ناوداری کوردم نەدەناسی، بەڵام بەرهەمی بەشی زۆریانم خوێندبووەوە.

ئەو کاتە، سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیست، ئێمەی لاوی نوێخواز و دڵگەرم، گۆرانخواز و گۆڕینویست کۆمەڵێک بەها و بیر و بنەمامان کردبوونە پێوەر و بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم و ئەو، یا بەرهەمیان، دەمانخستنە کار. ئەم و ئەوی ئێمە زیاتر نووسەران و رووناکبیران و "ئەهلی قەڵەم" بوون، ئەگەرنا بۆ ئەوانەمان کە سەر و سەودایەکمان لەگەڵ سیاسەت و کوردایەتیدا هەبوو، پێوەر و بەهاکان جۆرێکی دیکە بوون، سیاسی بوون. بۆ نووسەران و رووناکبیران، ئەگەر ئێستا بووایە، دەمگوت بنەماکانی هەڵوێستمان "ئێستێتیکی" بوون، بەڵام ئەودەم هێشتا گەنجینەی تێرمینۆلۆگیی ئەدەبی و هونەریمان هێندە ئاوەدان نەبوو، ناوێکی وەها لەو هەڵوێستەمان بنێین.

سەرەتای هاوینی ١٩٧١ بۆ ئەزموونی بەکالۆریای شەشی ئامادەیی چووبووم بۆ کەرکووک. کە لێ بوومەوە، هەر لەوێوە لێم دا و چووم بۆ بەغدا. پێم وایە ٤-٥ رۆژێک لەوێ مامەوە. ئەمە سەرەتایەکی باش و پێویست بوو بۆ ناسینی کۆمەڵێک نووسەری کورد. بە سەردانی رۆژنامەی هاوکاری و بارەگای نووسەرانی کورد، کۆمەڵێکی باشم لێ ناسین. هەندێکیان لەو کاتەوە بوون بە هاورێی نزیک و ساڵانێکی دوورودرێژ پێوەندی و هاورێیەتیمان هەر بەردەوام بوو. لێرەدا تەنیا ناوی ئەوانەیان دەهێنم کە ئێستا لە ژیاندا نەماون: محەمەد بەدری، مەحموود زامدار، جەلالی میرزا کەریم، ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل و کەمال رەئووف محەمەد. هەر لەو رۆژانەدا چوومە خزمەت مامۆستا عەلائوددین سەججادی لە مزگەوتەکەی خۆی لە مەیدان. ئەو دیدارەی مامۆستا سەججادیم لە نووسینێکی دیکەمدا باس کردووە. زامدار پێی وتم مانگی داهاتوو کۆنگرەی دووەمی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە هەولێر بە رێوە دەچێت، هەوڵ بدە بێیت. بەڵێنیشی دا بە نامە لە کات و رۆژی کۆنگرەکە ئاگادارم بکات. هەر وایشی کرد. یەک دوو حەفتەیەک دواتر نامەیەکی بۆ ناردم و کاتی کۆنگرەکەی بۆ نووسیبووم کە لە پشووی ١٤-١٧ی تەممووزدا دەبێت.

یەک یا دوو رۆژ پێش کاتی کۆنگرەکە، چووم بۆ کەرکووک، بۆ ماڵی بەهەشتی مامۆستا لەتیف حامیدی بەرزنجی. دەمزانی لەتیف هەڵمەتی هاورێم لەوێیە. تا درەنگانێک دانیشتین، قسە و باسمان هەر ئەدەب و شیعر و کەمێکیش فەلسەفە بوو. ئەمەی دوایی ئارەزووی مامۆستا لەتیف حامید بوو، کە ئەودەم ئیسلامی لە چوارچێوەی فکر و فەلسەفەدا تاووتوێ دەکرد. بۆ نووستن، هەڵمەت و من چووینە سەربان، لەوێ نوێنیان بۆ راخستبووین. نووستنی چی؟ ئێمە تازە دەرگای قسە و باسمان دەکردەوە. بڕیارمان دا بچین بۆ کۆنگرەکەی نووسەران لە هەولێر و لەوێ بەیانێکی شیعری، کە من پێشتر نووسیبووم و لەگەڵ لەتیفدا برێک دەستکاریمان کرد، بڵاو بکەینەوە. بۆ بەیانییەکەی چووین بۆ هەولێر.

لە بەردەرگای هۆڵی کۆنگرە، چاوم بە دوو لاوی باریکەڵەی رانکوچۆغەلەبەر کەوت. خۆمان بە یەکدی ناساند و چۆنی و چاکییەکی گەرممان کرد. ئەمانە سامی

شۆڕش و عەزیز گەردی بوون، کە ئێستا هەردوویان لە ژیاندا نەماون. باشم لە بیر نییە، کۆنگرە دوو یا سێ ڕۆژی خایاند؟ لەو ماوەیەدا من و لەتیف [بەیانی شێتەکان]مان بڵاو کردەوە. هەر بە دەستخەت پەنجا شەست دانەیەکمان لێ نووسیبووەوە. دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو. نووسەران هەڵوێستی جۆراوجۆریان هەبوو. شەوەکەیشی کە لە یانەیەک دادەنیشتین، لەگەڵ لەتیفدا بووبووینە بابەت و باسی بەشێک لە نووسەران. زۆر کەس هەبوون حەزیان دەکرد لەگەڵیان دانیشین و باسی بۆچوونەکانی خۆمان بکەین. دیارە کەسانێکیش هەبوون گاڵتەیان پێ دەهات و پێیان وا بوو وشەی شێتەکان وشەیەکی پڕ بە پێستە بۆ لەتیف و من. دەگەڕاین بەسەر مێزەکاندا و لەگەڵ ئەم و ئەو قسەمان دەکرد. حەوت هەشت کەسێک لە دەوری مێزێکی گەورە دانیشتبوون، بانگیان کردین و زۆر بە ڕێزەوە فەرموویان لێ کردین کە دانیشین. ئێمەیش دانیشتین. کە قسەیشیان لەگەڵ کردین زۆر بە شێوەیەکی جوان و ڕێزدارانە دەدوان. ئەمانە هەندێک (یا هەندێکیان) ڕووناکبیری نەتەوەخوازی نزیکی [کاژیک] بوون. ئێستا تەنیا بەشێکیانم لە بیر ماوە، کە دۆکتۆر ئیحسان فوئاد، ئەحمەد هەردی، فەریدوون عەلی ئەمین و ئەحمەد غەففوور بوون.

ئەو یەک دوو شەوەی بۆ پێشاندانی شانۆ و خوێندنەوەی شیعر دیاری کرابوون، بەرنامەیان بۆ نووسەرانی سلێمانی و هەولێر دانابوو، کەچی کەرکووکیان پشتگوێ خستبوو. لەسەر ئەوەیش ئێمەی نووسەرانی کەرکووک و گەرمیان هەرایەکی باشمان سازاند و شانۆکەمان داگیر کرد و شیعرمان خوێندەوە. کاک لەتیفیش و منیش باسی ئەم ڕووداوەمان لە نووسینی دیکەدا کردووە. ئەم باسی کۆنگرەیەم بۆیە هێنایەوە، تا بڵێم ئەو کۆبوونەوەیە بوو بە هۆی ئەوەی بەشێکی زۆری نووسەرانی کورد بناسین، بەڵام دەتوانم بڵێم ئەوان هەر هەموویان ئێمەیان ناسی.

هەر ئەو جارە مامۆستا خەزنەداریشم چاو پێ کەوت، پێم وایە تەوقە و چۆن و چاکییشمان کرد، بەڵام نە بووینە ئاشنا و نە ئاسیاوی و هاوڕێیەتیمان لەنێواندا دروست بوو. هەمووی سێ مانگ، سێ مانگونیو دواتر، لە بەشی کوردیی کۆلێجی ئادابی زانکۆی بەغدا وەرگیرام. لەوێ دۆکتۆر ئیحسان و دۆکتۆر خەزنەدار و مامۆستا فەریدوون مامۆستا بوون و لە پلەی جیاوازدا دەرسیشیان پێ گوتووم. لەگەڵ مامۆستا فەریدوون هەر زوو بووین بە هاوڕێ. زۆرجار پێکەوە دادەنیشتین و باسی شیعر و ئەدەب و کەمێکیش سیاسەتمان دەکرد. تێگەیشتن لە مامۆستا خەزنەدار ئاسان نەبوو. هەمیشە مەودایەکی لەنێوان خۆی و خوێندکاردا دەهێشتەوە، با خوێندکار شاعیر و نووسەر و داهێنەریش بووبێت. کەچی یەکێکی وەک مامۆستا فەریدوون، هەر لەو دیدارەی هەولێرەوە، وەک شاعیرێکی لاو و کەسێکی داهێنەر لە منی دەڕوانی و هاوڕێیەتیی دەکردم. نێوانم لەگەڵ دۆکتۆر ئیحسان و دۆکتۆر عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ و دۆکتۆر کاووس قەفتانیش خۆش بوو، بەڵام بە شێوە و پلەی جیاواز. ئێمەی لاو و دڵگەرم و گۆڕینخواز، هەروا بە ئاسانی نەماندەتوانی لە کەسێکی وەک مامۆستا خەزنەدار تێبگەین و لێی نزیک ببینەوە و پردی پێوەندییەکی سفت و دۆستانە بۆ گەیشتن بە هەرێمی فەلسەفە و جیهانبینیی ئەو پیاوە هەڵچنین. ئەو خۆیشی وا پێ دەچوو، هێندە پەرۆشی ئەوە نەبێت ڕێگایەک بکاتەوە تا ئێمە لێی نزیک ببینەوە یا ئەو لە ئێمە نزیک ببێتەوە. دەتوانم بڵێم ئەو وێنەیەی مامۆستا خەزنەدار کە لای ئێمە دروست بووبوو، ئەوە بوو کە مامۆستا لە پێوەندی و هەڵوێستی ڕۆژانەیدا کۆنسێرڤاتیڤ بوو، لە ڕوانگەی ئەدەبی و فەرهەنگیشەوە کلاسیکانە بیری دەکردەوە.

ئێستا کە ئەم دێڕانە دەنووسم، دەزانم ئەو دوو چەمکەی بە کارم هێناون، لەم بوارەدا سوود بە نووسینەکەم ناگەیێنن و بۆ ناساندنی خەزنەدار کۆمەکێکی ئەوتۆ ناکەن. ڕاستییەکەی هەردوو چەمکی کۆنسێرڤاتیڤ و کلاسیک هیچ واتایەکی نەرێنی نابەخشن، بەڵکە تەنیا ئەوەمان پێ دەڵێن کە کەسێک، چۆن دنیا و کۆمەڵگە و فکر و فەرهەنگ دەبینێت. ئەو دوو چەمکە دەربڕی بیرکردنەوەیەکن و وەک زۆر چەمکی دیکە تێگەیشتنێکی ڕوونترمان لەبارەی ئەو جیهانبینییەوە پێ دەبەخشن. ئەو سەردەمە



ئێمە و زۆری وەک ئێمەیش ئەو جۆرە جیهانبینی و فەلسەفەیەمان، هەڵبەتە بە هەڵە و ناهەق، وەک شێوەیەکی کۆنەپەرستی دەخوێندەوە.

دۆکتور خەزنەدار مامۆستایەکی بە دیسپیلین بوو. لە پۆلدا، نایەتەوە بیرم، لە بابەتی دەرس بەولاوە باسی شتێکی دیکەی کردبێت. مامۆستاکانی دیکە، ناویان ناهێنم، لەبارەی زۆر شتی لابەلا و سەر بە دەرەوەی بابەتی دەرسەوە قسەیان دەکرد. بۆ خوێندکارێکی هۆشیار ئاسان بوو کە بزانێت مامۆستا تا ڕادەیەکی زۆر حەزی لە ئەدەبی کلاسیکی کوردییە و پێی خۆشە لەو بوارەدا بنووسێت و توێژینەوە بکات و خوێندکارانی فێر بکات. باوەڕ ناکەم و نەمخوێندووەتەوە کە خۆی شیعری نووسیبێت، چ بە شێوەی کلاسیک یا نوێ و مۆدێرن. کە ئەمە دەڵێم، دەمەوێ ئەوەیش وە بیر بهێنمەوە کە کەم خوێنەوار و نووسەری کورد هەیە شیعری نەنووسیبێت یا هەوڵی نەدابێت بینووسێت. کورتەچیرۆک، کە لە ئەدەبی کوردیدا ژانرێکی نوێیە، ئەو سەردەمە نووسەران کەمتر خۆیان لێ دەدا، بەڵام خەزنەدار چیرۆکنووس بوو، بابەتی چیرۆکەکانیشی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کوردستان و خەباتی سیاسیی کورد بوو.

لە ساڵانی لاوێنیدا، پێش ئەوەی بچێت بۆ یەکێتیی سۆڤیێت بۆ خوێندنی دۆکتورا، خەزنەدار لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی دەینووسی. یەکێک لە بەرهەمە باشەکانی ئەو سەردەمەی کتێبی [أغاني کردستان]ە کە بەرهەمی کۆمەڵێک شاعیری کوردی تەرجەمەی عەرەبی کردوون و ساڵی ١٩٥٦ چاپ کراوە. ڕەنگە کاری دیکەیشی هەبن کە من لێیان بێئاگام. نیشانەیەکی دیکەی شیعردۆستیی خەزنەدار، بە تایبەت شیعری کلاسیکی، کتێبی [کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا]یە، ساڵی ١٩٦٢ چاپی کردووە. هەر لە کۆتاییی پەنجاکاندا خەزنەدار بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە گۆڤارێکی کوردیدا، کە گۆڤاری [شەفەق] بوو، لە کەرکووک دەردەچوو، دەست بە کار دەکات. ساڵانێک دواتر، لە سەرەتای حەفتاکاندا سێ ژمارە لە گۆڤاری [دەفتەری کوردەواری] بڵاو دەکاتەوە. ئەم گۆڤارە پلەیەکی بەرزی ئەدەبی و زانستیی هەبوو. هەر لەو ساڵانەدا ماوەیەک سەرنووسەری گۆڤاری [نووسەری کورد] بوو، لە بڵاوبوونەوەی گۆڤاری [شمس کردستان : ڕۆژی کوردستان]یشدا نەخشێکی دیاری هەبوو، بەڵام نازانم سەرنووسەر بوو، یا ئەندامی دەستەی نووسەران.

شۆڕشی یا کوودەتای چواردەی تەمووز دەرفەتێکی باشی بۆ کورد هێنایە پێشەوە کە لە ڕووی سیاسی و فەرهەنگییەوە گەشە بکەن و بۆ پێشخستن و گەشەپێدانی خەباتی ئازادیخوازانە و بۆ پێشکەوتنی زمان و ئەدەبی کوردی کاری گەورە بکەن. هەر لەو دەمەیشدا بوو کە کۆمەڵێک خوێندکاری کورد هەڵبژێردران و نێردران بۆ یەکێتیی سۆڤیێت بۆ خوێندن. یەکێک لەو خوێندکارانە مارف خەزنەدار بوو. تێزی دۆکتۆراکەی لەبارەی نالییەوە نووسیبوو. من بۆ خۆم تا ئێستا تێزەکەیم بە هیچ زمانێک نەبینیوە و نەخوێندووەتەوە. سەرپەرشتیاری تێزی دۆکتۆراکەی، پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ (کوردۆیێڤ) بوو. من باوەڕ ناکەم خەزنەدار سوودێکی ئەوتۆی لە کوردۆیێڤ وەرگرتبێت. بەشێکی زۆری ئەوانەی لە سۆڤیێت خوێندوویانە زۆر پەسنی ئەو پیاوەیان دەدا و بە بەژنوباڵای زانستیی ئەویاندا هەڵدەدا، بەڵام من پێم وایە ئەو وێنەیە زێدەڕۆیی و درشتبینییەکی زۆری تێدایە. پێشەکییەکەی کوردۆیێڤ بۆ [مەم و زین]ی ئەحمەدی خانی، کە ڕودێنکۆ ئامادەی کردووە، بخوێنەوە، تێدەگەی کە کوردۆیێڤ نە زانایە و نە ئەدەبناسە. لەوەیش سەیرتر، ساڵانێک دواتر کتێبێکی مێژووی ئەدەبی کوردیی لە دوو بەرگدا نووسیوە و لە ستۆکهۆڵم بە ئەلفوبێی لاتینی چاپ کراوە، لەوەیشدا کوردۆیێڤ دیسان ئەوەی چەسپاندووە کە شارەزای زانستی ئەدەب نییە و ئەدەبی کوردی ناناسێت. نازانم لەبارەی ئەدەبی کوردییەوە لێکۆڵینەوەی دیکەی هەیە یا نە؟ بەڵام من نایەتەوە بیرم هیچ بەرهەمی دیکەیم




لەو بوارەدا دیتبێت یا خوێندبێتەوە. یەک دوو بابەتێکی لە گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورددا بڵاو بووبوونەوە کە دیسان سەرنجڕاکێش نین. پێم وایە لە بواری زمان و ڕێزماندا بڕێک باشتر بووبێت. دەمەوێ بڵێم کوردۆیێڤ زانستێکی هێندە قووڵی نەبووە پێشکەشی خەزنەداری بکات، بەڵام وا پێ دەچێت، خەزنەداری خوێندکار خۆی هەوڵی دابێت و لە ڕێگەی زمانی ڕووسییەوە سەرچاوە زانستییەکانی خوێندبێتەوە.

ساڵی ١٩٦٩، کە دەبێ تازە لە سۆڤیێت گەڕابێتەوە، خەزنەدار دوو کتێبی چیرۆک بڵاو دەکاتەوە، [بووکەشووشە] و [ئەڵەمان کوردی]. ئەمەی دووەمیان لە حەڤدە کورتەچیرۆک پێک هاتووە. خۆشبەختانە چەند ساڵێک لەمەوپێش چیرۆکی [بە ئامانج گەیشت]م تەرجەمەی زمانی سویدی کرد و لە ئەنتۆلۆگیای [باڵندەکان دەگەڕێنەوە بۆ چیاکان]دا، کە لە ٢٣ کورتەچیرۆکی تەرجەمەکراوی کوردی پێک هاتبوو بڵاو کرایەوە. وا پێ دەچێت دوای بڵاوکردنەوە ئەو دوو کتێبەی، ئیدی مامۆستا خەزنەدار لە بواری کورتەچیرۆکدا کارێکی ئەوتۆی نەکردبێت. پێم وایە ساڵانی دواتر دوو یا سێ کورتەچیرۆکی نووسیبوون، بەڵام ئیدی بەردەوام نەبوو. لەم ڕۆژانەدا کاک (سەباح ڕەنجدەر)ی شاعیر کورتەچیرۆکی [دڵ و نەتەوە]ی خەزنەداری بۆ ناردم کە لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا نووسیویەتی و بڵاوی کردووەتەوە. پێشتر ئەم چیرۆکەم نەبینیبوو.

مامۆستا خەزنەدار، وەک باسم کرد، چیرۆکنووس بوو. ئێستا کە چیرۆکەکانی لە بەردەستمدا نین، تەنیا لەبارەی دوویانەوە دەتوانم شتێک بڵێم؛ بە ئامانج گەیشت و دڵ و نەتەوە. ناوەڕۆکی هەردوو چیرۆکەکە، وا پێ دەچێت، تا ڕادەیەک ئەزموونی خەزنەدار خۆی بن لە چلەکان و پەنجاکانی سەدەی ڕابوردوودا. لە چیرۆکی بە ئامانج گەیشت-دا قوتابییەکی کوردی چالاکی سیاسی هێندە بزێوە کە خۆپارێزی نازانێت و پێی خۆشە ڕێژیمی عیراقی ئەوسا بیگرن و بخرێتە زیندانەوە. هەر وایش دەبێت و دەگاتە ئامانجەکەی. چیرۆکی دڵ و نەتەوە باسی دڵدارییەکی سەرەتای لاوێتیی کوڕ و کچێکی کوردە (ئەمیان ناوی بەدیعەیە) لە هەولێر. کوڕە لاوەکە بێجگە لە جوانیی بەدیعە، زۆرتر عاشقی ئەوە دەبێت کە ئەگەرچی ماڵی بەدیعە کوردن، لە ماڵدا بە تورکمانی دەدوێن، بەڵام بەدیعە لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیدا هەر بە کوردی قسە دەکات. ئەمە بۆ کوڕە لاوەکە لایەنی هەرە گەش و جوان و دڵڕفێنی عیشقەکەیەتی. دەیەوێ بەدیعە فێری خوێندنەوە و نووسینی کوردییش بکات، کەچی دەبینێت کچە پێشتر دەستی پێ کردووە خۆی فێر بکات. ئەم چیرۆکە ڕێک پێشاندەری هەستی نەتەوایەتیی خەزنەدارە. لە دڵیدا جێگای داناوە بۆ عیشقی کچێکی جوان، هەروەهایش عیشقی زمان و نەتەوەکەی.

ناوەڕۆکی چیرۆکەکانی خەزنەدار لە زۆر ڕووەوە هاوشێوەی بەرهەمی چیرۆکنووسانی پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی بیستی کوردستانن، بۆ نموونە محەمەد مەولوود و مستەفا ساڵح کەریم. لە چیرۆکی دڵ و نەتەوە-دا، هەوڵدانێک بۆ گۆڕین و نوێکردنەوەی شێوە، نابینین. گێڕانەوەیەکی نەریتانە جێگەی فۆرمی گرتووەتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا ناوەڕۆکی ڕۆمانتیک و نۆستالجیک هێندە بەهێزە کە ناهێڵێت بیری خوێنەر بە ئەملا و ئەولادا بڕوات و پەرتەوازە بێت.

خەزنەدار کە دەچێتە سۆڤیێت، شارەزاییەکی باش لە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی ئەدەبیدا پەیدا دەکات. ئیدی دوای هاتنەوەی بۆ نیشتمان و کارکردنی وەک مامۆستای زانکۆ، بەشی هەرە زۆری کات و ژیانی خۆی بۆ ئەو بوارە تەرخان دەکات. کتێبەکانی لەبارەی میسباحوددیوان (١٩٧٠) و نالییەوە (١٩٧٧، ١٩٨١) و هەروەهایش [لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە: ١٩٨٤] سەرچاوەی گرنگن. ڕاستییەکەی ئەم کارانە هەموو خۆئامادەکردنێکی ژیرانە بوون بۆ پرۆژە گەورەکەی ژیانی، کە نووسینی [مێژووی ئەدەبی کوردی] بوو. خۆشبەختانە ئەم کارەی لە سێبەری کوردستانێکی، تا ڕادەیەک، ئازاددا و لە حەوت بەرگدا گەیاندە نووسەر و خوێنەر و ڕووناکبیرانی کورد. جێی سەرنجە کە مامۆستا، ئەگەرچی بەرگی شەشەم و حەوتەمی کتێبەکەی بۆ نووسەران و شاعیرانی سەدەی بیستەم تەرخان کردووە، کەچی

له شاعیرانی نەوەی دوای گۆران، تەنیا سێ کەسی پێشکەش کردوون، لە کاتێکدا نەوەی دوای گۆران قۆناغێکی بەهێز و ڕەنگینی ئەدەبی کوردییە.

ئارەزوویەکی دیکەی زانستانەی خەزنەدار ئەوە بوو کە ڕۆژهەڵاتناسان و کارەکانیان بە خوێنەری کورد بناسێنێت، هەروەهایش ئەو بەڵگەنامە و دەستنووسانەی کە دیسان بە هۆی ڕۆژهەڵاتناسانەوە گەیێنراونەتە ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە لە زانکۆ و ئەکادیمییەکانی وڵاتانی ئەورووپایی، بڵاو بکاتەوە. ئەمەیان کارێکی ئاسان نەبوو. لە سەردەمی ڕێژیمی سۆڤییتدا، هەزاران ئاستەنگ و لەمپەریان لە بەردەم بەکارهێنانی دۆکومێنت و ئەرشیڤدا دروست دەکرد. هەموو شتێکیان دەخستە ژێر پرسیارەوە. لەم ڕووەوە کوردناسی ناوداری بریتانی پرۆفیسۆر دەیڤید نیل مەکینزی (١٩٢٦-٢٠٠١) جارێکیان باسی ڕووداوێکی بۆ گێرامەوە کە بەسەر خۆیدا هاتبوو (سەبارەت دەستنووسە کوردییەکان لە لێنینگراد)، ڕەنگە هەر بۆ ئەوە بشێت بۆ پێکەنین بگێردرێتەوە. مامۆستا خەزنەدار لەم بوارەدا چەند کتێب و وتار و هەندێ دۆکومێنتیشی بڵاو کردوونەوە، کە ڕەنگە گرنگترینیان، ڕۆژنامەی (کوردستان) و دەستنووسەکەی عەلی تەرەماخی بێت سەبارەت ڕێزمانی عەرەبی کە بە کوردی نووسیویەتی.

لێرەدا پێم باشە ئەو هەڵوێست و بۆچوونەی خۆم دووبارە بکەمەوە کە ساڵانێکی دوورودرێژە پێی گەیشتووم و لە نووسینی دیکەیشمدا جەختم کردووە. مامۆستا خەزنەدار و بەشی زۆری ڕووناکبیرانی کورد، بەتایبەت ئەوانەی لە بواری کوردناسیدا توێژینەوە دەکەن و دەنووسن، پێیان وایە کوردناسەکان یا ڕۆژهەڵاتناسەکان دۆستی دڵسۆزی کورد و گەلانی ڕۆژهەڵات بوون و ئەو کار و لێکۆڵینەوانەی کردوونیان، تەنیا لە پێناوی زانستدا و بە نیازی کاری زانستی و ئەکادیمی ئەنجامیان داون. من پێم وایە کوردناسەکان و ڕۆژهەڵاتناسان، بەشی هەرە هەرە زۆریان، هەروا ڕوون و ڕەوان، جاسووسی دەستگاکانی هەواڵگریی ئەم وڵات و ئەو وڵاتی کۆلۆنیالیست و ئیمپەریالیست بوون. ئەوان بەو کارەیان ویستوویانە گەل و ناوچەی جۆراوجۆری ڕۆژهەڵات بناسن و کارئاسانی بۆ داگیرکردن، دەستتێوەردان، چەوساندنەوە و پارچەپارچە کردنیان لەلایەن کۆلۆنیالیستان و ئیمپەریالیستانەوە بکەن. ڕاستییەکەی ئەوانەی کە جاسووس نەبوون و بە ڕاستی لە پێناوی زانستدا کاریان کردووە یەکجار کەمن. لە ماوەی ٤٦ ساڵی ژیانمدا لە ئەورووپا، بەتایبەت دوای ئەوەی لە زانکۆی ئوپسالای سوێد وەک مامۆستای زمان و ئەدەبی کوردی دامەزرام، لە دەیان کۆنگرە و کۆنفرانس و سەمیناری زانستی و ئەکادیمیدا و لە زانکۆ و وڵاتانی جۆراوجۆری جیهاندا، لە ڕۆژهەڵات و ئەورووپا و ئەمەریکا، ئامادە بووم و بە وتار و لێکۆڵینەوەی زانستی بەشداریم کردووە. لەو گردبوونەوانەدا دەیان ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسی ڕۆژهەڵاتی و ئەورووپایی و ئەمەریکاییم ناسیون و بەشێکی باشی کار و توێژینەوەکانیانم خوێندوونەوە. دەکرێ لەم بارەیەوە شتێکی زۆر بگوترێ و بنووسرێ. لە بەشێکی زۆری نووسین و دیدارەکانمدا بە درێژا لەم بابەتە دواوم، ڕەنگە کتێبی [دەرزیئاژن] نموونەی هەرە دیار بێت.

هەمیشە ئەوەم بە لاوە سەیر بووە کە بۆچی بەشێکی زۆری نووسەر و ئەکادیمیکارانی کورد لەو ڕاستییە نەگەیشتوون کە ڕۆژهەڵاتناسی، بێ ئەملا و ئەولا، واتە زانستی جاسووسی بۆ خزمەتی کۆلۆنیالیزم و ئیمپەریالیزم؟ چۆنە کەسێکی وەک مامۆستا خەزنەدار یا تەنانەت مامۆستا مەسعوود محەمەد ئەوڕاستییەیان بە تەواوی لا ڕوون نییە؟ مامۆستا خەزنەدار ئاشنای ئەو باوەڕ و هەڵوێستەی من بوو، دەیزانی وا بیر دەکەمەوە، بەڵام هەرگیز ئەو بابەتەی لەتەکدا باس نەدەکردم. خۆزگە مامۆستا و ئەکادیمیکار و ڕووناکبیرانی کورد لە ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانەوە کار و بەرهەمی ڕۆژهەڵاتناسانیان بخوێندایەتەوە و هەڵبسەنگاندایە، ئەو پردە پانوپۆڕەیان بە دی بکردایە کە ڕۆژهەڵاتناسان و

بەرهەمەکانیان دەبەستێت بە کۆلۆنیالیزم و ئیمپەریالیزمەوە.
خەزنەدار ساڵانێکی دوورودرێژ مامۆستا بوو لە زانکۆی بەغدا لە عیراق، زانکۆی عەنناب لە جەزائیر و زانکۆی سلێمانی و زانکۆی سەلاحەددین لە کوردستان. ماوەیەکیش ئەندامی ئەکادیمیای کوردی بوو. مامۆستا دوایین بیست – بیستوپێنج ساڵی ژیانی خۆی لە هەولێری پێتەختی هەرێمی کوردستان، کە شوێنی لەدایکبوونی خۆی بوو، بردە سەر. ئەو ساڵانە لە ساڵە بەبرشت و پربەرهەمەکانی ژیانی بوو. لەو ساڵانەدا حەوت بەرگی مێژووی ئەدەبی کوردی، بیرەوەرییەکانی خۆی [رۆژگاری من] لە دوو بەرگدا و چەندان لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و کتێبی وەرگێردراوی بڵاو کردنەوە. هەروەها زۆر بابەتی لە گۆڤارە کوردییەکاندا دەنووسین. لەو ساڵانەدا ماڵی خەزنەدار و نامەخانە تایبەتییەکەی خەزنەدار بووبوونە مەڵبەندی گەورە و گرنگ و کاریگەر بۆ دۆست و ئاشنا و خوێندکاران و بۆ هەر کەسێک لە بواری لێکۆڵینەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردیدا کاری بکردایە. نامەخانەکەی بە ڕاستی هێندە دەوڵەمەند بوو، کە مرۆڤ سەری سڕ دەما ئەم هەموو کتێب و گۆڤار و دەستنووس و بەڵگەنامە و ئەتڵەس و نەخشانەی چۆن کۆ کردوونەوە و پاراستوون. ئەوجا لەوەیش سەیرتر ئەم ناوەندە گەورەیە هێندە جوان ڕێک خرابوو، وات دەزانی لە کتێبخانەیەکی دەوڵەتی یا سەر بە زانکۆیەکی ئەورۆپاییدایت.

ئەو ساڵانەی کە لە بەشی زمانی کوردیی زانکۆی بەغدا دەمخوێند، پێوەندیم لەگەڵ دۆکتۆر خەزنەداردا پێوەندیی خوێندکار و مامۆستا بوو. ئەم جۆرە پێوەندییە زیاتر لە چوارچێوەی زانکۆدا ڕەچاو دەکرا، ئەگەرنا زۆرجاریش لە کۆڕ و سەمینارەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد و کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردی و دەستگا کوردییەکانی دیکەدا وەک هەر نووسەر و رووناکبیرێکی کورد چاومان بە یەکدی دەکەوت. هەموو ساڵێکیش، لە نەورۆز و بەهاردا قوتابیانی بەشی کوردی، دەچووین بۆ سەیران، بۆ لای کۆشک و تاقی کیسرا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی بەغدا، یا زەریاچەی حەببانییە، یا (قەناتی جەیش)ی نزیکی بەغدا، لەم سەیرانانەدا، کە یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ڕێکی دەخستن، مامۆستاکانیش دەهاتن. ئیتر لەوێ گۆرانی و هەڵپەڕکێ و خواردنی کوردەواری و وێنەگرتن و پیاسە و چاوبڕکێی کوڕان و کچان و توێژین... هتد، سنوورێکی لەنێواندا نەدەهێشتەوە. هەموو کورد بووین و بۆ سەیران و خۆشی هاتبووین. ئەو کاتە کورد و بزووتنەوەکەیشی بەهێز بوون، لەگەڵ ڕژێمی عیراقدا ڕێککەوتنی ئۆتۆنۆمی کرابوو.

جارێکیان بۆ سەیرانی ساڵانەمان دەڕۆیشتین. بەشی کوردی بەشێکی زۆر گەورەی زانکۆ بوو. چوار پێنج ئۆتۆبووسیان بۆ گرتبووین. لەو پاسەدا کە منی تیدا بووم، مامۆستا خەزنەدار و نازانم کێی تر لە مامۆستایان هەبوون. خوێندکارەکان بە دەنگێکی بەرز گۆرانییەکیان دەگوتەوە کە لەو ماوەیەدا ناوێکی زۆری دەرکردبوو، چونکە باسی برایەتیی کورد و عەرەبی دەکرد و شیعرەکەیشی تێکەڵاوییەکی عەرەبی و کوردی بوو، بەڵام هونەرمەندەکەی کە گۆرانییەکەی دەخوێند عەرەب بوو. لە گۆرانییەکەدا ڕستەیەکی ئاوا هەبوو [سەلاحەددین قارەمان، نیشانەک بوو]. کەچی خوێندکارەکان گۆڕیبوویان و دەیانگوت [سەلاحەددین قارەمان، سەگبابەک بوو]. مامۆستا خەزنەدار بە بیستنی ئەمە زۆر تووڕە بوو. ئەو لە پێشەوە دانیشتبوو، بەڵام لای کردەوە و ڕووی لە خوێندکارەکان کرد و بە دەنگێکی بەرز وتی (ئەوەی دەڵێ سەگبابێک بوو، خۆی سەگبابە).

لە مانگی سێیەمی ساڵی ١٩٧٤دا، ڕێککەوتنی کورد و ڕژێمی عیراق دەگەیشتە کۆتایی. بڕیار بوو لەو چوار ساڵەی ئاگربەست و ئاشتییەدا ڕژێم ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان جێبەجێ بکات، بەڵام نەیکردبوو. بواری ئاشتی نەمابوو. هەموو کەسێک دەیزانی شەڕ دەبێتەوە. ئەمەیش نیگەرانییەکی زۆری دروست کردبوو. ئەو کاتە، سەرەڕای ئەوەی دەمخوێند، لە ڕۆژنامەی [برایی]شدا کارم دەکرد. لەگەڵ کاک لەتیف هەڵمەتدا لە گەڕەکی وەزیرییەی بەغدا ژوورێکمان پێکەوە گرتبوو. ئەویش لە ڕۆژنامەی براییدا کاری دەکرد. لە سەرەتای مانگی سێدا ئێمەی نووسەرانی ڕۆژنامەکە بڕیارمان دا بەغدا بە جێ بهێڵین و بچین بۆ کوردستان و بچینە



ناو شۆڕشەوە. هەر وایشمان کرد. وا بزانم چواری مانگ بوو چووین بۆ هەولێر و لەوێوە لقی هەولێری پارتیی دیمۆکراتی کوردستان ڕێنوێنییان کردین و چووین بۆ ناوپردان و چۆمان، کە سەرکردایەتیی شۆڕشی لێ بوو. یەک ساڵی تەواو پێشمەرگە بووین. چیرۆکی ئەو هەرەس و شکستە گەورە و کارەساتبارەی کورد و شۆڕشەکەی هیی ئەوە نییە لێرەدا بە دوو سێ دێڕێک بیگێڕمەوە. ئەوەی خۆی ئەزموونەکەی نەدیتبێت، ئاستەمە تێی بگات.
لە ئەنجامی هەرەسەکەدا زۆربەمان گەڕاینەوە بۆ عێراق. دوای خۆ بە دەستەوە دان و ڕێکخستنی کاغەز و ڕێوجێی ڕەسمیی گەڕانەوە بۆ شوێنی کار یا خوێندن، من گەڕامەوە بۆ خوێندنەکەی زانکۆم. دوای ساڵێک پێشمەرگایەتی، ئێستا ئیتر ئێمە گۆڕابووین و مامۆستا و دۆست و ئاشنا و ناسیاوەکانیشمان گۆڕابوون. ئێمە ئەزموونێکی پڕ و سەرشار و قووڵمان پەیدا کردبوو، ئەوانیش بە چاوێکی دیکە لە ئێمەیان دەڕوانی. لە خوێندکارانی بەشی کوردی، پێم وایە نزیکەی سی چل کەسێک دەبووین چووبووینە دەرەوە. مامۆستا خەزنەدار لەوانە بوو بەخێرهاتنەوەیەکی گەرمی لێ کردین. مامۆستا عیززەدین ڕەسووڵ، پێش دەستپێکردنی دەرس، وێڕای بەخێرهێنانەوە، وتی: چوونە دەرەوەتان نیشتمانپەروەری بوو، هەروەهایش گەڕانەوەکەتان. بەشی هەرە زۆری قوتابیان و مامۆستایان و نووسەر و ڕووناکبیران، بە چاوی ڕێزەوە لەو ساڵی پێشمەرگایەتییەی ئێمەیان دەڕوانی. بێگومان کەسانێکیش هەبوون کە توانجیان تێ گرتبین، بەڵام ئەمانە زۆر نەبوون. من بۆ خۆم تەنیا دوو کەس بەو جۆرە قسەیان لەگەڵ کردم؛ کچە خوێندکارێکی هاوپۆلم، کە ئاسووریی عەینکاوەی هەولێر بوو، هەروەهایش ڕووناکبیرێکی کورد کە هاوڕێی نزیکیش بووین، چونکە

ئەو ئەندامی حیزبی کۆمونیستی عێراق بوو، کە ئەودەم لەگەڵ بەعسی سەددامدا بەرەی نیشتمانییان پێک هێنابوو، لە کوردستانیش دژی شۆڕشی ڕزگاریخوازانەی کورد، چەکی ڕێژیمی بەعسیان لە شان کردبوو.
هاوینی ١٩٧٥، دیسان بە هۆی کاری سیاسییەوە وڵاتم بە جێ هێشت و ماوەی دوو ساڵ لە سووریا و لوبنان ژیام و هاوینی ١٩٧٧ ڕووم کردە ئەورووپا. سەرەتا دە مانگ لە ئاڵمانیا (ی ئەوکات ڕۆژاوا) ژیام و دواتر چووم بۆ سوید. چەند ساڵێک هیچ پێوەندییەکی ڕاستەوخۆم بە کوردستانەوە، تەنانەت بە کەسوکاری خۆیشمەوە، نەمابوو.
ساڵانێک دواتر بیستم کە مامۆستا خەزنەدار لەبەر گوشاری بەعس، عێراقی بە جێ هێشتووە و چووەتە وڵاتی ئەلجەزائیر و لە زانکۆی عەننابە کار دەکات. بە هۆی دۆستێکمەوە ناونیشانەکەیم دەست کەوت و ئیتر نامەگۆڕینەوە لە نێوانماندا دەستی پێ کرد. هەروەها چەند جارێک کتێبی کوردییشی بۆ ناردم. منیش کتێبەکانی خۆم و کۆڤاری [مامۆستای کورد] و چاپەمەنیی دیکەیش، ئەوەی کوردی تاراوگە بڵاویان دەکردنەوە، دەنارد بۆی. زۆر دڵی بە مامۆستای کورد خۆش بوو. ئێستا ئیتر پێوەندی و شێوەی یەکدواندنمان گۆڕابوو. نامەکانی پڕ بوون لە وشە و دەربڕینی خۆشەویستی و ڕێز، بێگومان منیش هەروەها. هاوینی ١٩٨٩ لەگەڵ ماڵ و منداڵدا گەشتێکمان کرد بۆ جەزائیر و مانگێک لەوێ ماینەوە. بە داخەوە چاوم بە مامۆستا نەکەوت، چونکە لەوێ نەمابوو، ماوەیەک پێش چوونەکەی ئێمە گەڕابووەوە بۆ کوردستان و پێم وایە هەر لەو کاتەوە ئیتر لە هەولێر دانیشت.
هەلومەرجی کوردستان زۆر خێرا بەرەو وەرچەرخان دەڕۆیشت. هۆیەکی ڕاستەوخۆی ئەمە برانەوەی شەڕی عێراق-ئێران، کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە و پرۆسەی دڕندانە و فاشیستانەی ئەنفالی خەڵکی کوردستان بوو. بەهاری ١٩٩١ ڕاپەڕینی گەورە و شکۆداری خەڵکی کوردستان ڕووی دا. هەر لە سۆنگەی ئەوەیشەوە ڕێژیمی بەعس کەوتە گوتوبێژ لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردستاندا کە بەرەی کوردستانی نوێنەرایەتیی دەکرد. ئەو هاوینە لەگەڵ ماڵ و منداڵدا چووم بۆ ئێران، چونکە

ماڵی باوکم لە کۆڕەوەکەدا چووبوونە ناوچەی پاوەی کوردستانی ڕۆژهەڵات. ئەوە یەکەم جار بوو، کە دوای شانزدە ساڵی تەواو، چاوم بە باوکودایک و خوشکوبرا و کەسوکارم دەکەوت. شانزدە ساڵ بوو، لە هەندێ نامە و ٣-٤ جار تەلەفۆن بەولاوە هیچ ڕێگایەکی پێوەندیم پێیانەوە نەمابوو. ئەوە یەکەم جار بوو کە چاویان بە هاوسەری ئەو کاتە و سێ منداڵەکەم دەکەوت. نزیکەی حەفتەیەک لەگەڵ ئەواندا مامەوە. کە زانیم دەرفەتی چوون بۆ باشووری کوردستان هەیە، بێ دوودڵی چووم بۆ ئەوێ. ناوەڕاستی مانگی حەوتەم بوو. سەرەتا چوومە پێنجوێن. ئەو شارە جوانەی بە پێشمەرگایەتی سێ جار بینیبووم، ئێستا کۆمەڵێک کەلاوە بوو. یەک تاکە دیواری بە پێوە نەمابوو. بەلام شارێک لە تەنەکە و تەختە و لاستیک و نایلۆن دروست کرابوو، شارێکی تەواو. ئێستایش سەرم لەوە سڕ دەمێنێت چۆن ئەو ئۆتۆمۆبیلانە لەم گەڕەکەوە دەچوون بۆ ئەو گەڕەک و چۆن بەناو ئەو کۆلانە باریکانەدا، کە هەموو خانووەکان، خانووی تەنەکە و تەختە و نایلۆن، لە یەک دەچوون، هاتوچۆیان دەکرد؟

پرسیارم لە هەندێ لە دۆستەکانم کرد، کە لە پارتییە سیاسییەکانی کوردستاندا کاریان دەکرد، ئایا دەکرێ بچم بۆ ناو شارەکان؟ گوتیان شارە گەورەکانی وەک سلێمانی و هەولێر بە دەست هێزەکانی عیراقەوەن، بەلام بەشێک لە شارە بچکۆلەکان بە دەست پێشمەرگە و پارتییەکانی کوردستانەوەن. بڕیارم دا بچم بۆ شەقلاوە. ماشێنێکی جیپ و دوو پێشمەرگەیان لەتەکدا ناردم، بەلام تەنیا دەمانچەیان پێ بوو. کلاشنیکۆفێکیشیان هێنابوو، لەناو ماشێنەکەدا شاردبوویانەوە. لە ڕێگەی قەلادزێوە چووینە ڕانیە. ئەو شارانە هەموو ڕووخێنرابوون. تاک تاک دیوار بە پێوە مابوو، ئیتر ئەوی دیکە هەموو کەلاوە و وێرانە بوو. لە ڕانییەوە بە ڕێگەی هەریر و باتاسدا چووین بۆ شەقلاوە. لەوێ میوانی خوالێخۆشبوو مامۆستا سەعد عەبدوڵڵا بووین، کە ئەوکات لە سەرکردەکانی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان بوو. هەر دوای یەک دوو ڕۆژ، کۆڕێکی ئەدەبییان بۆ ڕێک خستم. دیسان دوای ساڵانی دوورودرێژ، چاوم بە هەندێ لە هاوڕێیانی نووسەر کەوت؛ ئەوانەی لە بیرمن مامۆستایان سەعید ناکام، محەمەدی مەلا قادر، دۆکتۆر جەمال ڕەشید، مەحموود زامدار، جەلال بەرزنجی و خالید جووتیار بوون، ئەوانی دیکەم لە بیر نین. پرسیارم لەوان کرد ئایا دەکرێ بچم بۆ هەولێر؟ وتیان شارەکە بە دەست عیراقەوەیە و سەربازی عیراقی بەناو شاردا دەسووڕێنەوە و لە ڕێگایش بازگەیان هەیە، هەندێک جار داوای ناسنامە دەکەن و هەندێک جاریش نایکەن. لە پێشمەرگەکانم پرسی، ئێوە دەڵێن چی؟ بچین یا نە؟ گوتیان، بڕیار، بڕیاری تۆیە، ئەگەر دەتەوێ بچیت، ئێمە لەگەڵت دێین. ئەگەر خوا نەخواستە شتێک ڕووی دا، بە خوا تا دوا فیشەک بەرگری لە تۆ و لە خۆیشمان دەکەین. دەی، تەوەکەل بە خوا، سەرێکە هێناومانە و نابێینە دواوە با ئەم سەرچڵییەیش بکەین. بە ڕاستی چوونەکەی هەولێرم تەنیا بۆ ئەوە بوو چاوم بە مامۆستا خەزنەدار بکەوێت. بیستبووم کە لەو هەموو بەزم و هەرای ڕەوکردن و ڕووکردنە ئێرانەدا، نە شاری بە جێ هێشتبوو، نە ماڵەکەی خۆی.

بەیانیی ڕۆژی داهاتوو کەوتینە ڕێ. لە ڕێگا لە بازگەیەکی عیراقی ڕایانگرتین. وتیان بۆ کوێ دەچن؟ گوتمان دەچین بۆ هەولێر. هەر وا خێرا تەماشایەکی سەر و گوێلاکمانیان کرد و گوتیان فەرموون بڕۆن. ئەوە یەکەم جار بوو دوای شانزدە ساڵ چاوم بە سەربازی عیراقی و بازگەی عیراقی دەکەوت. لە هەولێر، لەناو شەقامەکاندا چاومان بە هەندێک سەرباز کەوت، بەلام کەس خۆی تێنەگەیاندین. لە یەک دوو شوێن ڕاوەستاین و دابەزیین و بە دەم گەڕانیشەوە پرسیاری ماڵی مامۆستا خەزنەدارمان دەکرد. لەناو ئەوانەدا کە قسەمان لەگەڵ کردن، لاوێکی باریکەڵەی باڵابەرز، هاتە پێشەوە و بە چپە لێی پرسیم: تۆ فلانکەس نیت؟ گوتم، ئەرێ وەڵا، هەوم. خۆی پێ ناساندم، وتی ناوم سابیر ڕەشیدە و چیرۆکنووسم. دیار بوو نووسین و بەرهەم و وێنەمی پێشتر بینیبوو، بۆیە منی ناسییەوە. ئەگەرنا کاتێک من کوردستانم بە جێ هێشتبوو، ئەو لە سەرەتای لاوێتیدا بووە، نەک نووسەر، باوەڕ ناکەم خوێنەرێکی

جیددییش بوو بێت. خۆشبەختانە ئێستایش ئاشنایەتی و دۆستایەتیمان هەر هەیە و بەردەوامە. دوای پرسیار کردن، ناونیشانی ماڵی مامۆستا خەزنەداریان بۆ هەڵداین. هەر زوو دۆزیمانەوە. مامۆستا خۆی دەرگای کردەوە. بە چاوپێکەوتنی من، هەر زۆر دڵخۆش بوو. پێی سەیر بوو چۆن گەیشتوومەتە ئەوێ؟ قسە و باس زۆر بوون و کاتیش کەم. ئێمە دەبوو بگەڕێینەوە بۆ شەقلاوە. ئەو نیوەڕۆیە لای ئەوان نانمان خوارد. دوڵمەیان لێ نابوو. درەنگانی بە ڕێگەکەی خۆماندا گەڕاینەوە.

لە یەک دوو ساڵی داهاتوودا، هەڵبژاردن لە کوردستاندا کرا بۆ دروستکردنی پارلەمان و حوکمەتی هەرێم ڕاگەیێنرا و وردە وردە ڕێگا کرایەوە بۆ سەردانەوەی کوردستان، لە تورکیا، ئێران یا سووریاوە. هەمووی دوو یا سێ ساڵی پێ چووبوو، کە شێرپەنجەکەی سیاسەتی کورد (شەڕی براکوژی)، دیسان سەری هەڵدایەوە. دەنگوباسی گەندەڵی و دزی و تاڵان و بەرتیلخۆری و چاوپۆشی لە کونەجاش و کۆنەبەعسی و شەرەدەنووک و پاوانخوازیی نێوان دوو زلهێزەکەی کوردستان، پارتی و یەکێتی، گرنگترین هەواڵی کوردستان بوون.

لە گۆڤاری مامۆستای کورددا چەند لاپەڕەیەکمان تەرخان کردبوو بۆ ئەو نامانەی لە کوردستانەوە دەهاتن و ئەو جۆرە دەنگوباسانەیان تێدا بوون. زۆر لە نووسەران و دۆست و ئاشنایان بەردەوام نامەیان بۆ دەناردین. خۆشبەختانە جاروبار هەندێک لە ژمارەکانی گۆڤارەکە دەگەیشتەوە کوردستان. مامۆستا خەزنەدار بە گەرمی پشتیوانیی دەکرد و بابەت و هەواڵ و نووسینی بۆ دەناردین.

هەر کەسێکی دەست بکەوتایە، بهاتایە بۆ سوید، نامەی پێدا بۆ دەناردم. هەر لەو ماوەیەدا نامیلکەیەکی پۆشکینی لە ڕووسییەوە کردبووە کوردی، گەشتێک بۆ ئەرزەڕووم، بۆی ناردم و منیش چاپم کرد. کە ساڵی ١٩٩٦ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری [مامۆستای کورد]م ڕاگرت یەکجار زۆری پێ ناخۆش بوو. زۆریش هەوڵی لەگەڵ دام بڕیارەکە هەڵوەشێنمەوە و دەستی پێ بکەمەوە، بەڵام من تازە بڕیاری خۆم دابوو.

من، بە هیچ جۆرێک دڵم بە هەلومەرجی کوردستان خۆش نەبوو. دەمزانی ئەم جۆرە سیاسەتکردن و بەڕێوەبردنە سەری کورد و مەسەلەکەیشی دەدا بە فەتارەتدا. هەر ئەو ماوەیە دوو سێ جارێک نامەم بۆ جەنابی سەرۆک بارزانی نارد و ئەویش وەڵامی دەدامەوە. زۆرم حەز دەکرد سەری کوردستان بدەمەوە، بەڵام منێکی دوور لە سیاسەت و سیاسەتبازییەوە، نەمدەویست لایەنێک سەردانەکەم بۆ بەرژەوەندیی خۆی و دژی لایەنەکەی دیکە بە کار بهێنێت.

هاوینی ساڵی ١٩٩٨ بوو، کاک هەڵۆ بەرزنجەیی و کاک ئەکرەم خامۆش ئاگاداریان کردم کە مامۆستا خەزنەدار دێت بۆ بەرلین و ماوەیەک لەوێ دەمێنێتەوە. بڕیارم دا بچم بۆ لای. خۆیشی کە گەیشتە بەرلین تەلەفونی بۆ کردم. ڕۆژی ٢٦-٦-١٩٩٨، چووم بۆ بەرلین و سێ چوار ڕۆژێک لەوێ مامەوە. ڕۆژێک هەر هەردووومان پێکەوە چووین بۆ ناو شار. قاوەخانەیەکی جوان و خۆش هەبوو، چووین تاوێک لەوێ دانیشتین، دواتر خۆمان کرد بە چەند بازاڕ و کۆگای جۆراوجۆردا. لە دوکانێکی بچکۆلە چاوی بە هەندێک وازیچە کەوت، کە ئاژەڵی جوان بوون، وتی زۆر جار لەم شتانە دەکڕم و لەناو کتێبخانەکەمدا دایاندەنێم. ئەو خۆی چەند دانەیەکی هەڵبژارد، بەڵام من کڕیمن و وەک دیاری پێشکەشیم کردن.

هەر لەو ڕۆژانەدا، تەلەفونی شاعیر و ڕۆماننووسی ناوداری عیراقی (فاضل عەززاوی)م کرد و وتم پێم خۆشە چاومان بە یەکدی بکەوێت. عەززاویم تەنیا یەک جار، ساڵی ١٩٧١ لە بەغدا بینیبوو. لەو ساڵانەدا، بە تایبەت دوای ڕووخانی ڕژێمی ئاڵمانیای ڕۆژهەڵات (ئەو لەوێ دەژیا) و یەکگرتنەوەی هەردوو بەشەکە، یەک دوو جارێک بە تەلەفون قسەمان کردبوو. ئێوارەیەک لەگەڵ مامۆستا خەزنەدار و کاک هەڵۆدا لەو کات و جێیەی دیاریمان کردبوون، لە قاوەخانەیەک چاومان بە

عەززاوی کەوت. هەندێک لە کتێبەکانی خۆی بۆ هێنابووین. دانیشتنێکی فەرهەنگی و ئەدەبیی خۆش بوو. بە عەرەبی قسەمان دەکرد. عەززاوی کەرکووکییە. وتم پێم وایە تۆ کوردی دەزانیت. گوتی تێدەگەم، بەلام ئێستا ناتوانم قسەی پێ بکەم.

لە دوایین مانگەکانی ساڵی ١٩٩٩دا، کە بەرەو ساڵێکی تازە و سەدەیەکی تازە و هەزارەیەکی تازە دەڕۆیشتین، پرسم بە هەندێک لە دۆستانم کرد؛ مامۆستا خەزنەدار، مامۆستا شوکر مستەفا، کاک سەرۆ قادر. هەموو پێیان باش بوو سەر بدەمەوە و ئەوەیان جەخت کرد کە هەلومەرجی کوردستان لە جاران هێورترە و بەرەو باشی دەڕوات. ناوی خوامان لێ هێنا و بە ماڵ و منالەوە، چەند ڕۆژێک پێش ساڵ و سەدە و هەزارەی تازە (٢٠٠٠)، ڕوومان کردە کوردستان. لە ڕێگەی تورکیاوە ڕۆیشتین. فڕۆکە تا ئیستانبووڵ هەبوو. لەوێوە بە ئاوتۆبووس چووینە دیاربەکر، ئەوجا سنووری کوردستان-دهۆک-هەولێر. لەم سەردانەی ئەم جارەدا چەند جارێک چاوم بە مامۆستا خەزنەدار کەوت، ئەو دەهات بۆ لامان لە هۆتێل و لە هەموو سەمینارەکاندا ئامادە دەبوو، ئێمەیش لە ماڵی خۆیان سەرمان لێ دا. ئەمە هەلێکی باش بوو کە لەگەڵ مامۆستا بە دوورودرێژی لە زۆربەی بابەتەکانی ئەدەب و زمان و فکر بدوێین.

لەو ماوەیەدا سەرم لە چەند دەستگایەکی زانستی دا. لە بەشی ئینگلیزیی زانکۆی سەلاحەددین، سەمینارێکیان بۆ دانابووم. کە چووم، مامۆستا خەزنەدار و بەشێکی زۆری مامۆستاکان چاوەڕێ بوون. دوای دانیشتنێکی کورت، وتیان فەرموون با بچین بۆ هۆڵی سەمینار. کە لە دەرگای سەرەکی دەچووینە دەرەوە، هەموو فەرموو فەرموویان لێ کردم کە من لە پێشەوە بڕۆم. ئێ من چۆن شتی وا دەکەم؟ ئەمە تۆزێک کاتی خایاند. منیش مامۆستا خەزنەدارم خستە پێش خۆمەوە. کە چووینە دەرەوە، مامۆستا ڕووی کردە هەموویان و وتی: من پێم نەگوتن؟ من دەزانم ئەو ناکەوێتە پێش من. دیار بوو پێش گەیشتنم باسی منی بۆ کردبوون.

ئەو ساڵانەی لە بەشی کوردیی زانکۆی بەغدا دەمانخوێند، هەموو دەمانزانی مامۆستاکانمان لەناو خۆیاندا زۆر کۆک نین. بۆ نموونە مامۆستایان خەزنەدار و دۆکتۆر عیززەددین مستەفا ڕەسووڵ لەگەڵ یەکدی ناکۆک بوون. ئێمەی خوێندکار کارمان بەوە نەبوو، نەدەبووینە لایەنگری ئەم یا ئەو، بەلام ئەوان ئەوەیان پێ نەدەشێردرایەوە. کە هاوینی ١٩٩١، وەک باسم کرد، چوومە سەردانی مامۆستا مارف، هەواڵی دۆکتۆر عیززەددینیشم پرسی، وتی هیچ ئاگام لێ نییە، پێوەندیم لەگەڵی نییە. ئیدی زانیم کار لە کار ترازاوە.

شێوە و ناوەڕۆکی پێوەندیی کەسەکان لە کۆمەڵگای کوردەواریدا، ڕەنگە لە زۆر جێگای دیکەیش وا بێت، کەمتر لەسەر بنەمای ئاوەزکارانە (عەقڵانی) ڕۆ دەنرێت. لە پلەی یەکەمدا هەستی زووتێپەڕ و هەڵچووی تاک دەبێتە هۆی گووڕانی. لەناو ئەو مامۆستایانەدا کە لە سۆڤییت خوێندبوویان، دوویان بە ئاشکرا دژی مارکسیزم و سیستەمی سۆڤییتی بوون و نەکەوتبوونە ژێر کارکردی پڕۆپاگاندەی حیزبە کۆمونیستەکانەوە؛ خەزنەدار و کاووس قەفتان. مامۆستا قەفتان ئەمەی بە ئاشکرا لای من باس دەکرد. هۆیەکی ئەو ناکۆکییەی خەزنەدار و عیززەددین ڕەنگە هەڵوێستی ئیدیۆلۆگی بووبێت، بەلام ڕەوشت و هەڵوێست و هەڵسوکەوتیش نەخشی خۆیان هەبوو. خەزنەدار نیشتمان و نەتەوەپەروەر بوو. تا ڕادەیەکی زۆر خۆی بۆ لێکۆڵینەوە و کاری زانستی تەرخان کردبوو. لە سیاسەتی حیزبی و ڕۆژانەوە دوور بوو.

ئێمە ئەگەر بیر لە هەڵوێستی ئاوەزکارانە بکەینەوە، دەبوو کەسێکی وەک خەزنەدار یا جەمال نەبەز لە کەسێکی وەک مامۆستا مەسعوود محەمەدەوە نزیک ببوونایە، چونکە هەرسێیان خۆیان بە نەتەوەپەروەر دەزانی. کەچی ئەو دووە مامۆستا مەسعوودیان خۆش نەدەویست. گوێم لێ نەبووە خەزنەدار، بە چاک یا بە خراپ، باسی مەسعوود محەمەد بکات. بەلام جارێکیان لەگەڵ مامۆستا نەبەز لە ژووری کارکردنەکەی خۆی لە زانکۆی ئازادی بەرلین دانیشتبووین، باسی زمانی کوردی و زمانزانی کوردمان دەکرد. من بە خۆشەویستی و ڕێزەوە باسی مامۆستا مەسعوودم دەکرد، کەچی نەبەز گوتی "مەلا مەسعوود عەرەبییەکی



باش دەزانێت". زۆر سەیرە، بتوانیت هەموو بەهرە و گەورەیی و کەسایەتی و زانیاریی مەسعوود محەمەد لە ڕستەیەکی وەهادا کورت بکەیتەوە. یادی هەرسێیان بە خێر.

سەرەتای ساڵی ٢٠٠٦، لە شاری دیاربەکری کوردستانی باکوور، کۆنفرانسێکی فەرهەنگییان ڕێک خستبوو، منیش بانگ کرابووم و یەکەم کەسیش بووم کە لێکۆڵینەوەکەم پێشکەش کرد. جا ڕۆژی یەکەم کە دەبوو کۆنفرانس دەست پێ بکات. مامۆستا خەزنەدار کە گەیشتبووە بەر دەرگای هۆڵەکە و بینیبووی مامۆستا عیززەددین یەکێکە لەوانەی دانیشتنەکە دەبەن بە ڕێوە، گەڕابووە دواوە و لە دەرەوە لەسەر تەختێک دانیشتبوو. دیاربوو ڕێکخەرانی کۆنفرانس زۆریان هەوڵ لەگەڵ دابوو کە بێتە ژوورەوە، سوودی نەبوو. نازانم کێ پێی وتبوون: بە خوا مەگەر تەنیا فلان کەس [مەبەستیان من بوو] بتوانێت کاری تێ بکات. هاتن، وتیان پیاوی چاک بە، هەوڵێک بدە! کۆنفرانسیان ڕاگرتبوو تا ئەم کێشەیە چارەسەر بکرێت. چووم بۆ لای مامۆستا خەزنەدار و لە تەنیشتیەوە دانیشتم. وردە وردە کەوتمە دواندنی. تێگەیشتم کە تا [بە قەولی مامۆستا] ئەو کابرایە لەوێ دانیشتبێت، ئەم نایێتە ژوورەوە. لەگەڵ ڕێکخەراندا قسەم کرد و ئەوانیش داوایان لە مامۆستا عیززەددین کرد کە لە گرۆی بەڕێوەبردنەکەدا بەشدار نەبێت. دیسان چوومەوە بۆ لای خەزنەدار و ئەم جارە هەردووومان پێکەوە هاتینە ژوورەوە. ئەوجا با ئەوەیشی بخەمە سەر، کە ئەو کاتە من خۆیشم لەگەڵ مامۆستا عیززەددیندا نێوانمان خۆش نەبوو، دوو سێ ساڵێک بوو هەموو پێوەندییەکانمان هەڵوەشاندبوونەوە.

نازانم دوای ئەو کۆنفرانسە چەند جاری دیکە چاوم بە مامۆستا خەزنەدار کەوتەوە؟ هەر کاتێک سەری کوردستانم دابێتەوە و ڕێم کەوتبێتە هەولێر سەرم لێ داوە. هەر کاتێکیش بۆ ئەو یا بۆ من گونجابێت، نامەمان بۆ یەکدی دەنووسی.

پاییزی ساڵی ٢٠١٠، بەیانییەکی زوو بوو، لە تۆڕی ئینتەرنێتەوە تەماشای ڕۆژنامەکانی کوردستانم دەکرد، لە لاپەڕەی یەکەمی یەکێک لە ڕۆژنامەکاندا، لە سەری سەرەوە، دەستەڕاست، وێنەیەکی مامۆستا خەزنەدار لە چوارچێوەیەکی ڕەشدا دانرابوو. تێگەیشتم کە خەزنەدار کۆچی کردووە. هەواڵەکەم هێندە لا گران بوو، نەمدەویست بیخوێنمەوە. سەرم دانەواند و تەماشای مێزەکەی بەردەمی خۆمم دەکرد. بیرم لە مرۆڤێک، پیاوێک، زانایەک و مامۆستایەک دەکردەوە کە لەپاڵ هەموو خۆشەویستی و حەز و ئارەزۆکانیدا، عیشقێکی گەورە و پیرۆز سەرتاپێی بیر و ژیان و هەبوونی داگیر و ڕەنگڕێژ کردبوو، عیشقی نەتەوە و نیشتمانێک، عیشقی فەرهەنگ و زمان و ئەدەبیاتی ئەو نەتەوەیە و عیشقی خاک و شاخ و ئاو و دار و بەردی ئەو نیشتمانە.

**ئوپسالا، سوێد، ٧-١١-٢٠٢٣**

# کوردەواری بەدەم گۆڕانەوە
# لە گێڕانەوەی (خەزنەدار)دا

حەمەسەعید حەسەن



د. مارف خەزنەدار (١٩٣٠ - ٢٠١٠) لە بواری چیرۆکدا سێ کتێبی بڵاو کردووەتەوە: ئەڵەمان کوردی (١٩٦٩ بەغدا)(١) کە بریتییە لە حەڤدە کورتەچیرۆک، لە نێوان ساڵانی ١٩٦٠ و ١٩٦٨دا نووسیونی. بووکەشووشە (١٩٦٩ بەغدا)(٢) درێژترین کورتەچیرۆکی نووسەرە، بەهاری ١٩٦٤ لە لینینگراد نووسیویەتی و بەرەو ڕۆژ (٢٠٠٦ سلێمانی)(٣) کە پێک هاتووە لە کۆچیرۆکی ئەڵەمان کوردی، بووکەشووشە و شازدە چیرۆکی دیکە کە یەکێکیان: (لە پێناوی دڵپاکیدا) ١٩٥٢ نووسراوە(*) و ئەوانی دیکەیان لە نێوان ساڵانی ١٩٦٥ و ١٩٨٤دا نووسراون. چونکە لە سەرەتای (بەرەو ڕۆژ)دا دەڵێت: (ئەم چیرۆکانە بەشی زۆری بەرهەمی لەم بابەتەمن،) کەواتە هەمووی نین و بێجگە لەم سی و چوار چیرۆکە، هی دیکەیشی هەیە.(**)

د. مارف خەزنەدار هەر لە ئایاری (١٩٦٠)ەوە تا دیسەمبەری ١٩٨٤ کە دەکاتە چارەکە سەدەیەک، بە هەمان شێواز و تەکنیکگەڵ نووسیویەتی و هێندە ڕاستگۆیانە تاکی کورد و کۆمەڵی کوردەواریی بەسەر کردووەتەوە، دەکرێت وەک بەڵگەنامەی کۆمەلایەتی سەرنجی چیرۆکەکانی بدرێت و هەندێک جار هێندەی چیرۆک بوار بدات، کەڵکی لە دیرۆکیش وەرگرتووە. ئەوەیش بۆ خۆی جێی سەرنجە، هەرچەندە د. مارف زۆربەی چیرۆکەکانی لە هەندەران نووسیون، وەلێ شوێنی ڕووداوەکان کوردستانە، ئەم تێبینییە هەر دوو چیرۆکی (بووکەشووشە) و (ئێوە قارەمانن) ناگرێتەوە، کە لە یەکەمیاندا شوێن (لینینگراد)ی بە سوپای هیتلەر گەمارۆدراوە و لە دووەمیشیاندا هەرچەندە شوێن هەر ڕووسیایە، وەلێ بیری گێڕەرەوە کە خودی نووسەرە، هەر لە کوردستانە. ئێوە قارەمانن، ناوەرۆکێکی هێندە ئینساندۆستانەی دەوڵەمەندی هەیە، شیاوی ئەوەیە وەک نموونەی چیرۆکی کوردی، بە گەلان بناسێنرێت.

ئەوە زادەی تامەزرۆیی بووە بۆ نیشتمان کە چیرۆکەکان لە غەریبی نووسراون و باسی زێدی نووسەر دەکەن. ئەوە وەک ڕێسا وایە، نووسەر کە هەست بە نامۆیی دەکات، دووچاری گرژییەکی دەروونی دەبێت و بۆ ڕەواندنەوەی گرژییەکە، غەیری نووسین هیچ توایەکی دیکەی پێ شک نایەت، هانای بۆ ببات. تۆماس مان دەڵێت: (ئەگەر ڕووداوێک لای کەم پێنج ساڵی بە سەردا تێنەپەڕیبێت، مەیکە بە بابەتی چیرۆک! چونکە خەڵکی وا ڕاهاتوون کە باسی ئێستایان بۆ بکەیت، بڕوات پێ ناکەن.) ڕەنگە د. مارف وێڕای نۆستالژیا بۆ وڵات، ئەو مۆچیارییەی تۆماس مانیشی ڕەچاو کردبێت. ئەمانە بێجگە لەوەی تاراوگە وێستگەیەکی بەپیتە بۆ داهێنان، ئاخر هەمیشە سەفەر ئاسۆی دیتنمان بەرینتر و ڕوونتر دەکات. ئاخۆ د. مارف بەر لەوەی دەست بداتە نووسینی کورتەچیرۆک، هیچی لە بارەی تەکنیکی نووسینی ئەو ژانرە ئەدەبییەوە، خوێندووەتەوە؟ پێ دەچێت ئەویش وەک یوسف ئیدریس، پشتی هەر بە سەلیقەی خۆی قایم بووبێت و وای بۆ چووبێت کە شارەزایی لە بواری تیۆریدا، نابێتە هەوێنی لە دایکبوونی داهێنەر.(٤)

شێوازی چنینی چیرۆک لای د. خەزنەدار، بە گشتی لە (سەرەتا، گرێ و کۆتایی)دا، بەو شێوەیەی بە دوای یەکدا دێن، خۆی دەبینێتەوە، نە کات پاش و پێش دەخات، نە یاری بە شوێن دەکات. ئەم سەرنجە بۆ (پێشوازیی خاوەنشکۆ) دروست نییە، ئاخر لەو چیرۆکەدا، لە ناوەڕاستی ڕووداوەکەوە، دەست بە گێڕانەوە دەکات. د. مارف چیرۆک بەو شێوازە دەنووسێت کە تێیدا گێڕانەوە، سنووری لۆگیک نابەزێنێت، لای ئەو چیرۆک زادەی واقیعە، ئەفسانەی تێکەڵ نابێت. نزیکەی هەمیشە گێڕەرەوە، چیرۆکبێژی هەمووشتزانە، کەسی یەکەمی بگۆیە و کارەکتەرە سەرەکییەکەی چیرۆکەکەیە. تەکنیکی (مۆنۆلۆگ)یشی بەکار هێناوە، وەلێ نەک بەو جۆرەی لە چیرۆکی شەپۆلی هۆشدا باوە، ئاخر لە مۆنۆلۆگی ناوەکیدا کە تەکنیکی زاڵی چیرۆکی شەپۆلی هۆشە،

ەسی سێیەم لە نێوان گێڕەرەوە و وەرگردا نییە، بۆیە ئەو ۆرە گێڕانەوەیە چونکە لە ناخی کارەکتەرەوە خۆڕسکانە ەڵدەقوڵێت، زێتر جێی متمانەی خوێنەرە.

ەگەر چیرۆک دوو جۆری هەبێت، یەکێکیان وەک ئەوانەی ی دی مۆپاسان کە بە خاڵێک کۆتاییان دەهات و ئەوەی ریان وەک چیرۆکەکانی چیخۆف کە کۆتاییەکی کراوەیان ەبوو، ئەوا نزیکەی هەموو کارەکانی د. خەزنەدار سەر بە جۆری یەکەمیانە. گێڕانەوە لەکن ئەو، پشت بە بیۆگرافیای نووسەر دەبەستێت. بەرهەمەکانی بازنەی ڕیالیزم جێ ناهێڵن، ئیدی هەر لە ڕیالیزمی بێ کەنارەوە، تا ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە و تەنانەت شۆڕشگێڕانەیش. لە فۆرمێکی هونەریدا، بایەخ بە چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و چینایەتی دەدات، خەباتی جووتیاران و کرێکاران بە هێند وەردەگرێت و بە گژ دابونەریتی نامرۆڤانەدا دەچێتەوە.

لە چیرۆکی د. مارفدا، گرژییەک هەیە کە ئێمەی خوێنەر بە نیگەرانی ڕادەگرێت و ناچارمان دەکات، دوای ڕووداوەکە بکەوین، تا بزانین بە کوێ دەگات. لە چیرۆکی ئەودا لە دەنگی گێڕەرەوەدا، هۆشیارییەکی چڕ هەیە کە باس لە تەنیایی ئینسان دەکات. کێ لەو کیژۆڵەیە تەنیاترە کە گوندەکەیان کاول دەکرێت و کەسوکاری دەکوژرێن؟ کێ لە ئەڵەمان کوردی تەنیاترە کە لە وڵاتێکی دواکەوتووی ژێردەستەدا، ئازار بە ئاوەزی گەییشتووە؟ کێ لەوانە تەنیاترە کە لە سایەی جەنگدا لە برساندا دەمرن؟ کێ لە قارەمانەکانی چیخۆف تەنیاترە؟ ببوورن گوتم قارەمان! یەکێک لە مەرجەکانی کورتەچیرۆکی سەرکەوتوو، ئەوەیە (قارەمان)ی تێدا نەبێت، ئەوە نییە لای مۆپاسان، ژنێک کە لە ناچارییەوە سێکس دەفرۆشێت، لای تورگنێڤ، کۆیلە، لای چیخۆف، کارمەندێکی هەژار، دەمرێت و کەسێکی دەست ناکەوێت، ڕازی خۆی بۆ بدرکێنێت و لای د. مارفیش، قوتابییەکی کڵۆڵە، لەبەر دەستی بەڕێوەبەرێکی دڵڕەقدا؟(٥)

چیرۆکی کورت هەیە، هەر لەو شیعرە ناسکانە دەچێت کە دەکەونە خانەی لیریکەوە و هیچ دەستتێوەردانێکیان پێوە دیار نییە، هەیە لە سەرگوتاری ئۆرگانی حیزبێکی نەریتخوازەوە نزیکترە وەک لە ئەدەب. بەرهەمی د. مارف نە لەمیان دەچێت و نە لەویان، ئاخر ئەو هەم ئازادی بە کارەکتەرەکانی دەبەخشێت و هەم پلانیش بۆ بونیاد و ڕەوتی کورتەچیرۆکەکانی دادەڕێژێت. چیرۆکنووس هەیە کە دەست بە نووسین دەکات، دەگاتە جێیەک بۆ خۆیشی سەرپرایزە، هەیشە پێشەکی چوارچێوەی تەلاری چیرۆکەکەی ڕۆ ناوە، تووشی میوانی ناوەخت و ڕووداوی لەناکاو نابێت. لە نێوان ئەم دوو شێوازی نووسینەدا، د. مارف لە دووەمیانەوە نزیکترە.

شوێن لای د. خەزنەدار جێگەی بایەخە، بەڵام شوێن بە مانای شاری جەنجاڵ و باڵاخانەی بەرز نا، بەو مانایەی کە لە دیرۆکێکی تژی لە ململانێ و ڕەسەنایەتی پێک هاتووە. لە چیرۆکدا گرنگ ئەوە نییە، ئەوەی باسی دەکەین، ڕووپەلێک بێت لە دیرۆک، گرنگ ئەوەیە لە ڕووداو بچێت. د. مارف نە ڕووداوی ڕاستەقینە دەنووسێتەوە، نە مێژوو تۆمار دەکات، بەڵکوو ئیلهامیان لێ وەردەگرێت و دەیانکاتە پاڵپشت بۆ چیرۆکەکانی. گێڕانەوەی دیرۆک لای د. مارف زانست نییە، هونەرە، هونەر بەو مانایەی کاتێک سەرگەرمی گێڕانەوەی ڕووداوێکی مێژووییە، کارەکتەرەکانی زادەی خەیاڵن، وەک لە (بووکەشووشە)دا هەستی پێ دەکەین و پێ دەچێت لەو بوارەدا، سوودیشی لە ئەزموونی (واڵتەر سکۆت)ی ئینگلیز و (ئەلیکسەندەر دۆماس)ی فەرەنسایی وەرگرتبێت. ڕەسەنایەتییش لەکن ئەو، زادەی بەسەرکردنەوەیەکی ڕاستگۆیانەی کولتووری کوردەوارییە، بە لایەنە تاریک و ڕۆشنەکانییەوە. لە چیرۆکیدا (سەفەر)یش ئامادەییەکی زۆری هەیە، ئیدی سەفەری جووتیارێک بێت، لە گوندێکەوە بۆ شار، وەک لە (دەروێش کاکەڵڵا)دا وێنەی کێشاوە، یان هی تێکۆشەرێک بێت، لە بەغداوە بێت بۆ هەولێر، وەک لە (سەرینەبۆر)دا تۆماری کردووە، یان هی خوێندکارێک بێت لە بەرلینەوە بۆ مۆسکۆ، وەک لە (ئێوە قارەمانن)دا ژیانی پێ بەخشیوە.



له (بووکەشووشە)دا، دوو چیرۆکبێژ هەن: خودی نووسەر کە پشتی بە بیۆگرافیای خۆی بەستووە و کچەی هاوڕێشی کە بیرەوەرییە تاڵەکانی سەروەختی دووەمین جەنگی دنیاگرەوەی خۆی دەگێڕێتەوە. ڕۆمانی کورت لە بیست هەزار وشەیەک پێک دێت، بووکەشووشە کە درێژترین چیرۆکی د. مارفە، وەک قەوارە هێندە نییە کە بە ڕۆمانێکی کورتی لە قەڵەمی بدەین. جیاوازییەکی دیکەی نێوان چیرۆکی کورت و کورتەڕۆمان ئەوەیە، یەکەمیان باسی (ئەزموون) ێک و دووەمیان باسی (ئەزمە)یەک(***) دەکات، بووکەشووشە بەم پێوانەیەیش، چونکە باسی ئەزموونی منداڵێکی لە ترسی جەنگ هەڵاتوو دەکات، هەر دەکەوێتە خانەی کورتەچیرۆکەوە. (پیرەمێرد و زەریا)ی ئەرنست هەمەنگوای، لەسەر ئاستی دنیا، یەکێکە لە کورتەڕۆمانە هەر بەناوبانگەکان. کورتەڕۆمان چونکە سوود لە ڕەگەزەکانی کورتەچیرۆک و ڕۆمانیش وەردەگرێت، بۆیە خاوەنی جۆرە شیعرییبوونێکی تایبەت بە خۆیەتی.

بەشێکی گرنگ لە چیرۆکەکانی د. مارف بە هەق نموونەی جوانی (ئەدەبی بەرەنگاربوونەوە)ن، وەک: بۆمبا و قوتابخانە، تفەنگ و دەمانچەی شکاو. لە یەکەمیاندا گوندێکی کوردستان خاپوور دەکرێت و خەڵکەکەی دەکوژرێن. لە دووەمیاندا سەروەختی شۆڕشە، بۆ پێشمەرگەی ماسی، هەم دێهات و هەم شار، ڕۆڵی ئاو دەبینن. لایەنی هەرە جوانی ئەو دوو چیرۆکە ئەوەیە، چیرۆکنووسی دووره‌وه‌ته‌ن، هێندە بە سەر بابەتەکەیدا زاڵە، هەر دەڵێیت، لەناو ڕووداوەکانی شۆڕشدا ژیاوە و کەسێکی وریا کە بە درێژایی شۆڕشی ئەیلوول پێشمەرگە بووبێت، غەفڵەتێک لەو دوو چیرۆکەدا نابینێتەوە.

خەو بەوەوە دەبینێت، زانکۆ لە شارەکانی کوردستاندا هەبێت و لەژێر گوشاردا زانکۆی بەغدا جێ دەهێڵێت و دەبێت بە پێشمەرگە. لەم چیرۆکەدا بۆ ڕستەی شیعری بگەڕێین نائومێد نابین: (زێی گەورە لەبەر تیشکی زەردەی خۆرئاوادا، وەکوو زنجیری زێڕ لەناو تەمومژدا دەلەرییەوە.)(****) نێرگزفرۆش، وێڕای ئەوەی جیاوازیی چینایەتی فەرامۆش ناکات، چیرۆکێکە سەر بە ئەدەبی بەرگری، پشتی بە دیرۆک قایمە و دەمانباتەوە بۆ کن بەردەقارەمان کە سیمبۆلێکە بۆ بەرەنگاربوونەوە. (*****) لە چیرۆکی (ئەمەیە ئەنجامی تاوانبار)دا، بۆ چاوترساندنی خەڵک لە ناوەندی شاردا، تەرمی سێ پێشمەرگە فڕێ دەدرێت. ئەوە جێی سەرنجە هەموو ئەو چیرۆکانەی سەر بە ئەدەبی بەرگریین، لەدوورەوڵاتی، لە ناوەڕاستی ساڵانی شەستی، سەدەی ڕابردوودا نووسراون.

ڕەنگە هەڵە نەبم، ئەگەر بڵێم کورتەچیرۆکنووس هاوزەمان پێویستە شاعیریش بێت، ئاخر پێویستی بەوەیە توانای ڕاوکردنی چرکەساتە تیژتێپەڕەکانی هەبێت، کورتبڕییەکی چڕ ڕەچاو بکات و تاقە وشەیەک بە خەسار نەدات. بووکەشووشە یەکێکە لەو چیرۆکانەی د. مارف کە تێیدا هەست بە هەبوونی زمانێکی شیعری دەکەین: (شەپۆلی قژی درێژ لەسەر سینگە نەرمونۆڵەکەی شڵپوهوڕی بوو.) یان: (دڵۆپە وردەکانی ئارەقە، بە شەوقی چراکە وەکوو مرواری دەدرەوشانەوە.) نەک لە کورتەچیرۆک تەنانەت لە ڕۆمانی کورتیشدا، بە دەگمەن تووشی ڕستەیەک دێین، بە درێژایی تەمەنمان لە هەواری بیرەوەریماندا بمێنێتەوە، ڕستەیەکی جوانی لە چەشنی ئەمەی دۆکتور مارف لەسەر زاری کچەی قارەمانی بووکەشووشەوە دەڵێت: (ئەگەر بە منداڵی مەشقی ڕۆیشتن نەکەین، ڕەنگە بە درێژایی ژیانمان فێری ڕۆیشتن نەبین.) بووکەشووشە یەکێکە لەو چیرۆکە دەگمەنانەی کە دەیخوێنینەوە، بە جۆرێک دیلمان دەکات، بە تەواوبوونی هەست بە نیگەرانی دەکەین و پێمان خۆشە هەر درێژەی هەبێت.

له (خەنجەر و قەڵەم کامەیان؟)دا، خوێندکارێکی کورد

د. مارف لە بازنەی گوند و پێوەندییە فیوداڵییەکاندا گیری

نەخواردووە، چیرۆکی هێناوەتە ناو جەرگەی شارەوە و خەباتی نهێنیی تێکۆشەران و خۆپیشاندانی خەڵکی داوەتە بەر ڕووناکی. کارەکتەر لای ئەو هەر پۆزەتیف نییە، ڕێ دەکەوێت تەنانەت کەسانی خۆفرۆشیش بن، چیرۆکی (ئیشەکە ناکا) کۆتاییەکی سەرنجراکێشی هەیە، کاتێک پۆلیسێک هەست بە ئازاری ویژدان دەکات و بڕیار دەدات، دەستبەرداری ئیشەکەی ببێت. گۆڕانی کارەکتەر لای د. مارف، وەک هەڵتۆقینی قارچک لەناکاو ڕوو نادات، زەوینەی بۆ خۆش دەکرێت و جێی باوەڕی خوێنەرە، لە چیرۆکی ئەودا نە ڕێککەوت ڕۆڵی کاربڕ وازی دەکات، نە کۆتایی دەبێتە مایەی حەپەسانی خوێنەر. لە (دایکێتی)دا، ئایشەخانی قارەمانی چیرۆکەکە، دێتە خەوی چیرۆکنووسەکەوە، پێم وایە پێش د. مارف، هیچ چیرۆکنووسێکی دیکەی کورد، بیری لەوە نەکردووەتەوە کە دەکرێت قارەمانی چیرۆک هەست بکات غەدری لێ کراوە و خەو لە چیرۆکنووسەکە تاڵ بکات.

ئەوە جێی سەرنجە کە لای د. خەزنەدار گەلەک جار گێڕەرەوەی هەمووشتزان قوتابییەکی قۆناغی سەرەتاییە، کە خودی نووسەرە و سەرقاڵی نووسینەوەی بیرەوەرییەکانی خۆیەتی. کە شوێنی ڕووداو هەولێر دەبێت، کارەکتەرەکان بە دیالێکتی هەولێر دەپەیڤن، وەلێ گێڕانەوە بە کوردییە، نەک بە شێوەزاری ناوچەیەک. کارەکتەرگەلی چیرۆکەکانی د. مارف سەر بە زۆربەی چین و توێژەکانی کۆمەڵی کوردەوارین، ئیدی هەر لە ئاغا، مەلا، خەفیە، قوتابی، پێشمەرگە، خەباتگێڕی ناو شار، کارمەندی میری و دەرزۆزەکەرەوە تا بە چیرۆکنووسیش دەگات. گێڕەرەوە لە (دڵ و نەتەوە)دا کە کارەکتەری سەرەکیی چیرۆکەکەیشە، قوتابییەکی مێردمنداڵی هەولێرییە، دەکەوێتە داوی عیشقی کیژۆڵەیەکی قەڵاتییەوە و پشت بە بیۆگرافیا دەبەستێت و خەیاڵی شاعیرانەی نووسەر، بەرگێکی ڕۆمانتیکی بە بەر چیرۆکەکەدا کردووە. پێم وایە مەسەلەی هاتنەوەی بابی کیژۆڵەکە لە حەج، کە هێندە بایەخی پێ دراوە و وەک چیرۆکێک وایە لە ناو چیرۆکەکەدا، پاژنەی ئاخیلی ئەو چیرۆکە جوانەیە.

لە ساڵی ١٩٧٣دا، دڵشاد مەریوانی لە نامیلکەیەکی چل لاپەڕەیی قەوارە گچکەدا، کە ناوی لێ دەنێت: (پێشوازیی خاوەنشکۆ و دوو چیرۆکنووس،)(٦) هەڵسەنگاندنێک بۆ هەردوو چیرۆکی (پێشوازیی خاوەنشکۆ)ی دۆکتۆر مارف خەزنەدار و (پێشوازی)ی (مەحەممەد مەولوود مەم) دەکات، ئەو دوو چیرۆکە هەمان ڕووداو، سەردانی فەیسەڵی دووەمی پاشای عێراق بۆ هەولێر، بەسەر دەکەنەوە. هەڵسەنگاندنەکەی مەریوانی کە لە قازانجی چیرۆکەکەی خەزنەدار کۆتایی دێت، بریتییە لە هەندێک سەرنج و تێبینی سەرپێیی و ڕەنگە نەکەونە نێو خانەی ڕەخنەی ئەدەبییەوە. ئاخر ئەگەر پێمان وابێت، مێژووی ئەدەب، مێژووی فۆرمە ئەدەبییەکانە یان جیرار جێنییە گوتەنی: دیرۆکی ئەدەب ـ دیرۆکی کۆدە ئەدەبییەکانە، ئەوا دڵشاد نە باس لە فۆرمی ئەو دوو چیرۆکە دەکات، نە لە هەوڵی لێکدانەوەی هیچ کۆدێکدایە.






بە پێچەوانەی مەریوانییەوە کە بە چیرۆکێکی سەرکەوتووی لە قەڵەم داوە، پێشوازیی خاوەنشکۆ لەکن عەبدولسەمەد خانەقا (کارێکە هەڵگری گەلەک خەوشە و تژییە لە زێدەڕۆیی.) (٧) یەکێک لە خەوشەکانی ئەو چیرۆکە ڕەنگە ئەوە بێت کە زێدەڕۆیی لە خراپ نیشاندانی بەڕێوەبەری قوتابخانەکەدا کراوە، ئاخر وەک جەللادێکی سەردەمی بەعس، لەوانەی ئیشیان ئەشکەنجەدانی خەباتگێڕان بوو، وێنەی کێشراوە. یەکێک لە پەیامەکانی ئەو چیرۆکە لەوەدا چڕ دەبێتەوە کە: لە هەر شوێنێک مامۆستا لە قوتابی بدات، لەوێ شتێک نییە ناوی ئازادی یان دیموکراسی بێت. لایەنی هەرە جوانی ئەم چیرۆکە ئەوەیە، نووسەر هونەرمەندانە بە ناخی کارەکتەرە سەرەکییەکەیدا کە خودی چیرۆکبێژە و قوتابییەکی دوا ساڵی سەرەتاییە، ڕۆ چووە و لێ گەڕاوە خۆڕسکانە قسەی دڵی خۆی بکات.

(عومەر مەعرووف بەرزنجی) پێی وایە، چیرۆکەکانی دۆکتۆر مارف خەزنەدار

واقیعین، ژیانی چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری بەسەر دەکەنەوە و کەلەپووری نەتەوایەتی فەرامۆش ناکەن، وەلێ لە ڕوانگەی ئەو باسکارەوە، وەسفی درێژ، لایەنی لاوازی هەندێک لە چیرۆکەکانی خەزنەدارە، ئاخر چیرۆکی کورت لەبری وەسفی درێژ، با وەسفەکە هونەرمەندانەیش بێت، هاتا بۆ بە چڕی نووسین و کورتبڕی دەبات.(٨) خەوشی چیرۆکی دەروێش کاکەڵڵا لەکن بەرزنجی ئەوەیە، بە وەسفێکی درێژ دەست پێ دەکات، کەچی خانەقا هەمان چیرۆک بە نموونەیی لە قەڵەم دەدات و پێی وایە: (تابلۆیەکی هونەرییە و لەسەر عەرشی ڕەسەنایەتی ڕۆ نیشتووە.) لەو چیرۆکەدا کە نوستالژیایە بۆ ڕابردووی پاک و باسی پێوەندیی نێوان گوند و شار دەکات، د. مارف شارەزایانە ئاخی منداڵیشی خوێندووەتەوە.

لە ڕوانگەی (ڕەئووف حەسەن)ەوە زەمان لە چیرۆکی (دڵداری قەدەغە نییە)ی د. مارف خەزنەداردا، درێژە، ئەوەیش لەگەڵ هونەری کورتەچیرۆکدا ناتەبایە کە پێویستە ڕووداوەکانی وەختێکی کورتیان پێ بچێت.(٩) دەشێت جوانترین لایەنی هونەریی ئەو چیرۆکە، مەنەڵۆگەکەی کاکەسوور بێت، ئەو وەختەی چاوەڕێی عەیشان دەکات و دیالۆگەکانیش هێندە لێزانانە داڕێژراوان، ڕەنگە وشەیەکی زیادیان تێدا نەبێت و تەواو لە قسەی کارەکتەرەکانیش دەچن. د. خەزنەدار کارەکتەرەکانی ئەم چیرۆکەی لە گۆڕاندا وێنە کێشاوە، گۆڕانێک کە بە هۆی هەلومەرجی نوێوە دێتە ئاراوە و جێی بڕوای خوێنەرە. لە هەر چیرۆکێکی د. مارف ڕابمێنین، پەیامێکی پێیە و شتێکمان پێ دەڵێت، شتێک کە بە چیرۆک نەبێت، بە هیچ ڕێگەیەکی دیکە ناگوترێت، ئاخر (چیرۆک ئامرازێکە بۆ گوتنی ئەو شتانەی بە شێوازی تر نایەنە گوتن.) بیری د. مارف هێندە فراوان و ئاسۆی بەردەمی هێندە ڕوون بووە، توانیەیەتی کۆمەڵگەی کوردەواری بە دەم گۆڕان و گەشەکردنەوە، لە چیرۆکەکانیدا جێ بکاتەوە.

وەک عەبدولسەمەد خانەقایش ئاماژەی بۆ کردووە، ئەوە سەیر نییە کە خەڵکی ساکاری سەر بە گەلێکی بندەستی بێ دۆست، دوژمنی دوژمنیان بە دۆست بزانن.(١٠) بۆ ئەڵەمان کوردی کە کەسایەتییەکی ڕاستەقینەی نەک هەر ساویلکە، تەنانەت شێتۆکەیش بووە، ئاساییە لە دژی ئینگلیز، سەروەختی دووەمین جەنگی جیهانگرەوە، لایەنی ئەڵمانیا بگرێت. ئەڵەمان کوردی کە لە ئایاری ١٩٦٠دا نووسیویەتی و دەستپێکی چیرۆکی د. مارفە و هەمان ناوی لە یەکەمین کۆچیرۆکیشی ناوە، دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبووە. ئەو کارە هێندە هونەرییە، ڕەنگە ئەگەر بڵێم هەموو ڕەگەز و مەرجەکانی چیرۆکی سەرکەوتووی تێدایە و دەشێت بە مەبەستی فێربوونی چیرۆکنووسین، وەک دەرس بخوێنرێت، لە ڕاستی لام نەدابێت. ئەگەر ئەڵەمان کوردی خەوشێکی هونەری تێدابێت، ئەوەیە نووسەر لە کۆتاییدا دەڵێت: (نە ئەڵەمان کوردی نازی بوو، نە خەڵکەکە، تەنیا ئەوەبوو ئینگلیزیان خۆش نەدەویست.) بریا لێ گەڕابا، خوێنەر خۆی بەو ئەنجامە گەییشتبا.

د. مارف زەبروزەنگ و بابسالاری دەداتە بەر ڕەخنە و ڕووناکی دەخاتە سەر ئەو کارەساتانەی کە بە هۆی جەنگەوە، تووشی ئینسان دێن و لێزانانە بەرگی چیرۆک دەکاتە بەر خەباتی نهێنیی ناو شار و خەباتی پێشمەرگەیش فەرامۆش ناکات کە زێتر لە شەڕی پارتیزانیدا خۆی دەنوێنێت. خوێندن بە زمانی کوردی، هێندە جێی بایەخی د. خەزنەدارە، تا ئەو ئاستەی هەندێک جار ئەو بایەخپێدانە زۆرە، بە زیان لەسەر لایەنی هونەریی چیرۆکی دەکەوێت. (شێر دا لۆ داپیر دا) کە چیرۆکێکی زۆر کورتە و زەمان تێیدا دەیان ساڵە، زادەی ژیاننامەی نووسەرە، بە جێناوی کەسی یەکەم نووسراوە و گێڕەرەوە وەک شاگردێکی مارکس، خەون بە بەهەشتی سەر زەوییەوە دەبینێت. د. مارف کە ویستوویەتی ئەدەبی گاڵتەجاڕی بنووسێت، جێدەستی هەر لە هی مامۆستایەکی ئەو بوارە دەچێت،

وەک بە هەردوو چیرۆکی: (کورد تەلاقی ناکەوێ) و (ئەحە کەچەڵ ...)ەوە دیارە. لە (جاشولکەکەم)دا کە سەرهەڵدانی ئۆتۆمۆبیل کۆتایی بە کاروان و کاروانچییەتی دەهێنێت، هەر لەوە دەچێت بۆ نووسینی ئەو کورتەچیرۆکەی، ئیلهامی لە دۆن کیخۆتەی (سێرڤانتس)ەوە وەرگرتبێت.

د. مارف خەزنەدار هەرچەندە بە پلەی یەکەم باسکارێکی ئەکادیمیکە، بەڵام هەر زوو دەرک بە بەهای بڵند و بە ڕۆڵی کاریگەری هونەری گێڕانەوە دەکات و لەو بوارەیشدا خەزێنەیەکی تژی لە (زێڕەچیرۆک)مان بۆ جێ دەهێڵێت، کە بە هەق زایەڵەی هاواری خەڵکی کوردستانە لە پێناوی ئازادیدا و هەڵگری پەیامی قوربانییەکانی دەستی چەوساندنەوەیە، پەیامێک هانمان دەدات بە گژ ئەوانەدا بچینەوە، کە گەمە بە ژیانی کەسانی دیکە دەکەن و هەوڵ دەدەن لە ڕێی ترس و تۆقاندنەوە، وامان لێ بکەن بە پیرۆزیان بزانین.

*

**سەرچاوە و پەراوێزەکان:**


**(١) د. مارف خەزنەدار، ئەڵەمان کوردی، چاپخانەی ئەسعەد ١٩٦٩ بەغدا.**

**(٢) د. مارف خەزنەدار، بووکەشووشە، چاپخانەی ئەسعەد ١٩٦٩ بەغدا.**

**(٣) د. مارف خەزنەدار، بەرەو ڕۆژ، کتێبفرۆشی سۆران، چاپخانەی سیما ٢٠٠٦ سلێمانی.**

**(٤) د. عبدالعزيز السبيل، مفهوم القصة القصيرة بين أراء النقاد و رؤى المبدعين.**

**(٥) أنى إنرايت، القصة القصيرة الإيرلنديه في العصر الحديث، ترجمة: سامية العطوط.**

**(٦) دڵشاد مەریوانی، پێشوازیی خاوەنشکۆ و دوو چیرۆکنووس، چاپخانەی ڕاپەڕین 1973 سلێمانی.**

**(٧) عبدالصمد خانقاه، مجموعة أقاصيص كردية لمعروف خزندار، ص ٧٨ - ٩٣ الثقافة الجديدة، عدد 14 حزيران ١٩٧٠ بغداد.**

**(٨) عومەر مەعرووف بەرزنجی، لێکۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی (١٩٢٥ - ١٩٦٩) لاپەڕەکانی ١٤٦ تا ١٤٨ چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ١٩٧٨ بەغدا.**

**(٩) ڕەئووف حەسەن، کرێکار و چیرۆکی کوردی، ل٥٢ چاپخانەی عەلاء ١٩٨٢ بەغدا.**

**(١٠) عبدالصمد خانقاه، مجموعة أقاصيص كردية لمعروف خزندار، ص ٧٨ — ٩٣ الثقافة الجديدة، عدد ١٤ حزيران ١٩٧٠ بغداد.**


**(*) لە پێناوی دڵپاکیدا کە د. مارف لە 4ی نۆڤەمبەری ١٩٥٢دا نووسیویەتی و لە کۆچیرۆکی بەرەو ڕۆژدا بڵاوی کردووەتەوە، زێتر لە پەخشانێکی هونەری دەچێت وەك لە کورتەچیرۆك، باس لە بولبولێك دەکات کە لە پێناوی ژیاندنەوەی گوڵێکدا، گیانی خۆی دەبەخشێت.**

**(**) ڕەنگە د. مارف لە ناوەڕۆکی (ئەڵەمان کوردی جارێکی تر زیندوو دەبێتەوە،) پەشیمان بووبێتەوە، ئەگەر نا سەروەختی کۆکردنەوەی چیرۆکەکانی لە دووتوێی بەرگێکدا، ئەو چیرۆکەی فەرامۆش نەدەکرد. د. مارف خەزنەدار، ئەڵەمان کوردی جارێکی تر زیندوو دەبێتەوە لاپەڕەکانی ٧٥ تا ٨٠ی چیرۆکی هەڵبژاردەی ڕۆژی کوردستان ١٩٧٦ بەغدا. وێڕای ئەو چیرۆکانەی ئاماژەم بۆ کردن، د. مارف خەزنەدار چیرۆکێکی دیکەی هەیە، ناوی لێ ناوە، سڤێتلانە، کە لە دووی کانوونی یەکەمی ١٩٦٧دا لە لینینگراد نووسیویەتی و بۆ یەکەم جار ٥یی ٦ی ٢٠٠٩لە (ڕامان)ی ژمارە (١٤٥)دا بڵاوی کردووەتەوە. تایبەتمەندییەکانی ئەم چیرۆکەی بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی دیکەیدا، لەم خاڵانەدا چڕ دەبێتەوە: کارەکتەرەکان خەڵکی ڕووسیان، ڕووداوەکان لەوێ ڕوویان داوە و هیچ هێمایەکیش بۆ ئەوە نییە، نووسەرەکەی کورد بێت. سڤێتلانە کە ناوی ژنێکی جوانە و بە مانای ڕووناك دێت، چ وەك سەرەتا، چ وەك گەشەسەندنی ڕووداوەکان و چ وەك کۆتایی، یەکێکە لە چیرۆکە هەرە جوانەکانی نووسەر. (ئەمزانیبوو، د. مارف ئەم چیرۆکەیشی هەیە، سوپاس بۆ کاك سەباح ڕەنجدەر کە دوای بڵاوبوونەوەی باسەکەم، ئاگاداری کردمەوە.)**

**(***) crisis: تەنگانە.**

**(****) بە شەو چەمی گەوهەرڕیەندی پشتوێنت. لێم ئەبێتە ناوێنەی باڵانوێنت. شیعری مۆسکۆی جوان، دیوانی گۆران، ل٣٠٤ کۆڕی زانیاری کورد ١٩٨٠ بەغدا.**

**(*****) کە شێخ مەحموودی حەفید (١٨٨١ - ١٩٥٦) لە دەربەندی بازیان، لە ٩ی حوزەیرانی ١٩١٩دا، ڕێ لە لەشکری ئینگلیز دەگرێت، لە پاڵ گاشەبەردێکدا بە برینداری بە دیل دەگیرێت، ئیدی ئەو بەردە ناوی وەك بەردەقارەمان، دەچێتە نێو دیرۆکی کوردەوە.**



# خاڵ لە هێڵی یادداشتدا

سەباح ڕەنجدەر



1

ۆم لە پێشەکی پاراستووە، چونکە ئیمە: (ڕامانی سەرەکی) ۆسین دەکوژێ و ڕەزامەندی خوێنەری نموونەیی ەرناگرێت، ناشبێتە ڕووداو لە نووسیندا.

وزەیرانی 1988 نامیلکەی (زێوان)م چاپ کرد، دانەیەکم شکێش بە: (ئیسماعیل بەرزنجی) کرد، گوتی: دوو دانەی یشم بدەرێ، یەک بۆ کتێبخانەی: (محەمەد مەولوود مەم) ئەوی تر بۆ: (دکتۆر مارف خەزنەدار).

شتر: (محەمەد مەولوود مەم)م بەهۆی: (دکتۆر ئازاد ەمەشەریف)ەوە دەناسی و پیاسەی دووروودرێژمان شەقامەکانی هەولێر کردبوو، لە گازینۆی: (شەوانی ەولێر)یش چەند جارێک بە سێ قۆڵی دانیشتبووین و ەند جارێکیش لە ماڵەوە نانوونمەکمان کردبوو، (دکتۆر زاد حەمەشەریف) لە ژمارە (183)ی ساڵی 2004 لە ۆڤاری (کاروان)، بابەتێکی نووسیوە بە سەرناوی: (چۆن ەمم ناسی؟) باسی ئەو دانیشتنانە دەکات و بۆچوونی ەمیشی لەبارەی منەوە هێناوەتەوە و دەڵێت: (هەر لەو انیشتنەدا گفتوگۆیەک دەربارەی چیرۆکی (دۆزینەوە) لە ێوان کاک (سەباح ڕەنجدەر) و (مەم) دروست بوو، کاک ەباح بە وردی پرسیاری لەسەر چیرۆکەکە لە (مەم) کرد باسی لە لایەنی بەهێز و کاریگەریی چیرۆکەکەی (مەم)ی رد. (مەم)یش لە کاک (سەباح)ی پرسی: (تەمەنت چەندە؟). ەویش گوتی: (نۆزدە ساڵ).

(مەم) پێی گوت: (تەمەنی ڕۆشنبیریت پێش تەمەنت ەوتووە و ئومێدی زۆرم بە لاوی وەکو ئێوە هەیە باری ەدەبیمان بەرەو داهێنان ببەن).

ە چل و ئەوهەندە ساڵەی تێکەڵ بە ناوەندی ڕۆشنبیری وردی بوویمە، پیاوی ئاوا لەخۆبووردووی وەک: (محەمەد ەولوود مەم) و (عەبدوڵڵا سەراج)م نەناسیوە، بەو شێوە کە و لە دڵ و گیانەوە پاڵپشتی بەهرە و لێهاتوویی لاوان کەن و دڵ و گیانیان بە داهێنانیان خۆش بێت و پێکهاتەیەک ن لە ویست، جۆر و نموونەن.

وای چەند ڕۆژێک لەگەڵ: (ئیسماعیل بەرزنجی) ڕێکەوتی کمان کرد و گوتی: (دکتۆر مارف خەزنەدار) پێی ۆشە بتبینێت، ناونیشانی ماڵەکەی دامێ، ئەوسا هەولێر ارێکی وەک ئێستا قژ ئاڵۆز نەبوو، بە ئاسانی شوێنە دەستنیشانکراوەکان دەدۆزرانەوە.

عەسرانێک زۆر بە شەرمەوە بەرەو ماڵیان بەڕێ کەوتم، دەرگای حەوشەیان کرابووەوە. بەرانبەر دەرگا لەبەر هەیوانەکەی لەسەر ئەسکەمیلێکی تەختە دانیشتبوو، لبادێکی سپی نەخش قاوەیی، لەسەری ڕاخرا بوو، کۆمەڵێک گوڵدان لە دەوروبەری داندرابوون، دیاربوو تازە ئاودرابوون، لەگەڵ شەربەیەک، کە تافتەیەکی سپی بەسەر دەمی شەربەکە دادرابوو، ژێرەوەشی لەناو بارستێک قومی تەڕدا بوو، پیاوێکی پرچ و سەر و سمێڵ، ڕەش زیاتر لە سپی، شکۆدارانە فەرمووی لێ کردم. کتێبێکی بەدەستەوە بوو، بە قەڵەمی سوور هێڵی بە ژێر چەند برگەیەکیدا دەهێنا. کتێبەکە هیی (حوسێن مەردان) بوو. بە ناونیشانی: (الأزهار تورق داخل الصاعقة). دوای بەخێرهاتن و یەکترناسین گوتی: (چاو و دڵم بە بەهرە و لێهاتوویی لاوان ڕوون و گەرمە). پێشتریش شاعیرانی لاوی هەولێر بەردەوام سەردانیان کردووم. وەک: (جەمیل ڕەنجبەر و عەبدوڵڵا پەشێو) و زۆرانی تریش.




٤٣

دیار بوو (زێوان)ی خوێندبووەوە، چەند پارچەکاغەزێکی باریکیشی بڕیبوو لە نێوان لاپەڕەکانی دانابوون، گوتی: لهدایکبوونی شاعیرێکی داهێنەری تێدا بەدی دەکەم، برەو بە نوێخوازی شیعری کوردیی بدات. نوێخوازیش جووڵێنەر و دیارینەکراوە، هەڵوێست و بۆچوون و کرانەوەی خۆتە، هەرچی ڕێنماییەکی لەو دانیشتنەدا کردم. دواتر بەپێی هەڵکشانی ئەزموون، هەمووی لە کات و شوێن و جێی خۆیدا ڕاست دەرچوون.

من لەسەر بەرگی زێوان نووسیبووم (چامە). ئەوەی زۆر جێگەی سەرنج بوو بۆ من. گوتی: زێوان چامە نییە. (ڕۆمانەشیعر)ە، هەرچی شتێک لە هەقیقەتەوە بێڵێی زەرەرت پێناگەیەنێ. لە کەم ئەزموونی و ڕۆشنبیریی ساکارم، یەکەم جار بوو دەستەواژەی ڕۆمانەشیعرم گوێ لێ بێت و ببیستم. ئەوکات من چەند ڕۆمانێکی کوردی و چەند ڕۆمانێکی وەرگێڕدراوم بۆ کوردی خوێندبووەوە. دیارترینیان (شار)ی حوسێن عارف و (براکوژێ) نیکۆس کازانتزاکی بوو،

عەبدولکەریم شێخانی بە کوردییەک، کە خولیاکانی زمانی دەهێنادی و خەیاڵمی هێنادی، کردبووی بە کوردی.

ساڵی 2012 دکتۆر عەبدوڵڵا ڕەحمان کتێبێکی بە ناونیشانی: (ڕۆمانەشیعر: مێژوو و سەرهەڵدان) چاپ کرد. لەم کتێبەدا (زێوان) بە یەکەم ڕۆمانە شیعری کوردی دەستنیشان کراوە.

کە لەلای هەستام و بڕۆم تا دەرگای حەوشە لەگەڵم هات و خانەدانانە بەڕێی کردم و گوتی: (دیاربە و قەتیش لە دەرگا مەدە). دوای ماوەیەکی کورت ئەو ماڵە بووە ماڵە باوک و تا کۆچی دوایی بەردەوام هاتوچووم کردووە. زووش گوتی: تۆ دووەم ئەدیبی دەبیتە کوڕی ماڵ. یەکەم کوڕی ماڵ: (دڵشاد مەریوانی)یە. ئەوکات شەهید نەکرابوو. گوتیشی: هەر کتێبێکت پێویست لە کتێبخانەکەمدا، بهێنە دیاریکردنی کات بیبە و پرسم پێ مەکە. بەس دوای گەڕانەوەی لە شوێنی خۆی دایبنێوە و جێگۆڕکێی پێ مەکە. بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ لەو ماڵەدا هەموو چوارشەممان کۆڕی ئەدەبی دەبەسترا. چا و قاوە و خۆشاو و میوە و جۆرەها شیرنەمەنیش ئامادە و پێشکێش دەکرا.

دوای خوێندنەوەی بابەتەکە ئامادەبوان گفتوگۆیان لەبارەی بابەتی پێشکێشکراو دەکرد. یەک لەو چوارشەممووانە بەخت یارم بوو، بێ ئەوەی بۆچوونی من وەربگرێت، دوای کۆڕەکە گوتی: چوارشەممەی داهاتوو سەباح دەقێک دەخوێنێتەوە. بۆ هەموو کۆڕەکانی داهاتوو، لە دوای کۆڕەکان دەیپرسی چوارشەممەی داهاتوو نۆرەی کێیە و کێ ئامادەیە، ئامادەیی ئەدیبەکەی وەردەگرت، بەڵام ئامادەیی منی وەرنەگرت و یەکسەر ڕایگەیاند چوارشەممەی داهاتوو فلانە.

لە بەرگی حەفتەمی: (ڕۆژگاری من - 2014) لە لاپەڕەی (212) ئاماژەی بەم کۆڕەی من داوە، لە دوای خوێندنەوەکە: (محەمەد موکری و سەلاح شوان و فیکرەت عزەت) گفتوگۆیان لەبارەی شیعرەکەمەوە کرد، بۆچوونەکانی سەلاح شوان لەبارەی زمان و شیعرییەت و شێواز لە شیعری درێژدا کامڵ و پێوانەیی و فرە زانیاری بوون. نەک بۆ من، بەڵکو بۆ تەواوی ئامادەبووان.

هەر لەو ماڵەدا چەند ئەدیبێکم ناسی. وەکو باوکێکیش هەمیشە ڕێنمایی ئەدەبی و ژیانی کردووم و سوودمەند بوویمە لە ڕێنماییەکانی. بەشێک لە ئەدەبی کلاسیکیم بە چاوڕوونی ئەو و لە ڕێگەی کتێبخانەی ئەوەوە ناسی.

لە ناوەڕاستی نەوەدەکان، کە گەمارۆیەکی کوشندە و پەلوپۆشکێن لەسەر خەڵکی کوردستان هەبوو، خواردنی باش لە هەموو ماڵێک دەست نەدەکەوت. ڕۆژێک میوانداری: (پیرباڵ مەحموود) و منی کرد. خوانێکی شاهانە خەملابوو. من کە خواردنەکەم بینی پێم نەخورا و هاوسەر و منداڵەکانم هاتنە پێش چاوم. وەک ئەوەی هەستی شەشەمی کاری کردبێت و پێی گوتبێت میوانەکەت لەم حاڵ و بارە لاسەنگەدایە. لەسەر خوانەکە هەستا و دوای ماوەیەکی کورت هاتەوە گوتی: سەباح بە بنیادی بۆ ماڵەوەم نارد. ئەوەی لەسەر خوانەکە بوو، بە زیادەوە بۆ منداڵەکانمی ناردبوو.

دوای نان و چا و قاوە. دیوانی: (محەمەد سالح دیلان) ی هێنا و گوتی: هەریەکەمان شیعرێکی ئەو شاعیرە بلیمەتە بخوێنینەوە، پاشتریش گفتوگۆی لەبارەوە دەکەین. پێش ئەوەی ئێمە بچین، دیاربوو شیعرەکانی دەستنیشان کردبوو. بەوە زانیم لە نێوان هەر شیعرێکدا پارچەکاغەزێکی سپی دانابوو، خۆی شیعری: (سلێمانی)، پیرباڵ مەحموود شیعری: (بێخودی شاعیر). منیش شیعری (شێخ مەحموودی زیندوو).

بە پیرباڵی گوت: تۆ ئیلقات نەرم و بەهێزە، بەڵام ئەو شیعرەت لەنگ خوێندەوە. ڕای لە خوێندنەوەکەی منیش نەبوو، هەستم کرد ڕێکخستنی ئەم دانیشتنەی بۆ ئەوە بوو توانایی دیلان بە من ئاشنا بکات. هەر لەم دانیشتنەدا بە باشی لەبارەی ئەزموونی: (ئەحمەد تاقانە و ئەنوەر قادر محەمەد و فەرهاد شاکەلی) دوا، وەک شاعیر و وەک لێکۆڵەر.

بۆ نووسینی: (مێژووی ئەدەبی کوردی)یەکەی داوای هەر

دوو بەرگی چیرۆکەکانی: (محەمەد مەولوود مەم)ی لێ کردم. گوتیشی خۆم هەمە، بەڵام قوتابییەک بۆ کاری زانستی بردوونی و نەیگەڕاندووەتەوە. ڕێکەوتنەکەمان دەکەوتە 15/1/2001. ئەم ڕێکەوتە منداڵێکمان خودا بەخشی. بەو هۆیەوە لە بەڵێنەکەم دوا کەوتم. 18/1/2001 کتێبەکانم بۆ برد. پێش ئەوەی بەخێرهاتنم بکات و کتێبەکانم لێ وەرگرێت. گوتی: تۆ بیرکردنەوە و هەڵکەوتی ئەورووپییانەت هەیە و زۆر پابەندی بە قسە و بڕیاری خۆت، بۆ دواکەوتی. منیش واقیعەکەم پێگوت و گوتم لە دوای سێ کیژان، کوڕێکمان لە دایک بوو، ئەمەیە هۆی دواکەوتنەکەم. بزەیەکی شادمانی لە دەموچاوی گەڕا و پیرۆزبایی و سوپاسی خودای کرد، برادەرە هەڵبژاردراوەکەی کەسێکی کەمتەرخەم نییە. هەمان کات دایە (سەعدییە) سێ پاکەت شیرینی لە سوپەر مارکێتەکەی نزیک ماڵیان کڕی و گوتی: لەجیاتی من لە کۆلانی خۆتان، خۆت بەسەر منداڵانی دابەش بکە. ئەمە کوڕەزای منە. خەزنەداریش گوتی: باجی دواکەوتنەکەت ئەوەیە، من ناوی لێ دەنێم، لەگەڵ ئەوەش بۆچوونی خۆی زاڵ نەکرد، ڕەزامەندی من و هاوسەرەکەمی وەرگرت، ئینجا ناوی نا (یاد)، ئێستا تەمەنی هەژدە ساڵە و حەزی لە فڕۆکەوانییە.

2

لە ژمارە (43)ی 18/9/1997 لە (برایەتی، پاشکۆی ئەدەبی)، عەرزوحاڵنووسێکی ڕاهێندراو و بەنازپەروەردەکراو بە شەکر و شیر بۆ پەلامار و کاری تایبەت و دەستنیشانکراو. نووسینێکی نووسی بە ناونیشانی: (زەقبوونەوەی خود لەناو وەهمێکدا). لە لایەن ئەو و برادەرانی تریەوە، زیاتر پازدە نووسینی بە کوردی و عەرەبی بەدوا داهات، دەستەوایی و ڕێکەوتنێک لە نێوانیان کلکی لێک گرێدابوون، لەم نووسینانەدا سەدوحەفتاودوو قسەی ناقۆلا و ناشایستەیان پێ گوتم. یەک لەو برادەرانە خەسڵەتی مرۆڤیشی لێ ستاندبوومەوە وەک: (ئاژەڵ) دەستنیشانی کردبووم. منیش لە ژیانی ئەدەبیم ڕێکەوتی لەوە دڵخۆشترم ڕووبەڕوو نەبووەتەوە. ئاستی لەم جۆرە و نزیک لەم جۆرە، بهرههمی منیان بەدڵ نەبێت. ئێستاش ئەگەر لە شەقام ڕێکەوتی ئەو برادەرە بکەم بێویستی خۆم، لە هێزی ئەدەبی بێگەردەوە خەندەیەکی ڕەزامەندی دەمگرێت و تا ئەوپەڕی دڵخۆش دەبم، خۆشییهکە هیچ خۆشییەک پێی ناگات، دەبێ سوپاسی خودا و هەر سەدوچلوچوار هەزار پێغەمبەر بکەم. ئەم عەرزوحاڵنووس و ئاستە بازاڕییانە بەرهەمی منیان بەدڵ نەبێت، خۆ ئەگەر بەرهەمی منیان بە دڵ بێت، دەبێ گومان لە توانایی ئەدهبی خۆم بکەم.

ئەم ئاماژەیەم تەنیا بۆ ئەوەدا، دوای ئەوەی قورولیتەی ئەم گەلەکۆمەکییە نیشتەوە، 11/11/1997 خەزنەدار تەلەفۆنی بۆ کردم، نیوەڕۆ وەرە لای من نانێک بە پێکەوە بخۆین. کە چووم دوو قوتابی قۆناغی دکتۆرای لا بوون وانەی پێ دەگوتن، ناویان: (محەمەد) و (شنۆ) بوو، ئەوانیش لە خوانەکەدا بەشداربوون، هەموو ئەو ڕۆژنامانەی لەسەر یەک کەڵەکە کردبوون، کە نووسینەکانی تێدا بڵاوکرابوونەوە بە زمانێک، زمانی فەرمان گوتی: پێڵاوەکانت لە پێ مەکەرەوە و بڕۆرە سەریان و بەرز ڕاوەستە، منیش زەردەخەنەیەکی شەرمنم بۆ کرد و گوتم، ببوورە، گوتی. ئاخر هەمووی تەفرەدان و گێرەشێوێنی ئەدەبی و بەدگۆیی و قسەهەڵبەستن و تانە و جنێون بۆ تۆ و ئەدەبی تۆ. گوتم: لەپاڵ تەفرەدان و گێرەشێوێنی و بەدگۆیی و قسەهەڵبەستن و تانە و جنێوەکانی ئەوان، بابەتی نووسەرانی تری تێدا بڵاوکراوەتەوە بە شکۆوە باسی ئەدەبی کوردی دەکەن. فرمێسکی شادی چاوانی بریقاندنەوە و یەکپێ لە شوێنی خۆی هەستایەوە و دەستی لەسەر شانم دانا. گوتی ئاوا بە گەورەیی لە ئەدەب گەیشتووی و ڕوونبین و لێبووردەی، بۆیە ئەو بێ (سەرەتا و کۆتایی)یانە ئاوا تووشی هیستریا بوونە.

گوتی بۆنەیەکی باشە ئەم دێڕەشیعرەی: (هێمن) بڵێینەوە: (لەم وڵاتە هەمووشت زۆرە، بەنی ئادەم کەم).

لەناو کتێبخانەکەیدا لەگەڵ کتێب، کەلوپەلی بەنرخ و دەگمەنی دانابوون. کووپێکی چای پێشکێش کردم، کە لە ڕووسیا لەگەڵ خۆی هێنابوویەوە و وێنەی پووشکینی لە قەدی نەخش کرابوو، زیاتر لە چل ساڵ بوو پاراستبووی، گوتی: ئەمەش یەکێکە لە ئازاردراوەکانی سەر



زەوی و تۆش بەهێز بە تا دەکوژرێنی و ئازادانە بە دوای خەونەکانتدا برۆ.
پێش ئەوەی ئەم دانیشتنە رێک بخات پەیوەندی بە سەرنووسەر: (فەرهاد عەونی) و جێگری سەرنووسەر: (زاهیر رۆژبەیانی) کردبوو، ئەوانیش پاکانەی خۆیان واکردبوو، گوتبوویان: (پێراگەیان) و (ڕاسپاردە)ی تایبەتمان بۆ هاتووە, ناتوانین بلاوی نەکەینەوە. دەنا (رێکخەر و ئامادەکار و نووسەرەوە)ی ئەم بابەتە دەڵێی دەرچووی خولی ڕاهێنانی گوللەبارانکردنی مرۆڤە، دابی رەخنە و گفتوگۆی تێدا نییە.
من خۆم ناسیوە و خۆم دۆزیوەتەوە، مرۆڤ کە بڕوای هەبوو، هەرچی بڕوایەک بێت، خۆی دەناسێت و خۆی دەدۆزێتەوە. من بڕوام بە شیعری پاراو و بێگەرد هێناوە. بڕوا وات لێ دەکات بزانی لە شوێنەکاندا لە کوێی و کامە (خۆت)ی.
پاش ماوەیەک کۆشیعری: (ڕووەکەکانی خواوەند) م چاپ کرد. دانەیەکم پێشکێش کرد. تەماشایەکی ورد و هەڵگێڕ و وەرگێڕی کرد و گوتی: شیعرەکان جەزی مرۆڤیان تێدایە و کاریگەرن. چەتری شێوازی ئەفسوونکاری بەسەر خوێنەرانیان هەڵدەدەن و بەرەو قووڵاییان دەبەن. تۆ شەرم لە جیهانی شیعری خۆت دەکەی، بەڵام چاپەکەی زۆر سادە و سەرەتاییە و خوێنەر هان نادات بۆ خوێندنەوەی.
دوای ماوەیەک نووسینێکی نووسی بە ناونیشانی: (خەونی خودایی لە کۆشیعری ڕووەکەکانی خواوەند) دا، لە ژمارە (45)ی 5/3/2000ی گۆڤاری (ڕامان) بلاوی کردەوە. لەگەڵ شیعری نوێ کۆک نەبوو، لە گۆڤاری (ڕامان)، ژمارە (148)ی 5/9/2009 بابەتێکی نووسیوە بە ناونیشانی: (هەندێ بیرەوەریی رۆژنامەگەری و من و ڕامان) ددان بەوە دادەنێ ناوەندی رۆشنبیری کوردی چاوەڕوانی ئەوەیان لێ نەکردووە لەبارەی شیعری نوێوە بنووسێت، چونکە تایبەتمەندە لە شیعری کلاسیکی. لە وتارەکەیدا نووسیویەتی: (بەمجۆرە ئەو پارچەشیعرەی (سەباح رەنجدەر) کەوتە ناو ئەو چەند شیعرەی لاوانی سەردەم نووسیویانە و شیعرەکەم بەدڵ بوو).

3

سێزدە ساڵ و هەشت مانگ و یازدە ڕۆژ لە گۆڤاری (ڕامان)دا کارم کردووە. لە ژمارە (3) تا (153)، ئەو کاتەی کارکردنەم چ وەک تەمەن و چ وەک توانایی ئەدەبی دەبێتە قۆناغی گەشەی تەمەن و ئەدەب. یاداشتی ئەم ماوەیەم بە پری نووسیوە و لە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا چاپی دەکەم. (ئازاد عەبدولواحید) سەرنووسەری گۆڤارەکە بوو، بەیانی: 10/10/2008 سەرێکی کێشا ژوورەکەم و گوتی: وەرە قاوەیەکم لەگەڵدا بخۆرەوە. من ئەو پیاوەم قەت ئاوا برێندار و هەناسە توند نەبینیبوو. دەموچاوی تەواو نائاسایی بوو، لە ناخەوە هەژا بوو، هەستی بە پیلان و غەدرێک لە من کردبوو. نموونەی داهێنەرانی بۆ دەهێنامەوە چ تۆڕ و داوێکیان بۆ داندراوەتەوە، نموونەی: (بەدر شاکر سەییاب)ی دەهێنایەوە و دڵێشی نەدەهێنا بابەتەکەم بۆ باس بکات. بەردەوامیش دووبارەی دەکردەوە تۆ شاعیرێکی: (وتووریای) بە زەردەخەنەیەکەوە گوتم چی بووە پێم بڵێ خۆ پیلانی مەرگی مسۆگەر نییە. برێک ڕوون بووە و زانی لەسەرخۆم و بەسەرخۆم زاڵم و لە هێزی چاوەکانمدا خاوەنی بڕوا و ئەوەم، کە گوتوومە. گوتی: ئەوەیان کوشتنی توانست و رۆحە. کۆمەڵێک کاغەزیشی لەسەر مێزەکەی بەردەمی دانا بوو، بۆ من دەدوا و تەماشایەکی کاغەزەکانی دەکرد و دەستی نارەزایی لەسەر دادەنان. بە چاوێک سەیری منی دەکرد، وەک ببینی پەرداخێک ژەهرم بۆ ئامادە کرابێت و ئەو رێگری بکات نەهێڵی بیخۆمەوە، یان دەرخواردم بدرێ. گوتی: مرۆڤێک، لەوانەیە برادەریشت بووبێت، زۆرکارا و کارامەیە لە کۆمپیوتەر و ئیمێل دروستکردن. بە هەشت ناوی جیا جیای نووسەرانی ناسراو ئیمێلی دروست کردووە و جنێو بە خۆت و ماڵ و منداڵت دەدا و بۆ ئیمێلی گۆڤاری ڕامانی ناردووە، وای کردووە من بیبینم. گوتم: بمدەرێ با بیانخوێنمەوە. گوتی: دڵم نایە نەک خودا

نەخواستە تووشی دڵوەستان و مێشک لە کارکەوتن بێت. گوتیشی هەموو راپۆرتەکانم لەبەریەکدا راگرتووە، وەک رێنووس و شێواز و وشە و فەرهەنگ و زاراوە یەک کەس، کەسێکی کرچوکاڵ و کۆیلە و کلۆڵ. لە ئەدەب نووسیویەتی: خودایە دەبێ من چی بم و چیم کردبێت. مرۆڤێک، رەنگە رۆژگارێک برادەر و هاوکاریشم بوو بێت، رێ بە خۆی بدا بە هەشت ئیمێلی جیا جیا جنێوم پێ بدا و بوختانم بۆ هەڵبەستێ. لە کاتێکدا لە ژیانی خۆم نەک خراپەم لەگەڵ مرۆڤێک نەکردووە، بەڵکو کشەم لە مێشێکیش نەکردووە، بەبێ دوودڵی هەمیشەش رێزی نووسینی باشم گرتووە و ستایشم کردووە، تا سۆما لە چاوانیشمدا حوکمی مابێت لەسەر ئەم قەناعەتەم بەردەوام دەبم.

ئاخۆ دەبێ چی رقی ئەو مرۆڤەی لەو پلەیەدا کوڵاندبێت، یان دەستدرووی چ رێوییەک بێت بە ناوی نووسەرانی ناسراو ئاژاوە و گێرەشێوێنی بنێتەوە، تا من لەگەڵ نووسەرەکان دووچاری گرفت و مەودای گرژبوون لە نێوانمان دروست بکات. کۆیلەیی لە ناوەوە کلۆری کردووە، خودایە یارمەتی بدە تا ئازاری کەسێکی تر نەدات. ئەنجام دوای چەند ساڵێک پێم زانی عەرزوحاڵنووسێکی بازارییە، بە خۆی بەهەشتی داهێنانی نییە. لە بەهەشتی داهێنانی ئەوانی تردا دەژی. بە واتایەکی دی، خۆی بۆ خۆی بوونی داهێنانی ئەدەبی نییە. تەنیا لە بوونی ئەدەبیدا ئەوەی بۆ دەمێنێتەوە، (پەلاماری داهێنەرێکی داوە.) دوای دەست و دەم بە هەرمێشک خووساندن و بێ شەرم ئامادەکراو، بە چاوڕوونی برادەرێکی (شاعیر)م، کە من لە ژمارە (32)ی گۆڤاری (رامان)ی 5/2/1999 لە مێزگردێکدا بە ناونیشانی: (کێشەی تێگەیشتن و تێنەگەیشتن لە ئەدەب و هونەردا). بە شاعیری خاوەن رۆئیا ناوم بردووە. نامەیەکی کراوەم بۆ ئەو برادەرە شاعیرەم نووسیوە و لە نامەکەدا بەدار و بار و دەرزی و درووماننتر بۆچوونی خۆم دەربڕیوە و لە بنی هەمبانەکەم داوە. پێش ئەوەی بڵاویشی بکەمەوە دەیدەم بە خۆی.

لە پەرەگرافێکی نامەکەدا نووسیومە: (ئەدەبی پاراو و بێگەرد بە سروشتی خۆی دوژمنی دیکتاتۆرانە و رەنگ و رووخسار و کرۆکی واقیع دەستکاری دەکات، بەڵام لە توانایدا نییە بیگۆڕێت، بەڵام دەتوانێت رکوکینەی ئازیزان وەرگێڕێت بۆ خۆشەویستی، ئەگەر ویستت ئازیزان ببینی، هەموو برینەکانت بکوڵێنەوە، ئەوجا چاوی ببینێت پاراوکە). دەمزانی خەزنەدار کاریگەری بەسەر ئازاد عەبدولواحیدەوە هەیە و رێزی داوای یەکتری دەگرن. چوومە لای و بابەتەکەم تێگەیاند، بەڵکو راپۆرتەکانم بۆ وەربگرێت. بە لە خۆرازیبوونێکی پڕبڕوا و جۆرە تەوسێکەوە گوتی: بە ناوی خواستراوەوە جنێویان پێ داوی، گوتم بەڵێ. گوتی: هەر یەک ناوی خواستراو بۆ کاری ناڕەوا بەکاربهێنێت، (نامەردە). نامەردیش خاوەن رەئی نییە، بۆیە داوایەکەت جێبەجێ ناکەم. گوتیشی داهێنەر هەڵۆیە، هەڵۆش تەماشای رێگە درێژەکان دەکات و رێبواران دەپارێزێ. هەڵۆیانی رێگەی درێژی ئەدەبی کوردییش تۆ دەپارێزن.

4

(دکتۆر لەتیف محەمەد حەسەن) شیعری: (سروودی باران)ی بەدر شاکر سەییابی وەرگێڕا بوو، لە ژمارە (93)ی گۆڤاری کاروان، ئاداری 1992 بڵاوی کردبووەوە. زۆر سەرسام بووم بە شیعرەکە و وەرگێڕانە بێ گرێ و گۆڵەکەی و شیعرییەتی تێدا رسکاندووە و دنیابینیی شاعیری تێدا کامڵە. باسی ئەم وەرگێڕانەم بۆ کرد، کە چۆن خەیاڵی جووڵاندم و دەقە عەرەبییەکەی بە چییەتیی خۆیەوە بەستاوەتەوە. ئەویش بە دووروودرێژی تێکەڵاوبوون و رۆژگاری خۆی لەگەڵ سەییاب زۆر بەتاسە و لە دڵەوە گێڕایەوە. گوتم: ئەو زانیارییانە بۆ خوێنەری کورد زۆر گرینگ و پێویست و خولگە و مەبەستە، پێشنیاز دەکەم بیاننووسیت. گوتی: لە سەردانی داهاتووت شتێک دەبینیت. کردی بە بیرکردنەوەی خۆی و بە شێوازێکی پڕ زانیاری، درێژە بە بنهماکانی برادەرایەتی دەدا و بابەتێکی نووسی بە ناونیشانی: (من و گۆران و سەییاب). لە ژمارە (53)ی 5/11/2000ی گۆڤاری رامان بڵاوکرایەوە.

5

22/11/2001 لە گفتوگۆیەکدا باسی: (محەمەد ساڵح دیلان)ی کرد، کە خاوەن تیۆری شیعرییە، هەم داوام لێ کرد ئەم



هەست بە تیۆرە و بیرکردنەوە وەک نووسینێک تۆمار بکات و ئەندازەی تیۆرەکە بە پێودانگی ئەندازیاریی بگەیەنێت. تێگەیشتنی خۆی بۆ تیۆرەکە کرد بە بابەتێک بە ناونیشانی: (شیعر). لە ژمارە (79)ی 5/1/2002ی گۆڤاری ڕامان بڵاوکرایەوە.

## 6

17/8/1999 (حوسێن عارف و خانم)ی خێزانی میوانی بوون، لە گفتوگۆیەکان دیار بوو، بۆ چەند ڕۆژێک دەمانەوە. باسی چیرۆک، بابەتی دانیشتنەکە بوو. منیش لێم پرسی خۆ تۆ لە قۆناغی خۆت چیرۆکنووسێکی باشی و چیرۆکەکانت واقیعین، بەڵام واقیع لە چیرۆکەکانتدا فرەئاسۆیە. نەتەوە و کوردستان و جەنگ گوتار و قووڵاییەکەین. بۆ لە لێکۆڵینەوەی چیرۆکی کوردی وەک پێویست باست ناکرێ. گوتی: لایەنی لێکۆڵینەوەم غەدری لە چیرۆکنووسیم کردووە. ئەگەر ئەوەندە بایەخم بە نووسینی لێکۆڵینەوەی زانستی نەدابوایە. ئەوە وەک چیرۆکنووس، ڕەنگە چیرۆکنووسێکی باشیش باس دەکرام. گوتم: بۆ ئەم غەدر لەخۆکردنەت وەک بابەتێک نانووسی بۆ خوێنەرانی ڕوون بکەیتەوە، بابەتێکی نووسی بەناونیشانی: (من و چیرۆکی کوردی). لە ژمارە (41)ی 5/11/1999ی گۆڤاری ڕامان بڵاوکرایەوە.

## 7

22/11/2006 دەمەو عەسری نمەبارانێکی نەرم دەباری. چەترم هەڵدا و بەرەو ماڵی خەزنەدار ڕێگەم نایە بەردەمی هەنگاوەکانم. بینیم دایە (سەعدییە) خورما و گوێز و کونجی لەناو ئاون دەکوتا، کە ئامادەبوو لە فەخفووریەکی ڕوون بە کەوچکێکی مسی زۆر سەرنجڕاکێشەوە؛ کەمێکی لە پێش خەزنەدار دانا، ئەویش بە چێژ و تاسەیەکی زۆرەوە دەیخوارد. لێم پرسی یەکەم جارە ئەو خواردنە دەبینم، لە وەڵامدا گوتی: خواردنێکی دەگمەنی جەزائیریانە، گوتی: باش بوو بەسەر دڵمدا هاتی و دەڵێی لەگەڵ دڵم قسەت کردووە، دەنا دەبووایە تەلەفۆنم بکردبووایە، چوار کتێبی شیعری لەسەر مێزەکەی دانابوو، گوتی: ئەمانە لەگەڵ خۆتدا ببەرەوە لە هەر یەکێکیاندا جوانترین دوو شیعرم بۆ دەستنیشان بکە، دەمەوێ لەم بەرگەی مێژووی ئەدەبی کوردی، لەبارەی چەند شاعیرێکی سەردەمی نوێش بنووسم. (جەلالی میرزا کەریم، عوسمان عوزێری، دڵشاد مەریوانی، جەمیل ڕەنجبەر). دوای چەند ڕۆژێک سەردانم کرد و ئەوەی گوتبووی جێبەجێم کردبوو. بە ماوەیەکی پێوانەیی لەبارەی هەر چواریانی نووسی، دایمێ بیانخوێنمەوە، منیش خوێندمنەوە, دوای ئەوەی بەرگی حەفتەمی مێژووی ئەدەبی کوردی دەرچوو، لە 21/6/2006 دانەیەکی پێشکێش کردم. نووسینەکەی لەبارەی عوسمان عوزێری تێدانەبوو، پرسیارم کرد ئەمەی بۆ تێدا نییە. دەماری گیرا و گوتی: بۆ کورد باش بوو تێیدا نەبێ. هەستم کرد وادەزانێ بە مەبەست ئەو پرسیارەی لێ دەکەم، یان ئەو هۆ و نهێنییە دەزانم لەبەرچی لای داوە، یان بۆ سانسۆرکراوە. ژوورەکەم جێ هێشت و چوومە ناو باخچەکە و پرتەقاڵێکم لە دار کردەوە و خواردم، حەوشەکەی دارپرتەقاڵێکی زۆری تێدابوو، هەمیشە پرتەقاڵەکان بە دارەکانەوە دەمانەوە و لێیان نەدەکردنەوە. دواتر بانگی کردم؛ وەرە ژوورەوە گەرمات دەبێ. منیش چوومەوە لای، بەڵام هەستم کرد هێشتان دڵتوندییەکەی مابوو، بە شەرم و خۆبەشەرمەزارزانیو ماڵئاواییم کرد و چوومە دەرەوە. ئەمە بووە ڕووداو و کەڵکەڵەیەک و دەبێ بەدواداچوونی بۆ بکەم. چەند هەنگاوێک لە ماڵەکەیان دوورکەوتبوومەوە، دیتم (ئەحمەد تاقانە)ش بەرەو ماڵیان دەهات و دەیویست سەردانیان بکات. یەکترمان بینی، گوتم خەزنەدار بە پرسیارێکم میزاجی تێک چوو، ئەویش گوتی: مادام میزاجی خۆش نییە، منیش دەگەڕێمەوە و با پێکەوە پیاسەیەک بکەین. تاقانە وەڵامی پرسیارەکەمی دایەوە، لەو زانیم عوسمان عوزێری لە دووکەرتبوونی شۆڕشی ئەیلوول لە حوزەیرانی 1966دا بووەتە قوربانی و گوللەباران کراوە، قوربانییەک هیچ پاساوێک پارسەنگی ناداتەوە.

8

سەرەتای هەشتاکان (مستەفا پەژار) چامەیەکی نووسیبوو بە ناونیشانی: (هات یان نەهات)، ڕێکەوتی 31/12/1984 لە کۆڕێکی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە هەولێر خوێندبییەوە. کۆڕەکە: (ئەحمەد تاقانە و محەمەد موکری) بۆ دەستەیەک شاعیری لاو ڕێکیان خستبوو، پەژاریش وەک میوان داوای لێ کرابوو بەشداری بکات. دوای ڕاپەڕین بە سێ بەش بڵاوی کردەوە: دوو بەشی لە گۆڤاری ڕامان، ژمارە (1)ی ساڵی 1996 و ژمارە (8)ی ساڵی 1997 و بەشی سێیەمیشی لە گۆڤاری کاروان ژمارە (112 – 113)ی ساڵی 1997دا بڵاوکردەوە.

ماڵی من و پەژار بەسەر یەک شەقامەوە بوو، زۆر ئێواران لە گازینۆی (مەچکۆ) هەڵدەستاین و بەیەکەوە بەدەم گفتوگۆی ئەدەبییەوە دەهاتینەوە. لە یەک لە ئێوارەکان یادی کۆڕەکەمان کردەوە. لە هەمان کۆڕدا منیش شیعرم خوێندەوە. سۆراخی چامەکەم لێ پرسی و پێشنیازی چاپکردنیم بۆ کرد. گوتی لەمێژە ئەم نیازەم هەیە، بەڵام دەمەوێ بیدەم بە (مارف خەزنەدار) پێشەکی بۆ بنووسێت. لە دەستنیشانکردنی ڕۆژی سەردانەکە ڕێک کەوتین: لە 12/1/1999 سەردانمان کرد. دەفتەرەکەی لە پەژار وەرگرت و گوتی سەر بدەنەوە. نووسینێکی دوورودرێژی نووسیبوو. وەک شیعرێکی فەلسەفی لەو شیعرە دوابوو، بە وردیش قسەی خۆی کردبوو، لە ڕستەیەکیدا نووسیبووی مستەفا پەژار لەم چامەیەدا شاعیرێکی زۆر باش و داهێنەرە، بەڵام پێشتر لەناو هاوڕێیانیدا وەک شاعیری باش دەرنەکەوتبوو، لە 27/3/1999 پەژار بە کتوپڕی کۆچی دوایی کرد و چامە و پێشەکییەکە لەلای منداڵەکانی پەژار ماونەتەوە و چاپ نەکراون، لەوانەیە لەناوچووبێت، یان لەناوبچێت.

9

6/8/2006 لە ماڵی خەزنەدار (دکتۆر دلشاد عەلی) سەرنجی لەبارەی شیعرەکانی منەوە هەبوو، کە خاڵبەندی بەکارناهێنم و بە بۆشاییەک لە ئەزموونی منی دەزانی، منیش گوتم زانینم بۆ ئەم کارەم هەیە و لە ژمارە (50)ی 5/8/2000ی گۆڤاری ڕامان قسەی خۆم لەم بارەیەوە کردووە و گوتوومە:

(کۆمەڵێک حیکمەت و گیانی پەتی و بیر و مەودای ئێستێتیکم لە کەلەپوور و ڕۆشنبیری کوردی بۆ ماوەتەوە. نموونە: لە حەیراندا خاڵبەندی پەیڕەو نەکراوە، سەربەند و ناوبەند و کرانەوەی دوابەند هەیە. بە گوێگرتن و هۆشیارییەکی ڕاستەقینەی ترپە و ئاواز، هەستی خاڵبەندی لای حەیرانناس دروست دەبێت. هەروەها لە شیعری میللی کوردی و شیعری کلاسیکی خاڵبەندی پەیڕەو نەکراوە. پەیڕەونەکردنی خاڵبەندی لای من نەزانین نییە. بگرە وەک مەبەست و هونەر گەڕانەوەیە بۆ هەستی سەرەتایی کوردی و ڕەسەنایەتی کەلەپوور.

لە سپێتیی کاغەز و دابەشکردنی وێنەدا، هەست و نیشانەکانی خاڵبەندی لە ئاستەکانی دەربڕین لە خەیاڵ و زەینی خوێنەری خود وریا دەستنیشان دەکەم.

نموونە: ڕستەی بۆ کوێ دەچیت. ئەم ڕستەیە، ئەگەر نیشانەی پرسیار، یان سەرسووڕمانم بۆ دانا. ئەوە بێگومان ڕستەکە دەستنیشان دەکەم. پرسیارە، یان سەرسووڕمان. ئەگەریش هیچ نیشانەیەکم بۆ دانەنا و بە کراوەیی هێشتمەوە لەم باروبوارەدا ڕستەکە دەبێتە ڕستەیەکی ئاستدار و دۆخگۆڕ و زەینی).

خەزنەدار پشتگیری لە بۆچوونەکەی من کرد، منیش گوتم: با بۆچوونەکانت بینە بەڵگە و لەبەر دەستی خوێنەراندا بن: بە دوو ئەڵقە بۆچوونەکانی لەبارەی خاڵبەندییەوە تۆمار کرد.

1ـ خاڵبەندی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، لە ژمارە (115)ی گۆڤاری (ڕامان) 5/12/2006 بڵاوکرایەوە.

2ـ خاڵبەندی لە شیعری نوێی کوردیدا، لە ژمارە (119)ی گۆڤاری (ڕامان) 5/4/2007 بڵاوکرایەوە.

10

17/5/2009 ڕۆژێکی تەواو گەرم بوو، سەردانیم کرد. بینیم پێیەکانی لەناو تەشتێکی نمیچە پڕ قوم دانابوو، گوتم: ئەوە بۆ پێیەکانت جووت کردووە و لەناو ئەو قومە گەرمە دەیانجووڵێنیت. گوتی ناوە ناوە مێرووله



دەکەن. ئەمە چارەی ئەم میروولەیەیە.
فایلەکی پەمبەی لە تەنیشت خۆی دانابوو، دایە دەستم، چیرۆکی: (سڤێتلانە)ی تێدا بوو. گوتی: ئەم چیرۆکەم دوای چل و دوو ساڵ، ئەمڕۆ لەناو دەستنووسەکانم دۆزیومەتەوە، ئەگەر بەدڵت بوو، بۆ بڵاوکردنەوە لەگەڵ خۆتی ببە. خوێندمەوە و گوتم: جوانترین چیرۆکتە. بۆچوونەکەمی پێ لە جێی خۆیدا نەبوو، گوتی تۆ، یان لە چیرۆک نازانی، یان چیرۆکی: (ئەڵەمان کوردی و بووکەشووشە و دڵ و نەتەوە)ت نەخوێندوومەتەوە. هەستم بە نارەزاییەک کرد. لە ماڵی خۆی قەت دڵی میوانی نەدەشکاند. هەستا و منی بەجێ هێشت و چووە ناو کتێبخانەکەی. زانیم نیشانەی نارازیبوونە. لە فایلەکەدا شیعرێکی: (دکتۆر ئیحسان فوئاد)یشی تێدابوو، شیعرەکەم لەسەر ئەسکەمبیلەکەدا دانا و چیرۆکەکەم هەڵگرت و ڕۆیشتم، دڵم ئەوەندە گران ببوو، دەتگوت بووەتە توورەگەی بزمار. بەیانی چیرۆکەکەم بردە گۆڤاری (ڕامان). لە ژمارە (145)ی 5/6/2009 دا بڵاوکرایەوە. هەمان ڕۆژ تەلەفۆنی بۆ کردم گوتی: دایکت خواردنی تایبەتی ئامادە کردووە. وەرە ئێرە نانێک بخۆ. نانەکەم خوارد و نە ئەو دەنگ و نە من دەنگ، کە چیرۆکەکە بڵاوکرایەوە لەناو خوێنەران دەنگدانەوەیەکی تایبەتی هەبوو، بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: پێدەچی بۆچوونەکەت ڕاست بووبێ.

11

خەزنەدار داوای وێنەی (مەدهۆش)ی کرد، منیش دەمزانی لە هەشتاکان (لەتیف هەڵمەت) لە گۆڤاری بەیان چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا کردبوو، وێنەی لەوێ هەیە. کە گەرام ژمارە (80)ی ساڵی 1982 بوو، گۆڤارەکەم بردە ستۆدیۆیەک وێنەی مەدهۆشم لەبەرداگرتەوە و ڕێکەوتی 25/2/2010 بۆم بردە ماڵەوە. بینیم وەک ژیانی ئاسایی خۆی لە متبەخەکەیدا دانیشتبوو، دڵخۆش و گەشاوە وەک ئەوەی بە شەرابێکی حەوتساڵە مەست، تەواو مەست بووبێت، ڕۆحی ماندووی چاوەڕوانی، ئارام بووبێتەوە و خواستی گەرمی ئەدەبی هاتبێتەدی.
جلوبەرگی لەهەڵمدراوی لەبەردابوو، لەگەڵ کڵاوێکی ڕووسی تووکدار، دوو گۆڤاری ڕامانی ژمارە (152-153) لەسەر مێزەکەی بەردەمی بەسەریەکەوە دانابوون، لێکۆڵینەوەیەکی (سابیر ڕەشید)ی بە دوو بەش لەبارەی چیرۆکی (ئیحسان مستەفا) تێدا بڵاوکرابووەوە. لەبری بەخێرهاتنم یەکراست گوتی داهێنەر فەرامۆش دەکرێ، بەڵام تاسەرنا. لە زەمەنی شیاو و دەگمەن، بە دەرکەوتنی قووڵاییەکی ڕوونترەوە دەردەکەوێتەوە و خۆی دەناسێنێت، دەچێتە لاپەڕە زیندووەکانی داهێنان و مێژوو و مرۆڤی هەمیشەییەوە.
لەم نووسینەدا سابیر ڕەشیدی وەک گەوهەرناسێک ستایش کرد و گوتی: کەم بووە نووسینی نووسەرانی کورد دووجار بخوێنمەوە، ئەم گەوهەرەم دووجار خوێندەوە.
(قەرەنی جەمیل) قەڵەمکێشی ئیحسان مستەفای کێشابوو، وەک شێوەکارە پێشکەوتووەکانی جیهان باسی قەرەنی کرد و ئاماژەی بەوەدا لە هەندێک وڵاتانی جیهان شێوەکاری تایبەت بە قەڵەمکێش هەیە. پاشان باسی (بەدیع باباجان)یشی کرد. لەگەڵ بەراوردی نێوان هەردوو قەڵەمکێشی (نالی)، کە بەدیع و قەرەنی هەریەکەیان بەشێوەی جیا کێشاویانە.
گوتی نموونەی چیرۆکی ئیحسان مستەفام کردووە بە ڕووسی و بە تیراژی زۆر لە ڕووسیا بڵاوکراوەتەوە. ڕەخنەشی لە چیرۆکنووس گرت، کە بووەتە مووچەخۆری میری، فەرمانی گەورەی لە پایتەخت وەرگرتووە لە چیرۆک دوورکەوتووەتەوە، وەک ئەوەی فەرمانبەریی لە داهێنان بەگرینگتر زانیبێت، کە داهێنان تاکە سامانی جوانی ژیانە و هێمای یاخیبوونە. تەنیا مرۆڤی گەمژەی بچووک لە ژیان یاخی نابن، دەنا هەموو مرۆڤێکی کارا و کاریگەر لە ژیان یاخییە.
ئەو ئاماژەیەشی دا، کە لە شەستەکان چەند چیرۆکێکی بە عەرەبی نووسیوە و لە گۆڤارە عەرەبییەکانی ئەوسای

بەغدا بڵاوی کردوونەتەوە. زۆر داهێنەری کورد ڤایرۆسی نووسین بە زمانی بێگانەیان گرتووە، دەق بە زمانی بێگانەنووسین تیراوە و دەردەباریکەیەکە تەنیا لەناوبردنی داهێنەری بەدوایەوەیە و بەس.
بە پێداگرییەوە ئەوەی دووبارەدەکردەوە، کە لە (ئیبراهیم ئەحمەد) تەکنیکیتر و خاوەن وزەیەکی زۆرتر و ناوەرۆکی هەستیارترە. بەهۆی زمانی عەرەبییەوە هونەری چیرۆکی فەرەنسی دۆزیبووەوە و زانیویەتی، هونەری نووسینی تەواوکەری خوێندنەوەیەتی، بەڵام وەک زمان، زمانی ئیبراهیم ئەحمەد لە زمانی ئەو کاریگەرتر و کاراترە، زمان لە داهێناندا پێوەری سەرەکییە. زمان و بنیاد هاوسەنگی ناوەڕۆک دەدەنەوە.
ئەوەم لا دروست بوو، زۆر سەرسامە بەو چەند چیرۆکە کەمەی هەیەتی و بەوپەڕی ڕێزەوە خوێندوویەتییەوە و نیگەرانییان لەلا دروست کردووە. دەقی ڕەسەن نیگەرانی دروست دەکات. دەقێک نیگەرانی دروست بکات، خوێنەر ناچار دەکات بۆ جاری تریش بگەڕێتەوە سەری، بەڵام وەک برادەر و هاوشاریی برادەر نەبوونە. هیچ بیرەوەرییەکی برادەرایەتی نێوانیانی نەگێڕایەوە.

12

لە 5/6/1999 کتێبی: (ئەلێکساندەر پووشکین: گەشتێک بۆ ئەرزەڕۆم)ی پێشکێش کردم. کتێبەکە هێشتان لە نێوان دەستی ئەو و مندا بوو، وەرم نەگرتبوو. بە زمانێکی نیمچە دڵهڕاوکێ ئامێز و تاقیکردنەوەوە لێی پرسیم: شیعر چییە. منیش گوتم: (ئەگەر دەمزانی چییە، نەمدەنووسی). کتێبەکەی دایە دەستم و گوتی: (تاکو ئێستا جوانترین پێناسەیە لە هەموو زمانانی دنیا، شکۆی شیعر ئەمەیە و بەس).

13

24/10/2010 چەند کاتژمێرێک پێش کۆچی دوایی چوومە سەردانی و لە حەوشە لەسەر جۆلانەدا ڕاکشابوو، لەباتی گفتوگۆ بزەیەکی نەرم و خەمگینی بۆ کردم و گوتی بنیادی گەورە هاتی، (یەکەمجاریش بوو ئەم دەربڕینە هێمن و خامۆشەم گوێ لێ بێ). وێنەم لەگەڵ گرت، ئەم وێنەیە دواوێنەیەتی، زەینی تەواو لەسەر خۆی بوو. گۆرانی (با بچینە سەر وەیس)م بۆ گوت. کەمێک لە هونەری گۆرانی دەزانم و دەتوانم ئەدای ئەو گۆرانییانەی حەزیان لێ دەکەم بهێنم، بەڵام دەنگم خۆش نییە. ئێستاش هەستی گۆرانیم تێدا ماوە و هێزی سەرسامبوونە. گوتی بەرگی حەفتەمی (ڕۆژگاری من) ئامادەی چاپە. باسی ئێوارەشیعرییەکەتم کردووە. من لە دڵی خۆمدا دەمزانی هەڵناستێتەوە. جێم هێشت و بە دڵگرانی چوومە ماڵەوە. ماوەیەکی پێچوو (محەمەد قادر یوونس) تەلەفۆنی بۆ کردم. گوتی چیت نەبیستووە، گوتم وەکو چی بیڵێ با بیبیستم، دەنگی کەمێک پەشۆکا و گوتی دەڵێن خەزنەدار گورچیلەی وشککردین. منیش یەکێ هەستام و بەڕێکەوتم لە نیوەی ڕێگەدا دەست و پێم شلبوون، چیدی ئۆتۆمبێلم پێ نەهاژووشترا و لام دایە لێوی شەقام و وەستام، تەلەفۆنم بۆ هاوسەرەکەم کرد، هات ئۆتۆمبیلەکەی لێوەرگرتم و گەیاندمی. لە دڵی خۆم دەمگوت بەرگەی ئەو بارە ناگرم بچمە ماڵی ئەستێران و خەزنەدار چاوم ڕوون نەکاتەوە. دواتر ورەم خستەبەر خۆم و گوتم داهێنەران ژیانیان لە دوای مردن دەست پێدەکات. داهێنان نرخ و ئەزەلییەت بە مرۆڤی نموونەیی دەدات. خەزنەدار لای خوێنەرانی خۆشەویست بوو، وەک لای دامودەزگا ڕەسمییەکان، نرخی هۆگرە نموونەییەکانی هەڵناسەنگێندرێن، لە هاوکێشەی ساردوسڕی خۆخوازی بەند ناکرێن. چاوەڕێمان کە مەتەڵی هاتن و میوانداری برادەرانت هەڵدەهێنی و لە کیسە و تووتنی کەسێکی پێگەیوەوە پێمان دەڵێی: ئەدەب لە هەمووشت و هەمووکەسدا سەرسامبوون و هەستڕوونی و هەڵوێست و زمانە.

14

جاران جەژنان دەهاتمە ماڵی مەڵبەندی ڕووناکیت، کە چاوگی ئەفسوون بوو، بەرەجەژنە و لەم نزیکانەدا دێمە ماڵی چراغت، کە سندووقی مرواری و مەرجانی سیحرە. پەنجەرەیەکە لە خوێن و گۆشت و ئێسکی مێ گیراوە و ڕووناکی خۆهەڵخستنی تێدا



پەیدابووە و جووڵەی ئەلفوبێیە. شووشەیەک گوڵاو دەهێنم و بەسەر گۆڕت دەیپڕژێنم، بەڵکو باڵندە بۆنی خۆشی هەڵمژن و باڵیان باش بوەشێنن. یەک یەک باسی قەردەکانی خۆم دەکەم. قەرداری مرۆڤی پڕوزەم، قەرداری سروشتم، قەرداری باڵندەم، کە لەناو لکوپۆی درەختان دەمێننەوە و دەکەونە جریوە و جووکە و هێلکە دادەنێن. قەرداری ئەو کیژەم لە یەکەم دیداریدا خودا خورپەی خانومانی خستە ڕەگ و ڕیشە و دڵمەوە، خۆشم ویست و لە گەڵمدا هاوهەست نەبوو، هەر زوو بۆم بووە ناوەند و لە سەرلەبەری ژیان و شیعرمدا مایەوە، لە کاتی نووسینیشمدا کولتوور و ڕوانین و بیرکردنەوەمە. ئەمانە و زۆر شتی تریش بیرکردنەوە و خەیاڵیان بەهێزکردووم و نووسینیان خستووەتە ڕەگ و ڕیشە و دڵمەوە. قەرداری شیعری خۆمم، هاوڕێی بەوەفایان زۆر بۆ پەیداکردووم, فەزایەکی کراوە و پێکهاتەی زەینین. لە کاتی نووسیندا وەک برووسکە لێم دەدەن، لە پەنجەم ڕادەمێنن و هاوسەنگیان دەکەن.

ئەو فەرموودەیەت دەکەمە نەخشی جۆشوخرۆشی بێئەندازە و وشیاربوونەوە، کە دەتگوت: (ئەگەر نووسەر ڕێزی قەڵەمەکەی گرت، قەڵەمیش ڕێزی دەگرێت.) ئێستا قەڵەم و نووسین ئارامتر دەبینم.

تەنیا ئەو کاتە دەتوانم قەردەکانم بدەمەوە و شانم سووک بێت، کە بتوانم خوێنی دڵ و دیدە زیاتر بڕێژم و باش بنووسم و ببم بە شاعیرێکی ڕاستەقینە و نموونەیی. ئەگەر خراپم نووسی، تۆ لە بەهەشت ئاگادارم بکەوە، گوێم ڕابکێشە و بەردی لۆمە و سەرزەنشتم تێبگرە، با بمێنێشی و هەرا و هاوارم بەسەردا بکە، هەستە وێڵی دەرودۆڵ بە و زیاتر خوێنی دڵ و دیدەت بڕێژە. پێشم بڵێ هێشتان ماوتە قسە بکەی. قەرداری هەر هەموو ئەوانەی پێش تۆ نووسەر بوون و نووسینیان کرد بە هونەر و ئێستێتیکا، خستیانە ڕەگ و ڕیشە و دڵتەوە، زمانی کوردییان گەیاندە ئەزموونگەریی و سەدا و ژیان بەبەرداکردن و هەستیاری بوون.

هەموو شتێک لە داهێناندا دەژی و داهێنان کردەی ژیان بەبرداکردن و جووڵەی تاهەتایی مرۆڤە، هەمووشمان قوتابی نووسیین.

**کانوونی یەکەمی 2018 هەولێر**

**تێبینی:**

**• لە هیچ نووسینێکدا بەڕێز و کاك و مامۆستا و هێژا... تد. بەکار ناهێنم، تەنیا ناوی خۆیان لە هەموو ناوەڵناوێك گەورەتر و شایان و شایاندارتر دەزانم. (ناو) لە بێگەردی خۆیدا هەموو وزەیەکی کەسایەتی هەڵگرتووە. ناو خودی کەسایەتییە، ئاوەڵناو پێوەر و هێمایە بۆی. ناو بیرکردنەوەی کەسایەتییە، ئاوەڵناو بیرکردنەوەی ئەویدییە بەرانبەر کەسایەتی. ناو (بوون)ە، ناپاکی لەگەڵ ناسنامەی خۆی ناکات، ئاوەڵناو (چییەتی)یە، مەودایەك بۆ خۆشدوویی و شێواندن و دەربڕینی دوولایەنە دروست دەکات، هەروەها (تەقلید) کەموکورتییەکی بنچینەییە، ڕەگ و تایبەتمەندی نییە. زۆر شتی بەسەر نووسەری کورددا زاڵ کردووە. من بژاردەخواز و ڕوانینوانێکم بەرەو ڕەگ و تایبەتمەندی دەڕۆم.**


د. مارف خەزنەدار...
لە ڕووناکییەوە بۆ
ڕووناکی لەنێوان
ڕەمز و بەهادا
پ. د. پەخشان سابیر حەمەد
(زانکۆی سۆران)

درووود بۆ گیانی مرواریناسای ئەو مرۆڤە نەمرەی
هەمیشە مەشخەڵی مەعریفەی بەرەو لووتکە دەبرد

قەڵەم و بەرهەم لە ڕاژەی گەلدا
لەگەڵ هەڵوێستا زۆر سەریانهەڵدا
بوون بە سەرمایە بۆت لە ژیانا
لەلای ئاسۆدا هەواریان هەڵدا....

**ئەحمەد حوسێن**

مارف خەزنەدار (1930 – 2010) مرۆڤێک لە 1948ەوە مەشخەڵی مەعریفە و ڕۆشنبیریی بەرز کردووەتەوە. هەنگاوبەهەنگاو تا گەیشتن بە لووتکە ئاوڕی نەداوەتەوە. مەزنیی مارف خەزنەدار لێرەدایە، خۆراکی گیانی نووسین بوو، مەعریفە بوو، ڕۆشنبیری بوو، بە مەزنیی ژیا، بە مەزنیی ژیانئاوایی کرد، ئەوە نییە لە ڕووناکیی ژیا و بەرەو ڕووناکیی(چراغ) بارگەی پێچایەوە. هەردەم خاوەنی هزری ڕووناک، دڵ و دەروونی ڕووناک، دەستی ڕووناک، هەمووی پارچەیەک ڕووناکیی بوو. ماڵەکەی ناوەندێکی ڕۆشنبیریی گرنگ بوو، بۆیە دەڵێم: هەولێر خاوەن دوو قەڵایە، قەڵای هەولێری ماددی و قەڵای مەعنەوی و مەعریفیی مارف خەزنەدار.

**1- مێژووی ئەدەبی کوردی - پێگە و بەها**

یەکێک لە ڕێگەکانی گەڕان بە دوای ناسنامەی نەتەوەییدا، مێژووە. کاتێک ئەم مێژووەش پەیوەست دەبێت بە کولتووری ئەدەبی، مێژووی ئەدەبی دروست دەکات کە دەبێتە سەرچاوەیەکی پتەوی ناسنامەی نەتەوەکە. هەر خۆی مێژووی ئەدەب پێویستییەکی نەتەوەییە لەپاڵ پێویستییە هونەری – ئەدەبییەکەی. ئەو ڕێبازەی کەسەکە هەڵیدەبژێرێ بۆ ئەوەی کارەکەی لەسەر پراکتیزە بکات پەیوەستە بە تێڕوانینی خودی کەسەکە. ئامانجی سەرەکییش لە ڕێبازی زانستی، بەدەستهێنانی مەعریفەیە. بۆیە ڕێبازەکە بە خودی خۆی کار ناکات، بەڵکوو کارکردنەکەی دەوەستێتە سەر دوو ڕەگەزی بنچینەیی:

1 – ئەو خودەی کە ڕێبازەکە بەکار دەهێنێت (واتە کەسەکە و تێڕوانینە تایبەتییەکانی).

2 – ئەو بابەتەی ڕێبازەکە کاری لەسەر دەکات.

کەواتە سیانەی (بابەت – خود – ڕێباز) تەواوکەری یەکترین، هیچیان بێ ئەوەی تر نیشانە زانستییەکە ناپێکن، کە بریتییە لە وەبەرهێنانی مەعریفەیەکی مێژوویی ئەدەبی.

ئەوانەی مێژووی ئەدەبی کوردییان تۆمار کردووە، لە پەنجەکانی دەست کەمتر نەبن، زیاتر نین. هەریەکەشیان بەپێی ئەو کەرەستەیەی لەبەر دەستیدا بووە، لەپاڵ تێگەیشتنی بۆ چەمکی ئەدەب و مێژووی ئەدەب، بابەتەکەی خستووەتە ڕوو. لێرەدا (د. مارف خەزنەدار) لە پێشەنگی مێژوونووسانی ئەدەبدایە، چونکە هەر نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی، خەونێکی لەمێژینەی مارف خەزنەدار بووە. دەم و ڕۆژگارێکی زۆر خەونی هەمیشەیی ئەم مرۆڤە، هێنانەدی بەرهەمێکی گەورەی مێژووی ئەدەبی کوردی بووە، لە ڕوانگەی مێژوویی – نەتەوەیی – مەعریفی – ڕۆشنبیری – ئەکادیمی. لە ڕێڕەوی ژیانیدا خەونەکەی کردە حەقیقەتێک و پێشکەشی نەتەوەکەی کرد کە گەنجینەیەکی بەنرخ و کانیاوێکی پڕ بەخششە، توانای ئەوەی هەیە چەندین کار و بابەتی ئەکادیمیی لەبارەوە ئەنجام بدرێت، لەبەر ئەوەی فراوانترین نووسین لەبارەی مێژووی ئەدەبی کوردی تاوەکو ئێستا بەرهەمە (7) بەرگییەکەی د. مارف خەزنەدارە، کە زەمینەخۆشکەری زانستیی نووسینی مێژووی ئەدەبییە. بەپێی ئەمە دەکرێت دوو پێویستی ئەنجام بدرێت:

1 – خوێندنەوەی وردی ئەم بەرگانەی مێژووی ئەدەبی کوردی و دۆزینەوەی چۆنیەتیی کارکردن و ڕێگەکانی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی.

2 – دۆزینەوەی ڕێگەی نوێ و تەواوکاری، وەک ئەوەی لەسەر ئەم بنچینەیەی د. مارف دایڕشتووە، زیادەی تری

بخرێتە سەر، چونکە بناغەیەکی پتەویان هەیە و دەکرێ باڵەخانەیەکی چەندین نهۆمی مێژووی ئەدەبیی لەسەر بونیاد بنرێت و بۆ ئەم مەبەستە تەنانەت کۆنفرانسی تایبەت بگیرێت. لەپاڵ کۆڕ و کۆبوونەوە و دیداری تایبەت بەم بابەتە، هەوڵ بدرێت ئەو بۆشاییانەی کە لەنێویدا بەدیی دەکرێت بە هەر هۆکارێکەوە بێت نەهێڵدرێن.

د. مارف نووسینەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی بەپێی وابەستەی کۆمەڵایەتیی پۆلێن کردووە، کە لە ڕوانگەی (شمیدت) وابەستەی کۆمەڵایەتی (النسق الاجتماعی) وابەستەیەکی هەموویە و چوار لقی لێ دەبێتەوە، بریتیین لە: 1 - وابەستەی ڕۆشنبیری. 2 - وابەستەی زانستەکان. 3 - وابەستەی ئابووری. 4 - وابەستەی ڕامیاری. جگە لەوەی کە وابەستەی ڕۆشنبیریی چەند وابەستەیەکی تری لێ دەبێتەوە، نموونەی: 1 - وابەستەی ئایینی. 2 - وابەستەی هونەری. 3 - وابەستەی پەروەردەیی.

نووسینی ئەدەبی سەرباری ئەوەی هەموو ئەمانە دەگرێتەخۆی، دەچێتە نێو وابەستەی هونەری، کە ژانرە ئەدەبییەکان دەگرێتەوە، بەڵام پێکهاتەی مێژووی ئەدەبی کوردی زیاتر شیعرە، لەگەڵ هەندێ کەمە دەقی پەخشانی.

د. مارف خەزنەدار توانیویەتی بە وردی و فراوانیی قۆناغ و ڕێچکە هەمەجۆرەکانی دەقەکان بخاتەڕوو، لە کاتێکدا کۆی پێکهاتەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی لە چوارچێوەی ڕابردوودان، بەڵام د. مارف خەزنەدار بە ڕوانینێکی ئێستایی ئەو کاتانەی بابەتەکانی تێدا داڕشتووە مامەڵەی لەگەڵدا کردوون. کارەکەی لەم بوارەدا زۆر قورس و فرەلایەن بووە، چونکە هەمیشە کورد بە بارودۆخێکی سیاسی و جوگرافیی سەخت تێپەڕیووە، ئەمە وایکردووە دەق و نووسینە ئەدەبییەکان لە کون و کەلەبەری جۆراوجۆر حەشاردرابن و دەستکەوتنیان کارێکی وا ئاسان نەبووبێت، کە کاریگەریی لەسەر ڕێڕەوی نووسینەوەی مێژووی ئەدەب دەبێت. دەبێت ئەوەش لەیاد نەکەین کە ئامانج لە نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردیی چییە؟ یان بۆ پێویستە ئەم مێژووە بنووسرێتەوە، ئایا مەبەستێکی فێرکاریی یان مەعریفیی یان نەتەوەیی لە پشت نووسینەوەیدا بەدی دەکرێت؟ دەشێ لە دیدی بەرگەکانی مێژووی ئەدەبی کوردیی د. ماف خەزنەدار هەموو ئەمانە ئامانجەکە پێک بهێنن و ببنە مایەی پتەوکردنی بونیادی مێژووی ئەدەبەکە، لە کاتێکدا ئەم ڕێڕەوی نووسینە هەمیشە کراوەیە و پێویست بەوە دەکات دەقی دۆزراوەی تێدا جێ بکرێتەوە و بەپێی تێڕوانینی تازەتر بنووسرێنەوە. لەبەر ئەوەی نووسینەوەی مێژووی ئەدەب قورسترین جۆری نووسینە و پێویستی بە بەکارهێنانی لۆژیکێکی ژیرانەی هاوسەنگ هەیە.

ئەمە خودی ئەدەبەکە دەکاتە دیاردەیەکی (زانستی – کۆمەڵایەتی – ئیستاتیکی). لە هەمان کاتدا، د. مارف خەزنەدار سێ ڕێڕەوی لە مێژووی ئەدەبی کوردییدا بە شێوەیەکی هاوتەریب نووسیوەتەوە، کە بریتیین لە:

1 - ڕێڕەوی ژیاننامەی شاعیرەکان (لایەنی کۆمەڵایەتیی شاعیرەکان دەگرێتەوە).

2 - ڕێڕەوی خودی دەقەکان و بابەتەکانیان (لایەنی هونەری و ئیستاتیکا دەگرێتەوە).

3 - ڕێڕەوی کاریگەریی بارودۆخی ناوەخۆ و دەرەوە لەسەر چۆنیەتی نووسینی دەقەکان و مۆدێلی باوی دەقەکان و کرۆکی بابەتەکانیان، واتە گوتاری نێو دەقەکان (لایەنی ڕەخنەیی) بەپێی هەوڵەکانی د. مارف خەزنەدار لە نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردییدا دیراسەی یەک بە دوای یەکی دەقە ئەدەبیی و قوتابخانە ئەدەبییەکان کە زیاتریان خۆیان لە شیعردا بەرجەستە دەکەن. لەپاڵ ڕێڕەوە مێژووییەکە و ئەو ڕووداوانەی دەچنە نێو ئەم مێژووە و شوێنەواری تایبەت بەخۆیان جێدەهێڵن، ئەمانە بەسەریەکەوە و چۆنیەتیی هەڵبژاردنیان لایەنە ئیستاتیکییەکان دیاری دەکات. د. مارف خەزنەدار لەمەدا خاوەن سەلیقەیەکی بەرز بووە لە هەڵبژاردن و گونجاندن و هێرمینۆتیکای دەقەکاندا. لە هەمان کاتدا ڕۆڵی ڕەخنەگریشی گێڕاوە، بە چاوێکی ڕەخنەگرانە حوکمی بەسەردا دەقەکان داوە و هەڵیسەنگاندوون. دڵنیام بیری لەو سێ پرسیارە کردووەتەوە کە (ژان پۆل سارتەر Jean Paul Sartre) کردوویەتی. 1 - کێ بایەخ بە مێژووی ئەدەب دەدات؟ 2 - لەبەرچی مێژووی ئەدەبی تۆمار دەکرێت، یان دەنووسرێتەوە؟ -3 چۆن



دەشێ وێنای مێژووی ئەدەبی بکرێت؟
هەر لەسەر وەڵامی ئەم سێ پرسیارە بنەڕەتییە و چەندین وردەپرسیاری تر، بەرگ لە دوای بەرگ و بەپێی پلانێکی وردی زانستیی نووسینەکانی بەرهەمهێنان. لە بیر و هزری د. مارف چوارچێوەیەکی تیۆری داڕێژراوی ڕوون لەبارەی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردیی هەبووە، چونکە خۆشەویستییەکی زۆر، یان دەشێ بڵێین عەشقێکی مەزنی بەرانبەر ئەنجامدانی ئەم کارە هەبووە و بە شەوق و ئارەزووەوە لەگەڵیدا ژیاوە و خەیاڵی جێبەهێشتووە، کە خۆی لە خۆیدا هەر وەک (ئەنتوان کۆمبانیون Antoine Compagnon) ئاماژەی پێداوە. مێژووی ئەدەب هەمیشە سامێکی لە بەرانبەر ئەدەبدا هەیە. هەر بۆیەشە نەک هەر ناتوانین دەستبەرداری مێژووی ئەدەبی بین، بەڵکوو مێژووی ئەدەب پێویستی بە خزمەتی زیاتر و وەستان و هەڵسەنگاندن و دیراسەکردنی زێترە، هەرچەندە کارێکی زۆر قورسە، چونکە کۆمەڵێک دژ لەنێو خۆیدا کۆ دەکاتەوە، ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو، خودی و بابەتیی. هەموو ڕەوت و گرووپ و بزووتنەوە و کۆمەڵە ئەدەبییەکان، ژانر و شیعرە هەمە شێوە و ناوەڕۆکە جۆراوجۆرەکان. دیاریکردنی ئەمانە هەمووی و ناساندنیان لەنێو ژیانە ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئابووری... هتد. وەک چۆن (گوستاف لانسۆن) لە وتارەکەی (ڕێبازی مێژووی ئەدەب)دا جەختی لەسەر سروشتە زانستییەکەی ئەم بابەتە کردووەتەوە و ناسینی تەواوی دەقە ئەدەبییەکانی بەپێویست داناوە بۆ ئەوەی لەنێوان دەقەکاندا بەراوردکاریی بکرێت، بۆ ئەوەی دەقی ڕەسەن لە دەقی ئاسایی جیا بکرێتەوە. دواتریش دیاریکردنی پەیوەندییان بە ژیانی ڕۆشنبیری و ڕەوشتی و کۆمەڵایەتیی نەتەوەکە، کە ئەمانە گەشەی ئەدەبەکەشی دیاری دەکەن.

د. مارف خەزنەداریش لە نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردییدا ئەم ڕێچکەیەی گرتووە و خوێندنەوەی ئەم بەرگە نووسینانەی د. مارف دەبێتە مایەی ناسینی ئەدەب و مێژووی ئەدەب و پێکهاتەکانی ئەدەبی کوردیی بۆ هەر کەسێکی بێگانە لەپاڵ خوێنەرانی خودی نەتەوەکە.

ئەم پرۆسەیە پەیوەستە بە ڕەسەنایەتیی دەق و مێژووی ڕاستەقینەی نووسینی دەقەکە، کە بەهۆی بارودۆخی کورد مێژووی نووسینیان زۆرجار لەنێو دەقەکەدا دۆزیوەتەوە بەشێوەیەکی گریمانەیی و لە چوارچێوەی ناوەڕۆکی دەقەکە لە لایەک و بەرهەمهێنانی بارودۆخی (بایۆگرافیای شاعیر، یان نووسەرەکە) لە لایەکی ترەوە. تەنانەت ڕەگەزی گشتگیر لە زۆربەی تیۆرە نوێیەکانی مێژووی ئەدەبی لە (مێژووی شێوە ئەدەبییەکان) خۆی دەنوێنێ، کە (جیرار جینێت) ناوی ناوە (مێژووی کۆدە ئەدەبییەکان) و (وێلیک و وارین)یش پێی دەڵێن (مێژووی ئەدەب بەو پێیەی هونەرە) و (گۆلدمان) بە (مێژووی بونیادگەریی پێکهاتەیی) ناوزەدی کردووە و (ڕیفاتیر) بە (مێژووی خوێندنەوەی بەرهەمەکان) لە قەڵەمی داوە. هەموویان لە دەوری ئەو خاڵە کۆ دەبنەوە، کە بریتییە لە گرنگیدان بە بەرهەم و کارە ئەدەبییەکان. ئەوەی مێژوونووسی ئەدەبی کوردیی لە کۆی مێژوونووسی نەتەوەکانی تر جیا دەکاتەوە، (جۆراوجۆری ئەو زاراوانەی دەقە ئەدەبییەکانی پێ نووسراون و دابرانی ناوچەکان لە یەکتر چ لە سەردەمی میرنشینەکان و چ لە سەردەمی مۆدێرندا بەرهەمهاتنی هاوکاتی چەندین شێوازی ئەدەبی بە زاراوە جیاجیاکانی زمانی کوردی).

د. بەختیار سەجادی لە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانەی بەرهەمەکانی مێژووی ئەدەبی کوردیی لە وتاری (مێژوونووسی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردییدا) چەندین خاڵی پۆزەتیڤی ئەم بەرهەمەی د. مارف خەزنەداری خستۆتەڕوو، وەک:

1 - نووسەر ئاگاداری کێشەکان و شێوەکانی مێژوونووسی ئەدەبییە و قامک دەخاتە سەر هەندێ خاڵ، کە پێشتر نەکەوتوونەتە بەر سەرنجی ئەو نووسەرانەی هەوڵی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردییان داوە.

2 - ئەم بەرهەمە گشتگیرترین بەرهەمێکە لەسەر مێژووی ئەدەبی کوردیی نووسرابێ، تەنانەت دەشکرێ بە تاقە ئەنسکلۆپیدیای ئەدەبی کوردیی ناوبردە بکرێ.

3 - لە بەرگی یەکەمیدا زانیاریی وردی لەسەر جوگرافیا و مێژوو و زمان و ئایین و لە کوردستان لەخۆگرتووە (ئەمەش خاڵی هەرە گرنگی جیاکەرەوەی ئەم بەرهەمەیە لەگەڵ بەرهەمەکانی تر).

4 - لە لێکدانەوەی ژیانی شاعیراندا لە بۆچوونی ئەخلاقی ژیاننامەییەوە، کە بۆچوونی زاڵی بەرهەمە پێشووەکان بوو هەنگاو هەڵگیراوە بەرەو بۆچوونی سوننەتی – فەلسەفی کە بۆ خۆی بە نموونەیەکی دەگمەن دەژمێردرێ، بە یەکەم نموونە دادەنرێ کە بارودۆخی فیکری و فەلسەفیی پەیوەندیدار بە ژیان و بەرهەمی شاعیر و نووسەرانەوە دەخاتە بەر باس. ئاماژەی بە هەندێ کەموکوڕیی داوە، بەڵام لە کۆی هەڵسەنگاندن و بەراوردکردن لەگەڵ بەرهەمەکانی تردا، (مێژووی ئەدەبی کوردی)ی د. مارف خەزنەدار، باشترین و گشتگیرترین بەرهەمە کە لە خودی بابەتەکەی نزیک بێت.

هەژار ڕەحیمی لە دکتۆرانامەکەی بەناوی (ڕوانینێکی ڕەخنەییی لە سەر نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی)، ئاماژەی بە ڕۆڵی د. مارف خەزنەدار لە نووسینی (مێژووی ئەدەبی کوردی)داوە و دەڵێ:

د. مارف لەچاو ئەوانیتردا قووڵتر ڕۆچووەتە خوارێ، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو ڕوانینە تیۆری و هەمەلایەنەوەیە کە هەیەتی. ڕوانینێکی ڕۆشنتر و تیۆریتری هەیە سەبارەت بە چییەتیی مێژووی ئەدەب و ئەدەبی کوردی بە تایبەتی، بەڵام بەدەریش نییە لە کەموکوڕیی، هەر خۆیشی د. مارف ددانی بەمە داناوە و دەڵێ: ((ئەم کارە هەرچەندە مێژووی ئەدەبە و هەوڵێکی زۆرم داوە لە چوارچێوەی مێژوو نەچمە دەرەوە بۆ ڕەخنەی ئەدەب و تیۆری ئەدەب و ئەدەبی بەراوردکاری، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بابەتانە تێکهەڵکێشی بوون و بە هیچ جۆرێ ناکرێ بەتەواوی پشتگوێ بخرێن و دیوارێکی ئاسنین لەنێوان ئەم زانستانە و مێژووی ئەدەب دابنرێت، ئەگینا مێژووەکە وشک دەبێت و جەوهەری ڕاستەقینەی داهێنانە ئەدەبییەکە ناخاتە ڕوو، لەبەر ئەوە هەوڵێکی زۆرم داوە، کە ئەم زانستانەی پێوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ داهێنانی ئەدەبیی هەیە. لەپێناو و بۆ خزمەتی مەبەستی بنچینەیین، کە نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردییە)).

یەکێک لەو کێشانەی مێژووی ئەدەبی کوردیی کە تاوەکو ئێستاش چارەسەر نەکراوە ئەو ڕێژە زۆرەی شاعیر و نووسەری کورد کە بە زمانی عەرەبی نووسیویانە، لە چ شوێنێکی مێژووی ئەدەبی کوردیی شوێنی دەبێتەوە. بە ڕای د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، دەشێ بەرگێکی تایبەت بۆ ئەمانە تەرخان بکرێت. (د. مارف خەزنەدار)یش لە بەرگی یەکەمی مێژووی ئەدەبی کوردییدا بە پێچەوانەی ڕاکەی د. عیزەدین دەڵێ: (ئێمە لەو کاتەی شانازیی بەوەوە دەکەین کە کورد بەشدارییەکی زۆری لە پێشخستنی سامانی عەرەب و ئیسلام کردووە. ناکرێ بەرهەمی ئەم بابەتە بێنینە ناو بەرهەمی نەتەوەییەوە).

لێرەدا پرسیارێکی جەوهەریی دروست دەبێت، نەک ئەوانەی بە زمانی تر نووسیویانە بە تایبەتییش بە زمانەکانی عەرەبی، فارسی، تورکی، بەڵکوو ئەوانەی بە زمانی کوردییش نووسیویانە لەنێو مێژووی ئەدەبی کوردیی شوێنیان نابێتەوە جگە لە ڕەسەنەکان نەبێت. پێوەری ڕەسەنایەتییش بە ڕێژەی زۆری بەرهەم ناپێورێت، هێندەی چۆنیەتییەکە ڕۆڵ دەنوێنێت. د. مارف خەزنەدار هەر زوو پلانێکی تۆکمەی بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردیی هەبووە بەوەی ((ماوەی 1968- 1981 لە کۆلێجی ئەدەبیات زانستگای بەغدا سەردەمی کۆکردنەوەی کەرەستە بوو بۆ ئەم کارە، نەک نووسینەوەی، بەڵام ماوەی 1983- 1988 لە ئامۆژگای زمان و ئەدەبی عەرەبی لە زانستگای عەنابەی جەزائیر سەردەمی بیرکردنەوە و نووسینەوە بوو، کۆمەڵێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو. ژیانی زانستگا ئازاد و سەربەست بوو، ساڵی هەشت مانگ لەگەڵ ئەدەبی کوردی و چوار مانگیش لە قاوەخانە و مۆزە هەرە گەورەکانی ئەورووپا. پێنج ساڵی ژیانی سەرووی ئەفریقیا و ئەورووپا نەبوایە ئەم مێژووی ئەدەبی کوردییەم بۆ





تەواو نەدەکرا)). کەواتە بەرهەمهێنان لە بۆشایی، یان لە کاتێکی کەمدا سەریهەڵنەداوە، بەڵکوو ڕۆژگارێکی دوورودرێژ لەگەڵی ژیاوە و بیرکردنەوە لێی زیاتر بووە. لە نووسینی ئەمە وایکردووە بەرهەمەکەی ناوازە و تۆکمە بێت. د. مارف مەبەستی نەبووە تەنیا مێژووی ئەدەبی نەتەوەکەی بنووسێتەوە، بەڵکوو وەکو ڕەخنەگرێکیش بەرهەمەکانی هەڵسەنگاندووە و بە شێوازێکی ڕەخنەگرانەی پڕ لە جددییەت مێژووی ئەدەبی کوردی تۆمار کردووە، بە تایبەتییش کە کەرەستەیەکی زۆری لەبەر دەستدا بووە، وایکردووە دەستکراوە بێت لە هەڵبژاردنیان و خستنەڕووی ئەوانەی کە مێژووەکە ڕۆشنتر و پتەوتر دەکەن، ئەوانەیشی کە چێژ و بەهایەکی پێ نەبەخشیوە فەرامۆشی کردوون.

**2ـ دروێنەی تەمەن لە (ڕۆژگاری من)دا**

ئارەزووی گێڕانەوە خەسڵەتێکی غەریزەییە لای مرۆڤ، مرۆڤ چێژ لە گێڕانەوە دەبینێت. خودی ڤەگێڕ هەم سەرچاوەی چێژبەخشینە و هەمیش خۆی چێژ وەردەگرێت.

سنووری ژیانی کەسێ کە بەشێکە لە سیستەمی ژیانی کۆمەڵگە، کردنەوەی لاپەڕەکانی ئەو ساڵانەیە کە زەمەن ئەزموونەکانی کەسەکەی تێدا پێگەیاندووە.

وەستان لە وێستگەکانی (ڕۆژگاری من) هەڵبژاردنی ئەو دیمەنانەیە کە ویستوویەتی وەکو پانۆرامەیەک بیانخاتە ڕوو، کارێکی لەوپەڕی قورسیدایە، دەروون وەربگێڕدرێت بۆ وشە، بە تایبەتیی پیشاندانی ئەو سێکوچکەیەی کە ساڵانێکی زۆر لە دەروونی کەسەکە پەنگ دەخواتەوە.




لە کاتێکدا زمان پەیوەندییەکی بەتینی بە ڕۆشنبیرییەوە هەیە، یان دەتوانین بڵێین خودی ڕۆشنبیری زمانە. دووانەیەکن لە یەکتریی جیا ناکرێنەوە. زمان ڕۆشنبیریی لەخۆ دەگرێت و ڕۆشنبیرییش ئاوێنەی زمانە. بەپێی دیاریکردنی (تایلۆر) بۆ ڕۆشنبیریی کە پێی وایە: ڕۆشنبیری هەموو ئەو پێکهاتانەی مەعریفە، دابونەریت، هونەر، بیروباوەڕ، ڕەوت، یاسا و عورفەکان، هەموو توانستەکانی ترە کە مرۆڤ وەکو تاکێکی کۆمەڵگە وەریدەگرێت. دانانی هەڵوێست و دیمەنە هەمەجۆرەکانی ژیان لەنێو چوارچێوەی نووسینێکی تایبەت بە مەبەستی پارێزگارییکردنی لە لایەک و کردنە وانەی سوودمەند بۆ نەوەکانی تر و ناساندنی ئەم هەڵوێستە و دیمەنانە بە کەسانی تر لەلایەکی ترەوە، ژیاننامە دەنوێنن. ئەو نووسینەی کە یەک نووسینە و زۆر نووسینیشە لە هەمان کاتدا بەوەی کۆی نووسینەکە ژیاننامەیە و لەنێویدا سیمای چەندین ژانری تر دەناسرێتەوە. نموونەی: بیرەوەریی کە یەکسەر پەیوەستە بە زەمەن و مێژوو. ڕۆژانە: ڕووداوەکان پچڕ پچڕن و پەیوەستن بە خودی ڕۆژەکانەوە. واتە: بیرەوەری، یادگاری، ددانپێنان، ڕۆژانەنووسین هەموو ئەمانە سیمای ژیاننامە دەردەخەن، بەڵام بە تەنیا نابنە ژیاننامە، ئەگەرچی بەشدارییەکی چالاکانە لە ژیاننامەدا دەکەن، چونکە ژیاننامە پێش هەر شتێک بیرکردنەوە و تێڕامان و وەستانە لەسەر بەرزاییەکانی ئەزموون و تۆمارکردنی وردەکارییەکانی ئەم تێڕامان و ئەزموونەیە. گەر ئەم پرسیارە جەوهەرییە بوروژێنین، نووسەر بۆ چ مەبەستێک ژیاننامەی دەنووسێتەوە، یان ئارەزووی نووسینەوەی ژیاننامەکەی دەکات؟ هەندێک جار نووسینەوەی ژیاننامە کاردانەوەیە و لە ئاکامی بەرگرییکردن لە خۆی و پاراستنی کەسێتیی خۆی دەینووسێت. یان دەیەوێت تێگەیشتنی خۆی لە ژیان دوای ئەزموونکردنێکی زۆر تۆمار بکات. یان بۆ ئارامکردنەوەی دەروونیەتی، یان مەبەستی شانازییکردن بە خۆی و ڕێرەوی ژیانی یان... یان... چەندین هۆکاری تر.

ژیاننامەی خودی کە (ڕۆژگاری من) دەچێتە نێو ئەم جۆرەیان دوو سیمای هەیە:

1 - پەیوەستبوون بە زنجیرەیی زەمەن بەوەی لە

ڕابردووەوە لە (لەدایکبوون)ـەوە دەست پێ دەکات تا ساتەکانی نووسینی لە ئێستای نووسینیدا.
2 - گێڕانەوە بە ڕاناوی (من) بەوەی خۆی خاوەن تێڕوانینە، گوزارشت لەو تێڕوانینە خودییانە دەکات.
د. مارف خەزنەدار تاقەکەسە کە ژیاننامەکەی بە شێوەیەکی وردی زانستییانە بنووسێتەوە، سەرباری ئەم وردییەی لە تۆمارکردنی سات بە ساتی ژیانە جەنجاڵەکەی ناوی ناوە (یادداشت) و لە حەوت بەرگدا پێشکەشی کردووە. زمانێکی ئەدەبی و کوردییەکی ڕەوان زاڵە بەسەر نووسینەکانیدا، ئەمەش زیاتر لە ڕۆمان نزیکی دەخاتەوە، نەک تەنیا ژیاننامەیەکی ئەبستراکتی وشک بێت.
یەکەم ژیاننامەیە کە (پێڕست)ی هەبێت و بەڵگەیەکە بۆ چۆنیەتیی ڕێکخستن و دارشتنی بەپێی پلانێکی ورد و تۆکمە. تەنانەت پێشەکیشی بۆ نەنووسیوە، یەکسەر لە (هەڵاتنی ڕۆژی ژیانێک) کە لە ناونیشانی چیرۆکێکی هونەریی دەچێت، دەست پێ دەکات. لە خوێندنەوەی پشت دێرەکانی (ڕۆژگاری من) فەرهەنگێکی ڕەنگین و دەوڵەمەندی زمانی کوردیی دەبێتە هاودەمت و حەز ناکەیت کۆتایی بێت. خۆیشی لە بەرگی یەکەمیدا دەڵێ: ((پێش ئەوەی بچمە حوجرەوە، نەمدەزانی زمانی جیا لەناو خەڵکدا هەیە، وامدەزانی زمانی کوردی زمانی هەموو مرۆڤایەتییە)).
(من)ی خودی د. مارف لەم نێوانەدا بوو، تا نووسینی بەرگی کۆتایی (بەرگی حەوتەم)، ململانێ و ناکۆکییەکی زۆر لەنێوان ڕابردووی ڕووداوەکان و ئێستای نووسینیدا (ئەو ئێستایەی کە تێیدا نووسینەکانی چاویان بەسەر پەرەکاندا هەڵدەهێنا) هەبووە.
ئەدەبییات لە (ڕۆژگاری من)دا لە لووتکەیە، بە تایبەتیی کە چۆنیەتیی گێڕانەوەکان لە ڕۆمان نزیکترە، چونکە بنچینەیەکی خەیاڵئامێزی لەخۆگرتووە لەپاڵ بنچینە واقیعییەکەی. ژیاننامە جۆرێکە لە ئەدەبی کەسی. (فیلیپ لۆگون) چوار پاڵنەری ئەم ژانرە ئەدەبییە کەسییەی دیاری کردووە.
1 - لە ڕووی زمانەوە، گێڕانەوەیەکی پەخشانییە.
2 - لە ڕووی بابەتەوە، ژیانی تاکی قسەکەر و مێژووی کەسییەتی.
3 - لە ڕووی نووسەرەوە، دەبێ لەگەڵ گێڕەرەوە هاوتابن.
4 - لە ڕووی ڤەگێڕ، دەبێ لەگەڵ کەسی سەرەکیی کە ڕووداوەکان لە ڕووی وەبیرهێنانەوە دەگێڕێتەوە، هاوتا بێت.
واتە (هونەری بیرەوەرییە بە پلەی یەکەم) و بیرەوەرییش توانای ئەوەی نییە هەموو وردەکارییەکان بخاتە ڕوو، کەچی تۆماری بیرەوەرییەکانی د. مارف خەزنەدار توانیویەتی هەموو وردەکارییەکان بخاتە گەردنی (ڕۆژگاری من)ی خودی د. مارف خەزنەدار لە کاتی گێڕانەوەی سەربردەی ژیانی، تیشکی ڕووناکی و تاڵە هەمەڕەنگەکانی ئاسمانی ژیانە کۆمەڵایەتییە فراوانەکەی دەدرەوشێنێتەوە، چونکە ناوەندی (من) واتە خودی مارف خەزنەدار، ناوەندێکی بە دەسەڵاتە هەم لە ڕووی هزرییەوە، هەمیش لە ڕووی زمانەوە. ئەم دووانە هاوکێشەیەکی هاوسەنگیان لەلای دروست کردووە. دەشێ بەم نەخشەیە کۆی (ڕۆژگاری من) بخەینە ڕوو:




سێ تێڕوانین لەبارەی پەیوەستبوونی ئەدەب و ژیاننامە خراونەتەڕوو، کە بریتیین لە:
1 - ژیاننامە لایەنەکانی بەرهەمهێنانی عەقڵی دەورووژێنی و ڕاڤەیان دەکات.
2 - ئەدەب بەرگریی لە بایەخی ژیاننامە دەکات، کە هەموو چڕکردنەوە گرنگیدان بۆ کەسایەتی مرۆڤایەتی دەبێت.
3 - ژیاننامە بە بابەتی زانستێک دادەنێت، یا بۆ زانستێک کە لە داهاتوو دروست دەبێت و بریتی دەبێت لە (سایکۆلۆژیای بەرهەمهێنەری هونەری).



دەتوانین بڵێین کاتەکان لە (ڕۆژگاری من)دا بەم شێوەیەن:




نووسەر ڕابردوو دەهێنێتەوە، دووبارە بونیادی دەنێتەوە لە کاتێکی بابەتی دەیگوڕێت بۆ کاتێکی خودی، بەمەش کاتی سێیەم دروست دەکات، کە کاتی (گێڕدراوە)یە، بۆیە کات یان گوزارشت لە ڕاستەقینەی واقعی دەکات بەمەش ژیاننامە دروست دەکات، یان وەهمداره بە واقعیەت هەروەک لە ڕۆماندا بەدی دەکرێت. خستنەڕووی پێکهاتە ورد و درشتەکانی نووسەر لە ژیاننامەدا بایەخدارە، بۆیە دەوترێت ژیاننامە (وەرگێڕانی خود)ە، واتە وەرگێڕانی هەست و بیر و بابەتە شاراوەکانی نێو دەروون و بیر بە هۆی زمانەوە. هەر لەبەر ئەمەشە ژیاننامە زۆرترین و نزیکترین نووسینە، کە بە خودی نووسەرەکەوە نوسابێت و لێی دوورنەکەوێتەوە، چونکە گواستنەوەی سروشتی ڕاستەقینەی نووسەرەکەیە. ئەوەی گومانی تێدا نییە ژیاننامە کەشێکە کەسی تێدا چالاک دەبێت، نووسەر تێیدا وردەکاریی ژیانی بە شێوەیەکی چڕوپڕ دەگێڕێتەوە. زۆرجار هانا دەباتە بەر بەستنەوەی بیرەوەرییە واقیعەکانی وەک هەوڵدانێک بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی لە گێڕانەوەی ژیانی ڕابردوویدا بەدی دەکرێت. تا چەند ئارەزوو و کەسێتی و بیروڕا و ویستەکانی نووسەرەکە کاریگەریی لەسەر نووسینی ژیاننامەکە دەبێت، ئەمەیان بەپێی سروشتی ژیاننامەکە لە لایەک و سروشتی بیرکردنەوەی نووسەرەکە لە لایەکی ترەوە ئەنجام دەدرێت. هەوڵێکی دوو ئەوەندەیی ڕووبەڕووی نووسەر دەبێتەوە، کاتێ دەیەوێ ژیاننامەکەی بنووسێتەوە:

1 - هەوڵێک بە ئاراستەی موڵکایەتی (من) بۆ خودی خۆی و زاڵبوون بەسەریدا.

2 - هەوڵێک بە ئاراستەی دەرەوە (ئەمە بە دوای هەوڵی یەکەمدا دێت و ئەنجامی ئەوە) بۆ ئەوەی وا لە (من) بکات، ڕووبەڕووی جیهان بێتەوە. بۆیە ژیاننامە کۆکردنەوەی کات و شوێنە و بەستنەوەیان بە شێوەیەک کە جیا ناکرێنەوە، هەرچەندە هەندێک بە پێچەوانەوە لە دواترەوە دەست پێ دەکەن، هەندێکیش دەیکەنە گەشتێک لەنێوان کاتی ئێستا و ڕابردوودا.

خودێتی دەنگێکە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئامرازێکە بۆ گواستنەوەی هەموو ئەوەی کۆیە. د. مارف خەزنەدار لەم خاڵەوە نەمرییەکی نەک تەنیا بە خودی خۆی، بەڵکوو بە چەندین کەسایەتی و خەڵکی جۆراوجۆر داوە. لەوەوە ژیاننامەکەی و ڕۆمان بوونەتە دوو جەمسەری یەک بەرهەم (ڕۆژگاری من) ئینسکلۆپیدیایەکی تەواوە، بۆ ژیانی بەشێکی زۆری شاعیر و نووسەران سەرچاوەیەکی بەپێزە. ژیانی ڕووسیای لە دوو بەرگی سێیەم و چوارەم (A-B) نووسیوە کە لە ساڵانی 1960 – 1968 ئەم هەشت ساڵە چڕوپڕەی کە کەسێتییە ڕۆشنبیرییەکەی پتەوتر کردووە. بەشی پێنجەمی دوای هەشت ساڵ ئاوارەیی ناوناوە (کەمێک ئاشتی و برێک هێمنی)، کە هاتووەتەوە نێو ژیانێک جیا لە ژیانی نامۆیی، بۆیە (ڕاهاتن بە ژیانی خۆماڵی لە دوای هەشت ساڵ دووری) کارێکی هەروا ئاسان نەبووە، خۆیشی دەڵێ: (دەمزانی شوێنەواری بۆشایی لە ناخی دەروونمدا بەدی دەکرێ). دەرککردن بە بۆشایی و دەربڕینی هەستەکانی بەم وردییە بەڵگەی مەزنیی د. مارف خەزنەدارن. بەرگی شەشەم کە بۆ (هەرەشەی سیاسی و گەشەی ڕۆشنبیری) ساڵانی نێوان 1975 – 1983 تەرخانکراوە و بەرگی حەفتەم و دوابەرگ بۆ (مەڵبەندێکی دیکەی ژیانم و گەڕانەوە بۆ نیشتمان)ی ساڵانی نێوان 1983 – 1991، واتە د. مارف خەزنەدار دوو جار لە زێدی خۆی دوورکەوتووەتەوە و لەنێو جیهانێکی نامۆ ژیاوە، بەڵام دواڕۆژەکانی ژیانی

ـە باوەشی نیشتمان و خاکەکەیدا بووە، کە دواجار ژیانی
ـەغدایشی جێهێشت و لە باوەشی هەولێر و لەوێشدا
ـەنێو تیشکەکانی ڕووناکیدا ڕووناکی دەبەخشییەوە کە
ـاوەکو ئێستاش شوێنەوارە ڕۆشنییەکانی بەردەوامن لە
ـەخشینەوە.

ـەبێ هەمیشە سوپاسگوزاری د.مارف خەزنەدار بین کە
ـێجگە لە هەموو بەرهەمەکانی تری دوو گەنجینەی پڕ
ـرواری ووشە و هزری بەرزی (مێژووی ئەدەبی کوردی)
ـو (ڕۆژگاری من)ی بە نەتەوەکەی وەک دوو دیاری پڕ
ـە ڕەمز و بەها پێشکەش کردووە، ئەوەندەیشی بەسە کە
خاوەنی ئەم دوو شاکارە نووسینەیە، کە کانیاوئاسا دەکرێ
تێنووێتی چەندین لێکۆڵینەوە و دیراسە و وتار و باس و
خوێندنەوەی هەمەچەشنەی لێکۆڵەر و نووسەران بشکێنێ.



چیرۆك

# سڤێتلانه

مارف خەزنەدار



**(لەم ڕۆژانەدا کەوتمە بەسەرکردنەوەی هەندێك نووسراوی کۆنم، ئەم چیرۆکەم دۆزییەوە، لە ڕۆژی 2ی کانوونی یەکەمی 1967 لە شاری سانت پیترسبۆرگ نووسراوە، لەناو فایلی نووسینەکانم لەبیرکرابوو، بۆ یەکەمین جارە لە دوای 42 ساڵ بەبێ هیچ دەستکارییەك، وەك خۆی بڵاوی دەکەمەوە).**

لە ماوەی ژیانی هاوڕێیەتی و لەپاشاندا بوونیان بە ژن و مێرد، لەگەڵ نینا ڕۆژێ لە ڕۆژان گوێی لەو ژنە نەبووە بە وشەی ((جوان)) وەسفی پیاوێک بکات.

ئەمەی لەبەرئەوە نەبوو، نەوەکو مێردی نووسەری پێی گرژبێ و وابزانێ حەزی لە پیاوێک کردووە، بەڵکو ئەمە جۆر و شێوە و شێوازی قسەکردنی بوو.

لەباتی ئەمە بۆ پیاو سیفەتی ((چاک)) و ((ئازا)) و ((تێگەیشتوو)) و هیی تری لەم بابەتەی بەکار دەهێنا، کەچی بە پێچەوانەوە بۆ ژن هەندێجار لە سینەما و شانۆ و پارک و بازاڕ و شەقامدا سیفەتی ((جوان))ی بەکار دەهێنا، بۆ ئەوەی بە دڵی بوایە، ئەمە کیژۆڵەیەکی بچووک، یان عازەب، یان ژنێکی بەتەمەن بوایە بەلایەوە گرنگ نەبوو.

ئەو ڕۆژە چیرۆکنووسی مێردی نینا سەعات پێنجی پاش نیوەڕۆ گەیشتە نزیک دەرگای ماڵی خۆیان، وەکو گەلێجار ژنە رووسە قەڵەوەکە لەپێش بەرمیلە دارینەکەی سەر عەرەبانە دانیشتبوو.

پەرداخی بیرەی لە دەوری تورومپای بەرمیلەکە ریزکردبوو، دوو سێ کەس چاوەڕوانی ئەوە بوون بیرەی ساردیان بۆ تێبکات.

بیرەخواردنەوەی سەر شەقام بۆنوبەرامەیەکی تایبەتی هەبوو، لەسەر برسییەتی هەندێجار چێژی دەدایە ئەو نووسەرەی، کە هەمیشە بۆ ناوەرۆکێک دەگەڕا، بیکات بە سەرچاوە بۆ نووسینی بەرهەمێکی ئەدەبی.

لە کاتی وادا، ئەگەر نینا هەستی بەوە بکردبوایە هاوسەرەکەی بیرەی خواردووەتەوە، لەگەڵ نانخواردندا، قاپێک شەرابی عەنتابی لەسەر مێزی نانخواردن دادەنا، بە ناوی ئەوەی، ئەگەر مێردەکەشی نەخواتەوە ژنەکە چەند قومێک هەڵدەقوڕێنێ بۆئەوەی خواردنە خۆشەکە بە گیانیان بکەوێ.

بە دەم نانخواردنەوە نینا گوتی:

- ئای لە بیرم چوو پێت بڵێم، ئەمڕۆ ژنێک بۆ کارکردن هاتە لامان، ئەوەندە جوان بوو، نە بکەی و نە بخۆی، تەنیا دەبێ تەماشای سای گەردەنی بکەی، باوەڕبکە وەک لە تۆم بیستووە و قسەیەکی نەستەقی ڕۆژهەڵاتییانە، برای خۆی حەزی لێ دەکات.

گوتم:

- ناوی چییە؟

- سڤێتە، کورتکراوەی سڤێتلانە وەکو دەیزانی.

- واتە ڕووناک.

- بەڵێ، بە ڕاستی ڕووناکە.

هاوین تازەبوو، دەیانگوت وەرزی سەر پلاژ و مەلەوانی دەستی پێ کردووە.

ڕۆژی شەموو بوو، کە نینا لەسەر کار گەڕایەوە ماڵێ، گوتی:

- سڤێتەم بۆ بەیانی بۆ نانخواردن بانگکردووە، سەر لە سبەینێوە لەسەر پلاژ یەکتری دەبینین و پاش مەلەکردن بۆ نانخواردن دێینەوە ماڵی خۆمان.

نووسەر و نینای خێزانی لەسەر پلاژ جێگەی سڤێتەیان دۆزییەوە.

بە مایۆ و سوخمەی مەلەوانی لەژێر چەترێکی ڕەنگاوڕەنگ لەسەر لم پاڵکەوتبوو، کە ئەوانی دی هەڵسایە سەرپێ.

نینا سڤێتەی بە هاوسەری ناساند.

لەو دەمەدا نووسەری بە توانا سڤێتەی وا هاتە بەرچاو، ئەگەر ڕۆدێنی پەیکەرتاشی بلیمەت مۆدێلێکی وەکو سڤێتەی دەست بکەوتبووایە پەیکەرەکان ڕەندتر و جوانتر دەبوون.

ڕەنگە ئەوپەڕی شادی لەوەدا بێ پیاو بۆ یەکەمین جار چاوی بە جوانێک بکەوێ بە جلی مەلە لەسەر ئەو پلاژەی زێی نیڤا لەو جێیەی، کە دەڕژێتە ناو کەنداوی فینلەندەی زەریای بەڵتیق.

مەلە و گەمە و گاڵتەی ناو ئاو، بیرە و ماسی وشککراوی ژێر چەترە ڕەنگاوڕەنگەکە لەگەڵ قسە خۆش و شیرینەکانی سڤێتە تێکەڵ بە یەکتری بوون.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شنەیەکی نەرم و نهێنی نامرادی لە ترووسکەی چاو و پشکووتنی



لێو و هەناسەی، کە لەگەڵ دووکەڵی جگەرە دەهاتە دەرەوە، لە سڤێتەدا بەی دەکرا.
لەوەدەمەدا سڤێتە لای نووسەر، بوو بە هەڵهێن و ئەفسانە و دیاردەیەکی شاراوە، بوو بە سەرچاوەی ئیلهام و سۆز، سۆزێک لەپێناو بەختیاری ئەو.
لەدواییدا، کە بەسەرهاتی سڤێتەی بۆ ئاشکرا بوو سۆزەکەی بەرامبەری گەرمتر بوو.
لە ماڵی نووسەر سێ قۆڵی لە دەوری مێزی خواردەمەنی و ڤۆدکا و کۆنیاک دانیشتن.
- تۆ بەختیاری، لەگەڵ دوو ژنی جواندا نان دەخۆی، ئەگەر بتەوێ دانسیشیان لەگەڵدا دەکەی.
ئەم دانیشتنە بۆ نووسەر تەنیا حەسانەوەیەکی گیانی و ئارامێکی دەروونی و دۆزینەوەی مرۆڤێکی جوان و چاکی وەکو سڤێتە نەبوو، بەڵکو دەستکەوت لەوە گرنگتر و بەنرختر بوو، ئەویش ئەوەیە لێرەدا بە کورتی تۆمار دەکرێ.
سڤێتە تەمەنی پێنج ساڵان بووە، کە باوکی چووە بۆ مەیدانی جەنگی رووس و ئەڵمان (1941).
لەو جەنگەدا نەگەڕاوەتەوە.
دایکی ئەندازیاری هێڵی شەمەندەفەر بووە، دریغی لە پەروەردەکردنی کیژی نەکردووە.
لە دوای کوژرانی مێردی لە مەیدانی جەنگ، شووی نەکردۆتەوە.
لە تەمەنی بیست ساڵیدا، سڤێتە ئامۆژگای چنینی قوماش و تەونی تەواوکردووە، ئینجا شووی بە ئەفسەرێکی ئەندازیاری چەکی سوپایی سووک کردووە.
هێشتا بووکی ناو پەردەی پێنج مانگی بووە، کە مێردیان بۆ کوژاندنەوەی راپەرینەکەی میللەتی هەنگاریا (1956) بردووە، ئەوجا لەپاش ونبوونی مێردی هەتا هەتایە، بە ماوەیەکی کەم دایکیشی کۆچی دوایی کردووە، بەڵام زۆری پێ نەچووە هەواڵی کوژرانی هاوسەریشی پێگەیشتووە، ئیتر بە تاقی تەنیا لەسەر رووی ئەم زەوییە ماوەتەوە.

سڤێتە دەیوت: لە منداڵیدا بەختیار بووم، ئەگەرچی باوکیشم نەبوو، بەڵام هەستم بە هیچ بۆشاییەک نەدەکرد، دایکم بە تێروتەسەلی بەخێوی کردم، هیچ ناخۆشییەک لە ژیانمدا نەبوو، ئەوە ناڵێم لەبەر جوانیم، لاو و هەرزەکار هەندێجار ژیانیان لێم لێڵ دەکرد.
سڤێتە لە جەنگ زۆر دەترسا، باوکی چووە و نەگەڕاوەتەوە، مێردی چووە و نەگەڕاوەتەوە، وای دەزانی دایکیشی لە جەنگدا کۆتایی پێ هاتووە.
لەپاش کوژرانی مێردی بیری لە هەموو شتێک کردۆتەوە، ئەوە نەبێ رۆژێ لە رۆژان جارێکی تر شووبکاتەوە، بەڵام لە دوای چوار ساڵ رۆژگار لە کابرایەک نزیکی کردووەتەوە، دەتوت مێردە کۆنەکەیەتی زیندووبۆتەوە.
بە ئەدگار و ناوەرۆک لەوی دەکرد.
کارگەری زانستی بوو لە بنکەی لێکۆڵینەوەی ئەتۆمی سەر بە ئەکادیمییەی زانستی.
ئەم شووکردنەوەیە وەکو خەو وابوو بەلای سڤێتەوە.
نزیکەی نۆ مانگ لەگەڵ زانای گەنج ژیا.
هەموو جار دەردی دڵی بۆ نووسەری هاورێی هەڵدەرشت، بە زۆری دەیوت: هەر ئەوەندەم چاکە کردووە بەرانبەر بە خۆم، لە سەرەتاوە بڕیارمدا بوو منداڵم نەبێ، بۆئەوەی کەسێکی تر تووشی ئەشکەنجە و ئازاری ژیان نەکەم.
بە ئاهـ و هەناسەی قووڵەوە، سڤێتلانە بە دەنگێکی کزی نووساو دەیوت:
- شەوێک هاتن بردیان، نە شەوی و نە دووسبەی نەگەڕایەوە، تا ئێستاش ئەوە چوار ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە و نەگەڕاوەتەوە، ناشگەڕێتەوە، ئەو دەسگا تیرۆرییەی ((کا گی بێ))ی پێ دەڵێن، ئەوەی بچێتە ناویەوە نایەتە دەرەوە.
لەو رۆژنەدا سڤێتە لە تەمەنی بیست و هەشت ساڵیدا بوو، بەڵام لە کچی بیست ساڵی دەکرد، دوو شووی کردبوو، لەگەڵ هەردووکیاندا ساڵێک و سێ مانگ ژیابوو.
نووسەر و نینای خێزانی ئارەزووی ئەوەیان دەکرد سڤێتە هاورێ و دۆستیان بێ، حەزیان دەکرد هاوسەرێکی بۆ پەیدا بکرێ، بەمە خۆی ئاسوودە دەبێ و ئەوانیش لە هەندێ تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی رزگارییان دەبێ.
ژنێکی یەکجار جوان و ناسک و لەڕووی وەکو سڤێتە

لەلایەن ئەو ژن و مێردەوە پارێزگاری نەدەکرا.
خۆی مەیلی بۆ پیاو نەبوو، ئارەزووی شووکردنەوەی نەدەکرد، بۆیە ئەوان هەوڵیان دەدا، ئەگەر ئەویان لەگەڵدا بووایە ڕێگەیان بۆ هاوڕێکانیان خۆش نەدەکرد، چاویان پێی بکەوێ، چونکە کەم پیاو هەبوو لە کۆمەڵێکی ئەورووپاییدا سفێتەی دیتبووایە گیرۆدەی نەبوایە و دڵی بۆی خورپەی نەکردبوایە، خۆشی ئەوەی پێ خۆش بوو، هەر لەبەرئەوەش بوو لە هەندێ لە پیاسەکانیان نینا لەلای ڕاست قۆڵی دەکرد بە قۆڵی نووسەری مێردی و سفێتەش لە لای چەپ، ئەمە دیمەنێکی ئاسایی بوو.
نزیکەی شەش مانگ بەسەر هاوڕێیەتی بنەماڵەی نووسەر و نینا تێپەڕیبوو، لەگەڵ سفێتەی جواندا.
جەژنی لەدایکبوونی نینا نزیکبوو، بڕیاریان دابوو بە سێ قۆڵی پێشوازی ئەم جەژنە بکەن، سفێتە حەزی نەدەکرد کەسی چوارەمیان لەگەڵدا بێ.
سەرەتای مانگی کانوونی یەکەم بوو، ئەو زستانە سارد و وشک و بەفری زۆر بوو، بەمجۆرە زستانەیان دەوت ((زستانی ڕووسی)).
دروستکردنی خواردن بۆ سێ کەس کارێکی قورس نەبوو. شەمپانیا و کۆنیاکی گورجی پێنج ئەستێرەیان لەسەر مێزی نانخواردن دانا.
هەندێ زەلاتەی ڕووسی بە گۆشتی مریشک و ماسییەکی فارشیرۆڤی، نەخشی مێزی خواردنیان کێشا بوو.
ئەم خواردنە بریتییە لەوەی ماسییەکە دەگروون، گۆشتەکەی لە ئێسقان جیا دەکەنەوە، ئینجا قیمەی دەکەن، بە سیر و پیاز و بەهارات سووری دەکەنەوە و گۆشتەکە لەناو پێستەی ماسییەکە دەکەنەوە و بە تاڵی کەرەوز دەیدوورنەوە و جارێکی تر سووری دەکەنەوە.
خواردنەوە و خواردن لەسەرخۆ، قسەی هێمن و خۆش، دانسی نەرم و وردی ڕۆمانتیکییانە، سێ کوچکەی لە عالەمی واقیع بۆ عالەمی خەیاڵ بردبووە دەرەوە و لە تەنگوچەڵەمەی و ناسۆری ژیان دووری خستبوونەوە.
نووسەر و نینا دەیانزانی بیر لە چی دەکەنەوە، بەڵام نەیان دەزانی سفێتە بیر لە چی دەکاتەوە.
لەم دانیشتنەدا زۆر لەسەرخۆ و کەمدووبوو، جلی جوان و ڕازاوەی لەبەرکردبوو، بەڵام سووراو و ئارایشی نەکردبوو، دەیوت:
- ئەمە لەبەر جوانی نییە، هەر بە سروشت حەز لە ماکیاژ ناکەم.
نینا بە گاڵتەوە پێی دەوت:
- دەزانم ماکیاژ ناکەی، بەڵام لەبەر من دەبوو بیکەی، چونکە جەژنی لەدایکبوونی منە.
- نابینی لەبەر تۆ جلی جوانم لەبەر کردووە!
ئیتر هەموو خەندە و سۆز و پاکی و مرۆڤایەتی بوو، سێ چوار سەعات لەم کونجی نادیارییەدا ژیان و کاتێکی خۆشیان بەسەربرد، ئینجا ڕوویان کردە دەرەوە، ناو بەفر و سەهۆڵبەندان، بەرەو میترۆ کەوتنە ڕێ.
دەبوو نینا بگەیەننە ماڵی دایکی، چونکە بۆ ڕۆژی دوایی بۆ ڕێکخستنی ناوماڵ و بۆ پێشوازی ئاهەنگی سەری ساڵ یارمەتی دایکی دەدا.
بەمجۆرە گەیشتنە ماڵی دایکی نینا، لەوێ چایەی ڕووسییان خواردەوە.
نینا لای دایکی مایەوە، نووسەر و سفێتەش دیسانەوە کەوتنە ناو میترۆ.
لە نزیک ماڵیان هاتنە خوارەوە، بە دەستووری ئەوان وەکو هەموو جارێک دەبوو سفێتە تا بەر دەرگای ماڵیان بەڕێ بکرێ.
لەم کاتەدا نووسەر نەیدەزانی بیر لە چی دەکاتەوە، هەروەها سفێتەش نەیدەزانی بیر لە چی دەکاتەوە، هەر یەکێکیش لە هەردووکیان لە هاوڕێکەی نەدەپرسی بیر لە چی دەکاتەوە، تا گەیشتنە بەر دەرگای گشتی باڵەخانەکە.
دوو سێ جاری تریش لەوە پێش تا بەر ئەو دەرگایە بەڕێی کردبوو.
لەوێ وەستا بۆئەوەی ماڵئاوایی لێ بکات، بەڵام هەڵوێستی ئەو بەبێ ئەوەی قسە بکات، ئەوەی دەگەیاند نووسەر بچێتە ژوورەوە.
تا بن داڵانەکە دەستی گرت، نووسەر هێشتا بە تەمای ئەوە بوو پشتی تێبکات، کەچی نەیزانی چی هێزێک پاڵی پێوەنا بە قسەی بکات، چونکە ئەوەندە سۆزی بەرانبەری بەهێزبوو بەزەیی پێدا دەهاتەوە، وای دەزانی، ئەگەر



بە قسەی نەکات، تاوانێک بەرانبەری دەکات.
هەموو شت هێمن، هەموو شت نەرم، هەموو شت ورد، کشومات بوو، دەنگی هەناسە دەهات.
لە پێپلیکانەکان چوونە سەرەوە، دەنگی پێیان نەدەهات.
سفێتە دەرگای کردەوە، گڵۆپی هۆڵی داگیرساند، بەرەو تاکە ژووری ماڵەکە چوون، تاریک بوو، هەناسەی لە هەناسەی نووسەر نزیککردەوە، چاوی لێڵ بوو، پەیکەری ناسک و بێگەرد، ئەوەی لەسەر پلاژ پێنج شەش مانگ لەمەوبەر چاوی پێی کەوتبوو.
ئەمجارەیان ئاوەڵکراسی نایلۆن، لەسەر ئەو کراسی ئاوریشمی پەمەیی، ئینجا چاکەتی خوری مۆر، لەسەر ئەویشەوە پاڵتۆی خۆڵەمێشی تووکنی رووسی، ملپێچی فەروو، کڵاوی تووکنی سبیری.
سفێتە لەناو ئەم هەموو جلوبەرگە نقووم بوو بوو، تەنیا چاوە گەورە جوانەکانی دیار بوون.
سفێتە لەو دەمەدا لەو مرواریيە بێگەردەی دەکرد، کە پیرێژنی سەد ساڵە لە باپیری بۆی مابووەوە و لە سەد پریاسکەی پێچابوو.
پیرێژن ئەوەندە مرواریيەکەی خۆش دەویست لە هەموو ژیانیدا سێ چوار جار لەم هەموو پریاسکانە دەری هێنابوو، بۆئەوەی بە بینینی مرواریيە خۆشەویستەکەی شادبێ، بەڵام نووسەر لە هەموو ژیانیدا تەنیا جارێک گیانی لەگەڵ گیانی سفێتە تێکەڵ بە یەکتری بوون.
ئەو دەیزانی سفێتەی خۆشدەوێ، بەڵام نەیدەزانی سفێتەش ئەوی خۆشدەوێ. بەیانی زوو لە خەو هەڵسا و بە ئەسپایی خۆی گۆڕی و چووە دەرەوە.
ئێوارە، کە نینا گەڕایەوە ماڵێ، لە هاوسەری پرسی:
- دوێنێ تا کوێ سفێتەت بەڕێکرد؟
- تا بەر دەرگای ماڵیان.
- سەیرە ئەمڕۆ نەهاتبوو بۆ سەر کار.
- نازانم.
چوار ڕۆژ سفێتە نەچووبووە سەر کار، ئەوجا ڕووی کردبووە ئەوێ بۆ ماڵئاوایی دوایی.
کارگێڕی و هەموو مووچەخۆرانی دیبوو، دەستی لە ملی نینا کردبوو، بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە داوای لێکردبوو لێی ببوورێ، ئیتر پشتی لە خەڵکەکە کردبوو، هەر چەند کردبوویان شتێک لە دوارۆژییەوە بزانن، بەڵام هیچی پێ نەوتبوون.
لەپاش چەند ڕۆژێک نینا چووبووە ماڵیان بۆئەوەی سۆراخی بزانێ، هاوسێکانی وتبوویان سفێتە باری کرد، بەبێئەوەی بە کەس بڵێ بۆ کوێ.




# دکتۆر مارف خەزنەدار و کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی بیرەوەری و چەند ڕامانێک

محەمەد عەبدولڕەحمان مێرگەیی

ساڵی خوێندنی 1995-1994 قوتابی قۆناغی سێیەم بووم لە بەشی کوردی کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین. خوالێخۆشبوو د. مارف خەزنەدار وانەی (ئەدەبی بەراورد)ی پێگوتین. شێوازێکی وانەبێژیی تایبەت بەخۆی هەبوو، هەر قوتابییەک بە چاکی گوێگری بابەتەکەی بوایە زۆر سوودی وەردەگرت و دەردەچوو. ئەوکات من وەک پێویست خەزنەدارم نەدەناسی و زانیاری تەواوم لەبارەی زانست و نووسینەکانییەوە نەبوو. لە ساڵی 2009 خولیا و ئارەزووی زۆرم لادروستبوو هەر حەوت بەرگەکەی کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)ی د. مارف خەزنەدار بخوێنمەوە، بەڵام بۆم نەلوا و لەبەر سەرقاڵییەکانی ژیان نەمتوانی بپرژێمە سەر جێبەجێکردنی ئەو حەزی خوێندنەوەیەی بە نیازی بووم. ئەمە هەر مایەوە هەتاکو ساڵی 2015 ئەوکاتەی بوومە خوێندکاری خوێندنی ماستەر لە زانکۆی وان. لە پشووی پێش کۆرسی دووەم و بە تەواوی لە ڕێکەوتی 30/ی حوزەیرانی 2015 لە هەولێر ناوی خوام لێهێنا و دەستم کرد بە خوێندنەوەی بەرگی یەکەم و بەردەوام بووم لە خوێندنەوەی بەرگەکانی دیکەش هەتا لە ڕێکەوتی 31/ی کانوونی یەکەمی 2015 لە باژێری وان کۆتاییم بە خوێندنەوەی بەرگی حەوتەمیش هێنا، ئەوەبوو لە ماوەی ئەو حەوت مانگەدا هەر حەوت بەرگی کتێبەکەم خوێندەوە. وێڕای دڵخۆشبوونم بە هاتنەدی ئارەزووی چەند ساڵەم و تاموچێژی کردەی خوێندنەوەکە، سوودێکی زۆرم لە زانیارییەکانی دووتوویی تەواوی بەرگەکانی کتێبەکە وەرگرت و خۆشەویستیم بۆ شیعری کلاسیک بە تایبەت و ئەدەبیاتی کوردی بە گشتی زۆر زیدەتر بوو، هەروەها بێشک مەزنی و بەرزیی دکتۆر مارف خەزنەداریشم لەبەرچاو ڕوونتر بوو و تێگەیشتم کە ئەو مرۆڤە زانایە چ خزمەتێکی گەورە و مێژوویی پێشکەش بە نەتەوەکەی خۆی کردووە. لەمیانی خوێندنەوەکەدا بە پێنووسێک گەلێک ڕامان و سەرنجی گشتی خۆمم لەسەر لاپەڕەکان دەستنیشان دەکرد؛ بۆئەوەی لە کاتی پێویستدا بەئاسانی بگەڕێمەوە سەریان. بەو هیوایەی لەم گوتارەدا گەر زۆر بەخێراییش بێت بکارم تیشک بخەمە سەر هەندێ لە لایەنەکانی هەر حەوت بەرگی ئەم کتێبە پڕبایەخە.

سەرەتا هەروەکو لە پێشەکی بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا ئاماژەی بەمە داوە، بەلای خەزنەدارەوە گشت ئەو بەرهەمانەی لەم کتێبەدا بە نموونە هێنراون (بەرزترین قسەی جوانی زمانی کوردین)، واتە مێژووی ئەدەبی کوردی بریتییە لە (مێژووی قسەی جوانی کوردی). هەر حەوت بەرگی ئەم کتێبە وەکو دانەرەکەی مەبەستی بووە؛ بە میتۆد و ڕێبازێکی تایبەتی وەها نووسراوە، کە وا بە شێوازی سەرچاوەیەکی (قوتابخانەیی، زانستگایی، ئەکادیمییانە، فەرهەنگییانە و ئینسکلۆپیدیانە) بێت. هەروەک دکتۆر مارف خەزنەدار خۆی باسی لێوە کردووە، ساڵانێکی زۆری تەمەنی هەر (لە ساڵی 1968ەوە تاکو ساڵی 1988) خەریکی کۆکردنەوە و ساغکردنەوە و نووسینەوەی بووە.

دەتوانم بڵێم ئەم بەرهەمە تاکە سەرچاوەیە لەبارەی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە بەو شێوازە زانستیی و فراوانە و لە دووتوێی زیاتر لە چوار هەزار و سەد لاپەڕەدا نووسرابێت. تا حاڵی حازر لە گشت سەرچاوەکانی دیکەی مێژووی ویژەی کوردی زانستیی تر و چڕوپڕترە.

لە بەرگی یەکەمدا خەزنەدار دوو سەد لاپەڕەی تەرخان کردووە بۆ باسەکانی وەکو: مێژووی نەتەوەی کورد، جوگرافیای کوردستان، ئایین و ژیانی کۆمەڵایەتی، ژیانی خوێندەواری و ڕۆشنبیری، دەستنووس، کوردناسی و زمان، ڕۆژنامەگەریی، ئەدەبی کۆن و نەنووسراو... تد.

لەم کتێبەدا بەدرێژی باسی ژیان و (ناوەڕۆک و ڕوخسار)ی بەرهەمی زۆربەی زۆری شاعیرانی کوردی سەر بە زۆربەی شێوەزارەکانی زمانی کوردی کراوە، لەوانەش بیستوسێ شاعیری شێوەزاری کرمانجی سەروو، هەروەها شاعیرە بەناوبانگەکان زۆرترینیان لەبارەوە نووسراوە. بۆ نموونە لە بەرگی دووەمدا، خەزنەدار هەشتاوچوار لاپەڕەی بۆ ئەحمەدی خانی (1650-

1707) تەرخان کردووە و لە بەرگی سێیەمدا نۆوەد لاپەڕەی لەبارەی نالییەوە (1800-1877) نووسیوە. لەلایەکی دیکەوە باسی ژیان و بەرهەمی هەندێک شاعیر و نووسەر کراوە کە وا خوێنەر پێشتر پێیان ئاشنانەبووە و بەلایەوە ناسراونەبوونە.

لەسەر ئەو بنەمایەی (مەدەنیەتی ئیسلامی) کاریگەری هەبووە لەسەر ئەدەبیات و ویژەی کوردی، خەزنەدار لەبەر ڕۆشنایی ئەم باوەڕەدا ئەم مێژووی ئەدەبی کوردییەی نووسیوەتەوە و ئاماژەی بەوە داوە ئەدەبی کوردی بە دوو شێواز خۆی پیشان دەدات، یەکیان خۆماڵیی ئەویش (شیعری لیریکی و چیرۆکی شیعرییە) و شێوەکەی دیکەش لە ئەنجامی لێکدانی مەدەنیەتی کورد خۆی و هەر سێ نەتەوەی دراوسێی (عەرەب، فارس، تورک) و بە هۆکاری ئایینی موسڵمان دروستبووە، ئەمیش بریتییە لە (غەزەل و قەسیدە). (بڕوانە: بەرگی یەکەم، لاپەڕە 181 و 202)

بەلای خەزنەدار شیعر بەرهەمێکە تەعریف ناکرێت، ژیانی ئادەمیزادیش بەبێ شیعر نابێت و لە بنەڕەتدا شیعر خۆی دروستکردن و خولّقاندن و داهێنانە، جوانکاریی و گیانی هونەریی کردوویەتی بە بەرهەمێکی وەها بە شێوەیەک بێت کە چێژ و ئەندێشەی مرۆڤ دەجووڵێنێت و بۆ گشت شوێن و چاخ و ڕۆژگارێک دەگونجێت.

خەزنەدار باوەڕی وایە بەرهەمی جوان و ڕەسەن بە کامڵی لەدایک دەبێت، ئینجا ئەمە لە هەر قۆناغێکی تەمەن و ژیانی شاعیردا بێت. خەزنەدار ئەو تیۆرییە بە هەڵە دەزانێت کە پێی وایە شاعیر وەک زانا؛ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ توانا و بڕستی لە دانان و هۆنینەوەی شیعردا بەرەو زیاتر دەچێت، بەڵکو گشت شیعرێکی بەرز بە کامڵی دێتەبوون و جا چ لە وەختی تەمەنی گەنجیەتی شاعیردا بێت، یاخود لە تەمەن و ڕۆژگاری پیریدا بێت.

بە هەمان شێوە خەزنەدار پێی وایە بەهرەی هونەریی و خەیاڵی شیعریی، پەیوەندییەکی ئەوتۆیان نییە بە پلە و ڕادەی خوێندەوارییەوە. هەروەک هونەر زێدەتر پەیوەندی هەیە بە چێژ و خەیاڵەوە و کەمتر پەیوەندی هەیە بە ڕاستیی و لۆژیک، هەروەها داهێنانی هونەریی و ئەدەبیی دوور لە تیۆریی زانستییە و بەهرەی داهێنانی هونەر هیچ چەشنە سنوور و مەرج و ڕێسا و دەستوورێکی بۆ نییە.

خەزنەدار باوەڕی وایە مەبەستی سەرەکی لە گشت داهێنانێکی هونەریی و ئەدەبی ئەوەیە لەو قاوغ و چوارچێوەیەی بۆی دانراوە بچێتە دەرەوە و ببێ بە موتڵەق. داهێنانی ئەدەبییش بۆ هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵە، نەوەک تەنها بۆ گرووپێک و توێژێکی دیاریکراوی ناو جڤاکێک. سەبارەت بە پەیوەندی ئەدەب بە سیاسەتەوە، خەزنەدار بۆچوونی وایە ئەدەب لە سیاسەت گوشادتر و مەزنترە و داهێنانی ئەدەبیی و هونەریی بەبێ سیاسەت سەردەگرێت، بەڵام ئەو بەرهەمەی ناوئاخنی سیاسی و ئایدیۆلۆژی هەبێت، بەبێ جوانکاریی سەرناگرێت.

بۆیە داهێنان لە شیعری سیاسیدا پێویستی بە شاعیری لێزان و وەستا هەیە، چونکە ئەو شاعیرە کاتێک ئیلهام لە دیاردە و ڕووداوێک وەردەگرێت و پارچەشیعرێکی بۆ دەهۆنێتەوە، ڕەنگە ئەم دیاردەیە زوو یان درەنگ بە خراپە بگەڕێتەوە، ئەودەمەش دەبێت بە دروشمێکی سیاسی ڕۆژانەی بێتام. خەزنەدار پێداگیری لەوەدەکات کە دەبێت وەها حسێب لەگەڵ بەرهەمی ئەدەبیی بکرێت بە جۆرێک تەنها لە ڕووی هونەرییەوە بێت و هیچ پەیوەندییەکی بە ئایدیۆلۆژییەتی نووسەرەکەوە نەبێت. (ب5، ل274، ل436، ، ب6، ل392، ل414، ل647، ب7، ل72، ل212، ل274، ل325، ل341، ل469، ل505، ل697، ل704)

لەبارەی کاریگەریی زێدەتری شیعر لەچاو پەخشانەوە، خەزنەدار پێی وایە بۆ نموونە ئەگەر لیریکی (لەخەوهەڵسن)ی ئەحمەد موختار جاف 1935-1898، کە وا لە سییەکانی سەدەی بیستەم بووە بە سروودی وریابوونەوە و بانگەوازی خوێندەواری و کوردایەتی، لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ئەگەر شاعیر بە پەخشان بینووسیایە، ئەوا کاریگەرییەکی وەهای نەدەبوو و ئاوری لێ نەدەدرایەوە. (ب5، ل488-487)

جێی سەرنجە خەزنەدار ئەگەر یەک تاقە دێرەشیعری شاعیرێکی لەبەردەست دابووبێت و بەلایەوە جوان بووبێت، ئەوا ئاماژەی پێداوە و بە نازدار وەسفی کردووە. بۆ نموونە لە بەرگی سێیەم و لە بەشی چوارەمدا،



لە باسی شیعری کێشی عەرووزی لە پێش نالیدا، دەبینین سەبارەت بە دێرەشیعرێکی مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی 1747-1806 خەزنەدار نووسیویەتی: ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە (دێرەشیعرێکی نازدار)مان لەبەردەستدایە و سەرچاوەکان دەڵێن ئەم شیعرە لە بەرهەمی نووسەری ناوداری کورد بێتووشییە، دێرەکەش ئەمەیە:

لە دیباجەی کیتابی حوسنی عالەم هەر وەرەق لادەم
دەبینم مەبحەسی وەسفت لە هەر فەسڵێ و لە هەر بابێ (ب3، ل53)

بە هەمان شێوە خەزنەدار باوەڕی وایە ئەگەر شاعیرێک تەنها یەک تاقە شیعری هەبووبێت، بەڵام شیعرەکە بە پێوەرەکانی جوانیی جوانبێت، ئەوا ئەو شاعیرە بە شاعیرێکی مەزن دادەنرێت، بۆ نموونە لە بەرگی پێنجەم و لە باسی شوکری فەزڵی 1882-1926 و شیعرەکەی بۆ شێخ مەحموودی گوتووە بە ناوی (ئیش کە ڕووی ئێستە لە هەورازە سەرەوژێری نەکەی)، خەزنەدار دەڵێت: ئەم تاکە شیعرە شەش دێرییە؛ گێتییەکی گەورەی بێپایانە، ئەوەندە بەنرخ و بەبەهایە، ئەگەر شوکری فەزڵی شیعری دیکەی نەبوایە و تەنیا ئەم شیعرەی هەبوایە، بەم شەش دێرە بە شاعیرێکی گەورە دەکەوتە بەرچاو. (ب5، ل421، 436)

هەر لەمەڕ بە لووتکەبوونی جوانیی یەک دێرەوە، ئەوەتە بیریار و ئەدەبناس خوالێخۆشبوو مەسعوود محەمەدیش (1919-2002) لە بەرانبەر ئەم دێرەی نالی کە دەڵێت:

ثوبووتت باعیثی نەفیی منە، وەک لامی زولفەینت
لە هەردوولا قەدت بگرێتە ناو، وەک «لامەلفلا» بێ

لە شەرحەکەیدا ئەوەندە پێی سەرسام و شاگەشکە بووە هەتا ئەوەی بارتەقای چەندین غەزەل و قەسیدەی دادەنێت. وەکو لە کتێبەکەیدا (دەستەودامانی نالی، لاپەڕە211) نووسیویەتی: (ئەم بەیتە یەکێکە لە هەرە هەرە هەرە دەگمەنەکانی هەڵبەستی عالەمی ئیسلام، ماڵم حەقە، بەیتێکە چەندین غەزەل و قەسیدە دەهێنێ).

لەبارەی شیعرییەتی دەقێکی جوان و پەیوەندی بە کێش و قافیەوە، بۆ نموونە لە بەرگی حەوتەم و لە باسی کاکەی فەللاح 1920-1990، خەزنەدار دەڵێت: شاعیر بەشداری بەرچاوی هەبووە لە دەوڵەمەندکردنی شیعری نوێی کوردیدا و لەو لیریکەی بە ناوی (بۆچی نابێ) کە وا لەسەر کێشی هەشت بڕگەییە و چوار پێنج قافیەی تێدا بەکارهێناوە، کاتێک شاعیر لەو شیعرەیدا بە دلبەر دەڵێت: لەبەر ئەوەیە من خۆم خۆشدەوێت، چونکە تۆم خۆشدەوێت، بە واتای ئەوەی ئەگەر دلبەری خۆش نەویستایە؛ خۆی خۆش نەدەویست. خەزنەدار دەڵێت: ئەگەر ئەم بیرەی شاعیر کاکەی فەللاح لەناو قاڵبی کێش و قافیەشدا نەبێت، ئەوە هەر شیعرە. (ب7، ل614-613)

سەبارەت بە پەیوەندی شیعر بە ئەوینەوە، پێچەوانەی بیروڕای موفتی پێنجوێنی 1881-1952 لەو شیعرەی دژی دڵداری دایناوە: خەزنەدار دەڵێت: شیعر بێ دڵداری نابێت، ئەڤین ماک و سەرچاوەی بنچینەیی و لەبننەهاتووی ئەدەب و هونەرە. بێجگە لە باسەکانی کەموکوڕی کۆمەڵگە و پرسی نەتەوەیی و کێشەی چینایەتی، گشت ئەو شاعیرانەی وەسف و ستاییشی کیژی جوانیان کردووە، ئەوانیش شاعیری دیارن. وەک خەزنەدار لە جێی دیکەدا دەڵێت: لەناو کورداندا کچی جوان زۆرە و تەنانەت شاعیرانی کرمانجی سەروو، هەمیشە جوانی ژنیان بە دەوڵەمەندیی چوواندووە. لە بەرانبەریشدا بێگومان ئەدەبی کوردی هەناسەی بەهێز و گەرمی لە بزووتنەوەی سۆفیزم وەرگرتووە. (ب6، ل148-147، ل189، ل273، ب7، ل197)

دەربارەی لاساییکردنەوەی شاعیرێک بۆ شاعیرێکی دیکە، خەزنەدار بە ئیسناف و (دادمەندیی)ەوە لەم لایەنە دەڕوانێت و بە چاوی نزم تەماشای شاعیری لاساییکەرەوە ناکات، بەڵکو وێڕای ئاماژەدان بە لاساییکردنەوەکەی،

هەمانكات تیشك دەخاتە سەر لایەنە جوانە و داهێنانەكانی ئەویش. لەم بارەوە ئاماژە بە دوو نموونە دەدەم. وەك ئاشكرایە زۆر شاعیری كلاسیك هاتوون لاسایی نالی-یان كردووەتەوە، یەكێك لەوانە (مەحوی 1906-1831)یە. لە بەرگی چوارەم و لە باسی مەحویدا، خەزنەدار نووسیویەتی قەسیدەی (بەحری نوور) كە وا لە بەرهەمە بەناوبانگەكانی مەحوییە و ڕاستە مەحوییش وەكو كۆمەڵێك شاعیری دیكە بە هەمان كێش و قافیەی نالی لاسایی شیعرە نەعتە بەناوبانگەكەی نالی كردووەتەوە، كە بەم دێڕە دەستی پێ كردووە:

ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا هەتا كەی حیرسی وێرانە
لەگەڵ ئەم عیشقبازانە بڕۆ ئازانە بازانە

وەك خەزنەدار دەڵێت مەحوی نەوەك تەنیا لە كێش و قافیە لاسایی نالی كردووەتەوە، بەڵكو لە مەعنا و وێنە و ڕستە و لێكسیكۆنیش لە دەوری داهێنانەكانی نالی دەخولێتەوە و گەرچی نەگەیشتووەتە پلەی هونەریی نالی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا؛ شاعیرانی دیكە و هەم مەحوییش لە قەسیدەكەیدا وەستایەتی و هونەركاریی و داهێنانی تێدا كردووە. (ب4، ل216-215)

نموونەیەكی دیكە لە بابەتی لاساییكردنەوەی شاعیران، لە بەرگی پێنجەم و باسی مەلا محەمەدی كۆیی (1943-1876) خەزنەدار دەڵێ: ئەگەرچی مەلا محەمەد لاسایی شیعرە میللییەكانی حاجی قادری (1897-1816) كردووەتەوە و شیعری حاجی ڕێبەرێك بوون بۆی، بەڵام مەلا محەمەد وەكو قوتابییەكی زیرەكی حاجییە و بەردەوامبوونی ئەوە، ئەگەر شیعری حاجی لە ڕووی ناوەڕۆكەوە دانایانە و ڕۆشنبیرانەبێت، ئەوا شیعرەكانی مەلا محەمەدیش وەكو ئامۆژگارییە بۆ توێژی نەخوێندەوار و گیانی كوردایەتی لەناو دڵیان هەڵدەقوڵێنێ و هەوڵدەدات ئایین و شەریعەت لەگەڵ پرسی نەتەوەیی كورد بگونجێنێ. (ب5، ل381)

ئەگەرچی خاوەنی كتێب وەكخۆی دەڵێ: ئەم كتێبە بە شێوەیەكە بیروباوەڕی خاوەنەكەی تێیدا ڕەنگدەداتەوە و قسەكانیش تەنیا پەیوەندییان بە نموونە ئەدەبییەكانەوە هەیە، بەڵام دەبینین هەندێجار خەزنەدار لە مێژووی ئەدەب چووەتە دەرەوە و هەندێك بیروباوەڕی كوردپەروەریی و هەڵوێستی نیشتمانیی تایبەتی خۆی لەمەڕ هەندێ پرسی نەتەوەیی كورد دەربڕیوە، بۆ نموونە لە دوو جێگەدا كاتێك باس لە وەرگێڕانێكی (مەم و زین) دەكات بۆ سەر زمانی عەرەبی لەلایەن (محەمەد سەعید ڕەمەزان بۆتی)ی كوردی سووریا، كە وا لە ساڵی 1957 بڵاوی كردووەتەوە، خەزنەدار هەڵوێستی خۆی دەربارەی دۆخی ناهەمواری گەلی كورد لە سووریا دەردەبڕێت و بەمشێوەیە باسی لێوە دەكات: جێی داخە سانسۆری سووریا هەموو ئەو دێڕەشیعرانەی (خانی) كوردایەتی تێدا كردوون لای بردوون و دەستەڵاتی سیاسی ڕازی نەبووە بە بڵاوكردنەوەیان. هەر لەو میانەدا خەزنەدار دەڵێت: بەربەرەكانێكردنی كورد لە سووریا سیاسەتێكی هەمیشەیی و نەگۆڕاوە لەوەتەی سەربەخۆبوونی وڵاتەكە لە دوای جەنگی دووەمی گیتییەوە. (ب2، ل12، ل402، ب6، ل62)

لە جێی دیكەدا ڕەخنە لە شۆڤێنییەتیی عەرەبی دەگرێت و لەبارەی سەركردەیەكی شۆڤێنیی وەكو جەمال عەبدولناسر، خەزنەدار دەڵێت: (ئەو كابرا عەرەبە شۆڤێنییە هەر لە بنەڕەتدا دانی بە مافی تەواوی میللەتی كورد نەهێناوە). (ب6، ل457)

سەبارەت بە ڕووخاندنی كۆماری كوردستان لە مەهاباد، خەزنەدار ڕەخنەی توندی لە دەستەڵاتی سۆڤیەتیی جاران گرتووە و بەم جۆرە باسی ڕووداوەكە دەگێڕێتەوە و بیروباوەڕ و هەڵوێستی خۆی دەردەبڕێت: سوپای ڕووسیای سۆڤیەت، تەشقەڵەیەكی سیاسی نامەردانەی لەگەڵ كوردی ناوچەی موكریان كرد و لەبەر بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیان، سوپای سوور لە ئێران چووە دەرەوە و كۆماری مەهاباد ڕووخێنرا و سەركردەكانی كوردیش لە سێدارەدران. خەزنەدار نووسیویەتی ئەگەرچی ئەمە گەورەترین ڕووداوێك بوو لە مێژووی كوردستانی ئێران و هەموو ناوچەكانی دیكەی كوردستان، بەڵام لە هەمانكاتدا سەرچاوەیەكی گرینگ بوو بۆ هۆشیاركردنەوەی نەتەوەی كورد.



خەزنەدار بە توندی ڕەخنە لە دەستەڵاتی سیاسی ئێران دەگرێت و دەڵێت: هەر لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سەفەوییەوە تا ئێستا بیروڕای بەرانبەر بە کورد نەگۆڕاوە، سیاسەتی گشتی تواندنەوەی کوردە لەناو (پانئێرانیزم). خەزنەدار ئاماژە بەوە دەدات کە وا نەتەوەی کورد لە ئێران سەرەڕای بەربەرەکانی لە ڕووی نەتەوەییەوە، چەوساندنەوەشی وەکو پەیڕەوانی سەر بە ئایینزای سوننە زیاترە. لەگەڵ ئەوەشدا خەزنەدار گەشبینە بەرانبەر بە ئایندەی کورد لە ئێران و دەڵێت: خەڵکی کوردستانی ئێران هۆشیارن، بیروهۆشیان هەمیشە بۆ پارێزگاری ئەدگاری نەتەوەیی و داواکردنی مافی مرۆڤایەتییانە. (ب6، ل17-16)

سەبارەت بە کوردی تورکیا، لە بەرگی شەشەمی کتێبەکەیدا خەزنەدار نووسیویەتی: لە دواساڵانی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستەم، گەلێک ڕێکخراو و پارتی سیاسی و یانە و مەڵبەندی ڕووناکبیری و ئەدەبیی و هونەریی؛ لە کوردستانی تورکیا و شارە گەورەکانی دیکەی تورکیا پەیدابوون و هەریەک لەوانە زۆر ڕۆژنامە و گۆوار و چاپەمەنییان دەرکردووە...، لە بەرانبەریشدا دەستەڵاتی تورکیا جاڕی جەنگی داوە لە دژیان. خەزنەدار دەڵێت: ئەم دەستەڵاتە خەیاڵی خاوە و کورد ئێستا و ئەوساش کۆڵی نەداوە، هەتا ئەمڕۆش خەباتی ڕۆشنبیری و سیاسی ئەو میللەتە ئازادیخوازە بەردەوامە. بەلای خەزنەدارەوە کورد هەمیشەییە و هەر دەمێنێت. (ب6، ل15-14)

سەبارەت بەوەی سەرکردەی کوردان دەبێت چۆنبێت، لە باسی موخلیسی (1985-1910) شاعیردا و لە بابەتی شیعری کوردایەتی، خەزنەدار سەرنج دەخاتە سەر بۆچوونێکی شاعیر و بە هەڵەی دەزانێت، موخلیس لە شیعرێکیدا بە ناوی (کورد) دەڵێت سەرۆکی کورد نابێت بێگانە بێت و سەرۆک ئەگەر خوێنیشت بمژێت، بەڵام مادام کورد بێت باشترە. خەزنەدار ئەم بۆچوونەی شاعیری بەلاوە هەڵەیە و ڕەخنەی لێ دەگرێت و دەڵێت: (شاعیر ڕاستە کە دەڵێ سەرۆک نابێ بێگانە بێ، بەڵام ڕاست نییە کە دەڵێ خوێنمژیش بێ لە بێگانە باشترە، بە پێچەوانەوە لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە ئەگەر دوژمن خراپەت لەگەڵدا بکا ئێشی دەروونی کەمترە لەوەی هاوخوێنت دوژمنایەتیت لەگەڵدا بکات). (ب7، ل194-192)

دەربارەی دەردی دووبەرەکی ناوەخۆوە، خەزنەدار پێی وایە لەناو ئەدەبیشدا ئەوەندەی باس لە دوژمنی دەرەوەی کورد کراوە وەکو هاوسێکان و ئەمپریالیستی جیهانیی، ئەوەندە باس لە دوژمنی ناوەوە نەکراوە، خەزنەدار دەڵێت: بەڕاستی کاریگەریی دووبەرەکی ناوەوە لە دواکەوتن و بەئامانج نەگەیشتنی کورد لە کاریگەریی دوژمنی دەرەوە کەمتر نەبووە. هەر بەم دەردی دووبەرەکی ناوەخۆییە گشت شۆڕش و هەڵسانەکانی دیکەی کورد هاوشێوەی حکوومەتەکەی شێخ مەحموود ڕووخاون. (ب5، ل-455 456)

**هەولێر/ تەمووزی 2023**

**سەرچاوەکان:**

**-1 دکتۆر مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، دووەم، سێیەم، چوارەم، پێنجەم، شەشەم، حەوتەم، چاپی دووەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی 2010.**

**-2 مەسعوود محەمەد، دەستەودامانی نالی، چاپی سێیەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی 2010.**

# مێتۆدناسیی مێژووی ئەدەبی کوردی

**حەمە مەنتك**



د. مارف لەگەڵ کۆمەڵێك لە قوتابییەکانی. دەستەچەپی دانیشتووەکان. سێیەم کەس: حەمە مەنتك، ساڵی ٢٠٠٢

مێژووی ئەدەب، سەرهاتی گەشە و پێشکەوتنی ئەدەبی هەر نەتەوەیەکە بە هەموو هەڵکشان و داکشانەکانییەوە لە مێژوودا، شێوازێکە گوزارشت لەو هۆ و فاکتەرانە دەکات، کە ڕووداو و ژانرە ئەدەبییەکان دێننەکایەوە، یان لەناوی دەبەن. هاوکات مێژووی ئەدەبی هەر نەتەوەیەک ناسنامەی ئەو نەتەوەیەیە. مێژووی ئەدەب، بریتییە لە توێژینەوەیەکی کاتیی کۆمەڵێک دیاردەی ئەدەبی، هاوکات ناسینی دەقەکان و بەراوردکردنیانە. واتە مێژووی ئەدەب خۆی بە جیاکردنەوەی دەقی بنەڕەت و دەقی کۆپییەوە خەریک دەکات، قوتابخانە و بزووتنەوە ئەدەبییەکان پۆلێن دەکات و جۆرەکانیان دیاری دەکات. لە لایەکی دیکەوە پەیوەندی نێوان دەق و ژیانی کۆمەڵایەتی و کولتووری و ئەخلاقی لە کۆمەڵدا دەخاتەڕوو. هەموو ئەمانە بە هاوکاری و لەبەر ڕۆشنایی میتۆدۆلۆژیدا دەکرێن. میتۆدی مێژووی ئەدەب، میتۆدێکە لەسەر بنەمای پلانێک، لە هەمان کاتدا لەگەڵ سروشتی بابەت و توێژەردا بگونجێت. ئەم پلانە بە شێوەیەکی گشتی دەبێت دوو لایەن بێت. یەکەمیان لایەنی ئەدەبییە، وەک ساغکردنەوە و کنەی دەستنووسەکان، لێکدانەوەی ئاماژە و سەرچاوەکان، باسکردنی ژیانی شاعیران و نووسەران، بەراوردی دەقەکان و توێژینەوەی ڕەخنەیی، جودا لە لایەنی زمان و ڕێزمان و ڕێتۆریک. دووەمیان لایەنی زانستی دەگرێتەوە، واتە باسی دەستوەردانی زانستەکان لە پێکهێنانی ئەدەبدا وەک مێژووی فەلسەفە و زانست، کۆمەڵناسی، سیاسەت و دەروونشیکاری.






بە درێژایی مێژوو، چەندین کتێب لەبارەی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە نووسراون و بڵاوکراونەتەوە. ئەنجوومەنی ئەدیبانی کوردی- ئەمین فەیزی بەگ، شیعر و ئەدەبیاتی کوردی- ڕەفیق حیلمی، دیوانا کورمانجیا- عەبدولڕەقیب یووسف و مێژووی ئەدەبی کوردی- سەعید بۆرەکەیی، عەلائوددین سوجادی، دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ و حەوت بەرگەکەی دوکتۆر مارف خەزنەدار. ئەوەی جێی سەرنجە ئەم کتێبەی دوکتۆر مارف پرۆژەیە، لە بنەڕەتدا مێژووی ئەدەبیش دەبێت پرۆژە بێت، چونکە ناکرێت مێژووی ئەدەبی سەتان ساڵ لە کتێبێکدا کورت بکرێتەوە. ئیشکردن لە مێژووی ئەدەبدا فرەڕەهەندە، خۆی قەتیس ناکات لە یەک ڕەهەنددا، کە تەنێ کۆکردنەوە بێت. بۆیەش پرۆژەکە توانیویەتی تا ڕادەیەکی زۆر ئاوڕ لە مێژووی ئەدەبی سەرجەم دیالێکت و ناوچەکانی کوردستانی گەورە بداتەوە.

دوکتۆر مارف، بە شێوەیەکی ورد هەموو ئەو کتێبانەی پێش ئەم پرۆژەیەی لەبارەی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە نووسراون خوێندووەتەوە. ئەم خوێندنەوەیە کۆمەکی باشی کردووە، کە کێماسییەکان دەستنیشان بکات و هەمان هەڵەکانی ئەوان پاتە نەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا لە هێندێک بابەتی میتۆدیدا هەمان شوێنپێی ئەوانی هەڵگرتووە (دواتر باسیان دەکەم). بەڵام ئەوەی جێی داخە بە ڕوونکردنەوەی چەند هۆکارێک دان بەوەدا دەنێت، کە نەیتوانیوە کار لەبارەی مێژووی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە بکات، چونکە ئەگەر ئەم کارەی کردبا، کە دەبوایە بیکات، ئەوا ئەم پرۆژەیەی زۆر سەرکەوتووتر دەبوو. هەرچەند بە خستنەڕووی حەوت پێنت سەرنجی خۆی لەبارەیانەوە دەنووسێت. دواتر لەبەر ڕۆشنایی ئەوانەوە دەست بە نووسینی ئەم پرۆژەیە خۆی دەکات، کە بە بڕوای من لە ڕووی میتۆدییەوە کارێکی زانستی و دروستە.

بە گوێرەی بۆچوونی ڕەخنەگر (حسەین سدیق) لە کتێبی (میتۆدی مێژووی ئەدەب و ئەرکەکەی) بۆ بەکارهێنانی میتۆدی مێژووی ئەدەبی، مێژوونووسی ئەدەب ناچارە دوو قۆناغی لەبەرچاو بێت:

یەکەم: ناسینی ئەو دەقانەی، کە کەرەسە و بابەتی توێژینەوەکەیەتی، واتە دیاریکردنی چوارچێوە و بابەتی توێژینەوەکە، جودا لە هەڵبژاردنی زانستە یارمەتیدەرەکان.

دووەم: خستنەڕووی کۆمەڵێک پرسیار، کە وەڵامەکانیان

دەبن بە بناغەیەک بۆ توێژینەوەکە، بۆ نموونە:

- ئایا ئەو دەقە سەلماندنی ئەو دەقە دروستە، یان نا، یان ئایا دەقەکە بۆ کەسێکی دیکەش دەگەڕێتەوە جودا لەو کەسەی بە خاوەنی دانراوە؟

- ئایا دەقەکە تەواوە؟ هیچ گۆڕین و کەموکورییەکی تێدا نییە؟

- مێژووی دەقەکە کەیە؟ مێژووی پێکهاتەی دەقەکە، نەک تەنیا کاتی بڵاوبوونەوەی.

- دیاریکردنی واتای وشەیی دەقەکە. هاوکات دیاریکردنی پێکهاتەی زمانی و ڕێزمانی دەقەکە لەگەڵ ڕوونکردنەوی پەیوەندییە ناڕوونەکان، ئاماژە مێژووییەکان، یان ئاماژەکانی پەیوەست بە ژیانی نووسەرەکە.

- ڕوونکردنەوەی واتای ئەدەبیی دەقەکە، واتە دیاریکردنی بەهای دەروونی، کۆمەڵایەتی، سۆزداری و هونەرییەکانی. جیاکردنەوەی بەکارهێنانە کەسییەکەی نووسەر بۆ زمان لەگەڵ بەکارهێنانی زمانی باوی سەردەمەکەی.

- دەقی ئەدەبی چۆن دروست بووە؟ بەرهەمی چ جۆرە دۆخێکی کۆمەڵایەتی و دەروونییە؟ داهێنانەکانی لەژێر چ دۆخێکدا هاتوونەتە بەرهەم؟ بەر بڕوای ئەم نووسەرە ژیانی نووسەر ئەمەمان پێدەڵێت.

- نووسەر لە سەردەمی خۆیدا چ سەرکەوتنێکی بە دەستهێناوە؟ چ کاریگەری لەسەر هاوچەرخانی خۆی هەبووە؟

ئەو کەس و کەسانەی خەریکی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبین، پێویستە ئەم پنت و پرسیارانەی سەرەوەیان لەبەرچاو بێت، بۆ ئەوەی بەرچاویان ڕۆشن بێت و بە گوێرەی ئەو مێتۆدە توێژینەوەکەیان بنووسن.

ئەگەر تەماشای مێژووی ئەدەبی کوردی دوکتۆر مارف بکەین، لە ڕاستیدا وەڵامی زۆرێک لەو پرسیارانەی داوەتەوە. پنتێکی زۆر جەوهەری لەم پرۆژەیەدا ئەوەیە لە زۆر شوێن دوکتۆر مارف خۆی بواردووە لەو تێکستانەی کە هێشتا ساغنەکراونەتەوە، یان جێی گومانن، پتر خۆی بەوانەوە خەریککردووە، کە خۆی کاری لەبارەوە کردوون و لە ئەرشیفخانە و دەستنووسخانەکان دۆزیونەتیەوە. ئەم هەوڵە هەرچەندە هەوڵێکی کەسیانەیە، لە بنەڕەتدا دەبوا هەولی کومەلە کەسێک بێت [illegible] لەبارەوە نییە لەم کتێبەی خوێ[illegible] پنتێکی جەوهەرییە، کە مێژوونووسی ئەدەب [illegible] ئەوە بێت، کە هەموو دەقێک، نووسینێک بێ ساغکردنەوە و سەلماندن بایەخی نییە. بەڵام لەوێدا بۆ خوێنەرانی ڕوون نەکردووەتەوە بۆ ئایەخی کردوون؟ لە زۆربەی شوێنەکان بۆ لێکدانەوەی ژیانی لە دایکبوون، یان مردنی شاعیرەکان پەنای بۆ دەقەکان بردووە. هاوکات لە ڕێی لێکدانەوەی ئاماژە مێژوویی و ئەفسانەیی و ئاینییەکانەوە مێژووی نووسین و بڵاوبوونەوەی زۆر دەقمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. واتە بۆ زۆر لایەن هەوڵی توێژینەوە و ڕوونکردنەوەی مێژووی ژیان و دەقی شاعیرەکان دەدات. ئەوەی زۆر دیارە لە ڕووی توێژینەوەی شیعری شاعیران، بۆ هەموان لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە شیعرەکانی ڕاڤە کردووە، کە ئەمەیش لێکدانەوە و توێژینەوەیەکی زۆر کلاسیکیانەیە، چونکە زۆر لایەن و بابەت هەن دەکەونە دەرەوەی ئەم جۆرە لێکدانەوەیە. هەرچەندە لەبابەتی توێژینەوە لە ژیان و بەرهەمی شاعیران، لە زۆر شوێن لایەنگری پێوە دیارە. بۆ نموونە گرنگی زۆری بە ژیان و بەرهەمی نالی داوە، دواتر زۆر گرنگی بە حاجی قادر داوە، لە سەدەی بیستەمیشدا بە پلە یەک گرنگی بە گۆران داوە، بەڵام شاعیرەکانی دیکە زۆر ڕۆتینیانە لەبارەیانەوە توێژینەوەی کردووە. ئەم شێوازە لە ئیشکردنە لایەنی زانستیی کتێبەکە دەخاتە ژێر پرسیارەوە، چونکە توێژەری ئەکادیمی بە پلە یەک دەق دەکاتە سەنگی مەحەک، نەک هەست و بیرکردنەوەی خۆی.

کەواتە ئەم کتێبە لەبەر ڕۆشنایی جۆرێک لە مێتۆد نووسراوە، واتە ئیشکردنەکە بنەمایەکی زانستیانەی هەیە، وەکوو زۆربەی کتێبەکانی پێشتر لەبارەی مێژووی ئەدەبی کوردی نییە، کە لە ڕوانگەیەکی هەستی ئەدەبی و نەتەوەییەوە نووسرابێت. بۆ نموونە زۆر دەق لە مێژووی ئەدەبەکەی بۆرەکەیی هەیە، کە تەنیا بۆ ئەوەی بڵێین کوردیش لە فڵان سەردەم



دەقی هەبووە، چەند دێرەشیعرێک هێنراوەتەوە بەبێ ئەوەی بسەلمێندرێت، یان ساغبکرێتەوە. یان فڵان شاعیر لە فڵان سەردەم هەبووە، بەڵام هیچ سەلماندنێک بۆ ژیان و شیعرەکانی نەکرێت.

ئەوەی جێی داخە ئەو هەوڵەی مێژووی ئەدەبی کوردی، هەوڵێکی تاکەکەسیانەیە، چونکە پرۆژەی مێژووی ئەدەبی کوردی، پرۆژەیەکی دەستەجەمعییە. یەک کەس ناتوانێت بپرژێتە سەر هەموو کارەکان. کارەکانی مێژووی ئەدەب، کارێکی پسپۆرییە، کە بە داخەوە هەموو ئەو کارانەی لەبارەی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە ئەنجام دراون لە دەرەوەی پسپۆرییەوە بوونە (هەرچەندە جێی دەستخۆشییە)، واتە ئەو کەسانەی مێژووی ئەدەبی کوردیان نووسیوەتەوە ئەدیب بوونە، نەک پسپۆری ئەدەب. جودا لە ئەم هەوڵەی دوکتۆر مارف و یەک- دوو هەوڵی دیکە نەبێت. نووسینەوەی مێژووی ئەدەب پێویستی بەوەیە کەسێکی شارەزا لە ساغکردنەوەی دەستنووس و سیپارە، کاری ساغکردنەوە بکات. کەسێکی دیکە پسپۆر بێت لە ژانری شیعر، کەسێکی دیکە پسپۆر بێت لە ژانری گێڕانەوە، کەسێکی تر لە مێژووی کۆمەڵایەتی و کولتووری نەتەوە شارەزا بێت.

هەرچەندە کارەکانی پێشوو بۆ نموونە لە ساغکردنەوەی دیوانی نالی، مامۆستا مودەڕیس و کوڕەکانی شارەزاییان لە زۆر بواردا هەبوو، بەڵام دەبینی دیوانەکە سەتان کەموکوڕی تێدا بوو، دواتر مامۆستا مەسعوود محەمەد بە دوو کتێب باسیکردن. بۆیەیش مێژووی ئەدەبی کوردی دوکتۆر مارف جودا لەوەی هەوڵێکی گرنگە، بەڵام زۆرێک لە زانیارییەکانی ناوی زانیاری گشتی و پاتەبووەوەن. ئەوەی لە بارەی مێژوو، جوگرافیا، ئایینی کوردەوە زۆر ورد نین و ئارگیومێنتی زانستیان لە پشتەوە نین، هێڵی گشتیین. هەموو کەسێک ئەزانێت مرۆڤی ئیاندەرتاڵ لە شاندەر ژیاوە، بەڵام ئەم مرۆڤانە چۆن ژیاون، فۆرمی ژیانیان؟ ئایا زمانی قسەکردنیان هەبووە؟ واتە زانیارییەکان پێویستییان بە وردەکاری پتر بوو.

ئەم پرۆژەیە هەوڵێکی زۆرباشە بۆ کۆکردنەوەی ژیان و شیعری دەیان شاعیری کورد، دەتوانین وەکوو دائیرەتولمەعاریفێک سەیری بکەین. هاوکات لەم ڕووەوە هێندێک جار سووکەئاوڕێکی لە لایەنی ڕۆژنامەگەری، چیرۆک و پەخشان بە گشتی داوەتەوە. زاڵبوونی هەژموونی شیعر لە خوێنی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتدایە. شیعر تاکە ژانری دڵخوازی کوردانە. ئەمە ڕێک کۆمارەکەی ئەفلاتوونمان بیر دەخاتەوە، کە لەو سەردەمیش شیعر هەژموونداربوو. ئەم فەیلەسووفە بە کۆمەڵێک پاساو دژ بە شیعر دەوەستێتەوە، بەڵام پاساوی هەرە سەرەکی بریتییە لە گەڕاندنەوەی شکۆ بۆ عەقڵ و فەلسەفە. ئەو دەیەوێت فەلسەفە بایەخی هەبێت، فەلسەفە خەڵک ئاراستە بکات. وەکوو لە سەرەوەیش باسم کرد، کۆی ئەوانەی خۆیان لە قەرەی مێژووی ئەدەبی کوردی داوە، تەنێ خۆیان بە کۆکردنەوەی ژیان و شیعری شاعیران خەریک کردووە. دوکتۆر مارف، چەند هەنگاوێک لە پێش ئەوانەوەیە، بەوەی لەبارەی شیعرەکانیشەوە نووسیویەتی. ئەدۆنیس لە کتێبی (شیعرییەتی عەرەبی)دا پێداگری لەسەر پێوەندی نێوان شیعر و کولتووری بیستن دەکاتەوە، بەوەی شیعری کۆن، یان جاهیلی، شیعرێکە لە ڕێگەی گێڕانەوەوە بە ئێمە گەیشتووە، واتە لە ڕێگەی یادەوەریمانەوە گەیشتووە بە ئێمە. تا ماوەیەکی زۆریش ئەدەبی کوردی بە تایبەتی شیعری کوردی لە ڕێی زارەکییەوە بە ئێمە گەیشتووە، ساغکردنەوە و ئیشکردن لەبارەی ئەو شیعرانە بەڵگەی یەکلاکەرەوە و ئارکیۆلۆژی دەوێت.

دەق و ڕەختە

# چیرۆکی ((ئێوە قارەمانن))ی مارف خەزنەدار

وەك نموونەیەکی جوانی چیرۆکی جەنگ لە ئەدەبی کوردیدا

سابیر ڕەشید



هەموو جەنگە گەورەکانی دنیا، ڕەوا و ناڕەوا کاریگەریی خۆیان کردووەتە سەر ئەدەبی ئەم میللەتانە کە جەنگی لێ بووە، چ لە نێوان دوو وڵات و دوو میللەت و چ جەنگە ناوخۆییەکان. هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیش دوای خۆیان دەیان ڕێبازی ئەدەبی و ڕێچکەی نوێ و بیرکردنەوەی نوێیان هێناوەتە ناو گۆڕەپانی ئەدەبی ئەم میللەتانە. لە ئەدەبدا ڕەنگدانەوەی کردووەتە سەر شیعر و چیرۆک و ڕۆمان و سینەما و شانۆ و گۆرانی و هەموو بزاڤێکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری گەلان.

لە چیرۆکی میللەتاندا ئەدەبیاتی جەنگ وێنەی ئەرێنی و نەرێنی جەنگی گەیاندووەتە خوێنەران، چونکە هەندێک لە دیمەنەکانی جەنگ کە دەگوازرێنەوە بۆ نێو چیرۆک و ڕۆمان ئەوەندە جوان و بەرز و دلڕفێنن، دەبن بە سیما و ئەدگار و ئاماژەکانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی و هەندێک جاریش پێچەوانەکەیشی هەر ڕاستە، ئەم دیمەنانە نیشاندانی لایەنە ناشیرین و وێنە شوومەکەی شەڕە و ئەوەندە بە قێزەوەنی نمایش دەکرێت، مرۆڤ نەفرەت لە بوونی خۆیشی دەکات وەک مرۆڤ.

لە ئەدەبی کوردیدا چیرۆکنووسەکانمان بەهۆی بارودۆخی سیاسی کوردستان و واقیعە شۆڕشگێڕییەکەی، کەم تا زۆر ئەم واقیعە نالەبارەی میللەتی کوردییان گواستووەتەوە، تا سالانی حەفتاکانیش تێمای چیرۆکی کوردی بەشێکی زۆری بۆ چیرۆکی بەرگری و خەباتی پێشمەرگە بووە. دوای ئەوەش لە سالانی هەشتاکان و تا ڕاپەڕینی ئاداری 1991 ئەدەبیاتی کوردی لە شاخ و بەتایبەتیش چیرۆکی کوردی تۆماری بەرگری و خەباتی پێشمەرگە و ئەنفال و جینۆسایدی کوردی کردووە بە تێمای چیرۆکەکان و بووەتە بەشێک لە تۆمارەکانی ڕۆژنامەنووسیی کورد لە ئەدەبیاتی پێشمەرگە لە شاخ دا.

چیرۆکی کوردیش وەک ئەدەبیاتی دنیا لە بواری چیرۆکی جەنگدا تۆماری جوان و سەرکەوتووی هەبووەو دەتوانین بڵێین دەوڵەمەندیشە لەم بوارەدا کە دەچنە خانەی تێکۆشان لەپێناوی مرۆڤایەتی و خەباتی ئازادیخوازی و بەرخودانی وەک میللەتێکی خاوەن ماف و چەوساوە. ئەم چیرۆکانەش کە نووسراون لەم بوارەدا ڕووی جوانی چیرۆکی کوردی بە میللەتانی دنیا نیشان دەدەن و ئەگەر وەربگێردرێن دەبن بە نموونەی بەرزی خەباتی مرۆڤ و قوربانی و کوڵنەدان و تێکۆشان و دەنگی مرۆڤایەتی و ئازادیخوازیی میللەتانی دنیا.

د. مارف خەزنەدار یەکێکە لەو چیرۆکنووسە کوردانەی کە زۆربەی چیرۆکەکانی دەچنە خانەی چیرۆکی جەنگەوە. تێمای ئەم چیرۆکانەش وێنەو دیمەن و ڕەنگدانەوەی واقیعی جەنگە لە دنیا و وڵاتانی دەوروبەر و کوردستان، بەتایبەتی ئەو کاتەی کە بۆ خوێندنی دکتورا لە ڕووسیا بووە، ئەو لەوێ ئەو دیمەنانەی جەنگ بەتایبەتیش جەنگی دووەمی جیهانی و واقیعی بەرەنگاریی میللەتانی یەکێتیی شورەوی جاران لە بەرانبەر هێرش و داگیرکاریی و هەڵسوکەوتی نامرۆڤانەی سوپای نازییەکان و قەتلوعامی جووەکان بە دەستی ئەوانەوە و بەرەنگاریی میللەتانی دنیا لە بەرانبەر لەشکرکێشی و دەست بەسەرداگرتنی ئەڵمانەکان بەسەر میللەتان و وڵاتانی دنیا، ئینجا لەم دیمەنانەی جەنگیش چەندان نموونەی دڕندەیی و خراپی و ستەمی نازییەکان، لە هەمان کاتیشدا دیمەن و هەڵسوکەوتی مرۆڤانەش دەبینرێ، بۆ نموونە لەم چیرۆکەی مارف خەزنەداردا ((ئێوە قارەمانن)) کە شوێنی ڕووداوەکان ڕووسیایە و بە خەیاڵیس کەسێتیی سەرەکی چیرۆکەکە دەگەڕێتەوە کوردستان و باسی حاڵەتی جەنگ دەکات لەم دوو وڵاتە، واتە بەهۆی هەواڵی ڕادیۆوە ئاگاداری سەرکەوتنەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستانە و دڵیشی بەم سەرکەوتنە خۆشە، کە بگێڕەوەی هەمووشتزانی چیرۆکەکە چیرۆکنووس خۆیەتی و هێزی پێشمەرگەی کوردستانیش بە ((جەنگاوەران)) ناو دەبات، بەڵام کاتێ هاوڕێیەکی ڕووسی بانگی دەکات بۆ نانی ئێوارە، هۆیەکەیشی ئەوە بووە کە داپیرەیان هاتبووە سەردانیان، چونکە پیرێژن لە گوندەکانی پیلۆڕووسیا

دەژیا، زیاتر دەچێتە ناو بنج و بنەوانی شەڕی ئەڵمان و ڕووسەکان.

ئینجا وەسفی پیرێژن دەکات کە کاتی خۆی جوان بووە، بەڵام جەنگ ناشیرین و پیری کردووە وەک لە زاری داپیرەوە دەڵێ: (- ئازیزەکەم! منیش جوان بووم لە تافی گەنجیم دا. ئەوەندەی ژیانی هەشتا ساڵە چرچی خستووەتە ڕووم و هێزی لەشی سست کردووم، سەد ئەوەندە، بگرە هەزار ئەوەندە، جەنگ پیری کردووم، لەبەر ئەوە وەکو پیرێژنێکی هەشتا ساڵی تەماشای من مەکە، بەڵکو وەکو پیرێژنێکی هەزار ساڵە!). (بەرەو ڕۆژ، ل98)

ئەوەی دەمەوێ بیڵێم ئەو هەڵوێستی مرۆڤانەیە کە لەم چیرۆکەدا، چیرۆکنووس نیشانی ئێمەی دەدات ئەویش دوای وەڵامی ئەو قوتابییەی کە لەم میوانداریی بووەو بە بێزارییەکەوە گوتوویەتی: (- ناڵێم! خوا لەناویان بەرێ، کەی لەناو ئەڵەمانا پیاوی باش هەیە). (بەرەو ڕۆژ، ل98)

ئەم قسەیە لەناو تێمای چیرۆکەکەدا بە دوو هەڵوێستی مرۆڤانەی ئەڵمانەکان وەڵام دەدرێتەوە، یەکێکیان: بگێرەوە بە قوتابییەکە دەڵێ: ئەڵمانەکان هەموویان خراپ نین، مرۆڤی باش و مرۆڤ دۆستیشیان تێدایە، یەکێک لەم هەڵوێستانە بگێرەوەی هەمووشتزان، کە چیرۆکنووسەکەیە، وەڵام دەداتەوەو هەڵوێستی مامۆستایەکی ڕووسی بووە، کە ئەو لە کاتی گەشتی بە شەمەندەفەر لە بەرلینی ڕۆژئاواوە بەرەو مۆسکۆ چووە:

(- چەند مانگێک لەمەوبەر کە لە بەرلینی ڕۆژئاواوە بە شەمەندەفەر بەرەو مۆسکۆ دەچووم، بەڕێکەوت مامۆستاینێکی ئەڵەمان لە فارگۆنەکەما بوو، زمانی ڕووسی دەزانی، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی ببین بە ئاشنای یەکتری. گەلێ ئارەزووی ئەوەم کرد کە بزانم بیروڕای چییە و لە کاتی جەنگا چی کردووە). (بەرەو ڕۆژ، ل99)

ئینجا دەکەونە گفتوگۆ و ڤەگێر پرسیاری زانینی بیروڕای مامۆستاکە دەکات لەبارەی کۆمۆنیزم و بەشداری کردنی لە جەنگ و ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: ئەفسەرێکی بچووک بوومە و بەشداری جەنگم کردووە، بەڵام کەس ئازاری لە دەستم نەبینیوە.

ئینجا پرسیاری زانینی بیروڕای ئەو دەکات لەبارەی ((نازیزم))ەوە و مامۆستاکەش دەڵێ: (نازیزم بیروباوەڕێکی چەوتە، نرخ بە ئینسان نادا، بەلای منەوە هیچ جیاوازیێک لە نێوان ئینسانا نییە، جەنگ بارێکی قورس بوو بۆ من، هەر چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد بگەڕێمەوە قوتابخانە و زمانی ڕووسی فێری قوتابییەکانم بکەم). (بەرەو ڕۆژ، ل100)

دووەم هەڵوێستیش هی پیرێژنەکەیە کاتێ کە دەکەوێتە قسە و هەڵوێستێکی تری ئەفسەرێکی ئەڵمان دەگێڕێتەوە، کە دوای ئەوەی ئەڵمانەکان گوندەکەی پیرێژن داگیر دەکەن و لاوە بەهێزەکانی گوندەکەیان بەدیل دەگرن، هەرچی سوخرەو کاری قورس هەبوو هەموویان بەم گەنجانە کردووە، دوای ئەوە (لە پاش چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆیان، حەسارێکیان بە دیلەکان دروست کرد، خانووەکانی لە دار و دەوریان بە بە شیشی تەل و ئاسن گرت.

ڕۆژێکیان خەڵکی گوندەکەیان هەموو گواستەوە حەسارەکە، پیر و ژن و منداڵ. بڕیاریان دەرکرد بۆ بەیانی بە ئاهەنگێکی تایبەتی دەرگای شوورەی ئاسن دابخرێ و ئاگر بەر بدرێتە حەسارەکە. ئەفسەرێکی بچووک لە ئەفسەرەکانی ئەڵمان لە کاتی دروست کردنی و دامەزراندنی کوورە بۆ برژاندنی ئادەمیزاد لە سووچێکی شوورەکەدا بە شێوەیێک تۆڕی ئاسنی دروست کردبوو بە ئاسانی هەندێ لە تۆڕەکە لابچێ و کونێکی لێ ببێتەوە زەلامێک بەخشکە بتوانێ پیا بچێ. (بەرەو ڕۆژ، ل100)

ناونیشانی چیرۆکەکەش ((ئێوە قارەمانن)) لە وەڵامێکی چیرۆکبێژی هەمووشتزانەوە هاتووە، کە دوای ئەوەی داپیرە ڕۆژانی سەختی جەنگی دووەمی جیهانی و جەنگی ڕووس و ئەڵمانەکان دەگێڕێتەوە و بەرگری و وورەی خەڵکەکە دەگێڕێتەوە لە جەنگدا بە ڕێزگرتنێکەوە چیرۆکبێژ پێی دەڵێ: (- داپیرە! ئێوە قارەمانن، ئێمە چین؟ یا ئەوەتە لە کاتی جەنگا منداڵ بووین و هیچمان نەکردووە، یا ئەوەتە هێشتا لە دایک نەبوو بووین). (بەرەو ڕۆژ، ل98)

بێگومان (د. مارف خەزنەدار) ئەگەرچی لە هەموو چیرۆکەکانیشیدا دەستبەرداری شێوەی نووسینی چیرۆکی ئاسایی جاران نەبووە، بەڵکوو لە هەموو چیرۆکەکانیدا



پەیڕەوی سێیانەی مۆپاسانی جارانی چیرۆکی کردووە (سەرەتا، گرێچن، کۆتایی) و بە زمانێکی سادە و ساکار نووسیویە و لە ناوەڕۆکی ڕیالیزم و بابەتی کۆمەلایەتی و مێژوویی و سیاسی کوردستان لای نەداوە، بەم چیرۆکانەشەوە کە لە ڕووسیا نووسیویەتی، هێندە هەیە، لە هەندێک لەم چیرۆکانە بەتایبەتی چیرۆکی درێژی (بووکەشوشە) و چیرۆکی (ئێوە قارەمانن)، کە شوێنەکەی ڕووسیایە، باسی سوپای هیتلەر و نازییەکانە و ناوەڕۆکەکەی دەچێتە خانەی چیرۆکی جەنگ و نموونەی بالای ئەدەبی جەنگن، ئەمە لە زۆربەی چیرۆکەکانی تریشی هەر ڕەنگدانەوەو دەربڕ و تێمای چیرۆکەکان جەنگە، چ جەنگەکانی دنیاو چ جەنگە ڕەوا و بەرگریکارەکەی کورد لە عێراق و پارچەکانی تری کوردستانیشدا.

حەمەسەعید حەسەن لە نووسینێکی جوانیدا لەبارەی چیرۆکەکانی (د. مارف خەزنەدار)دا کە بە ناونیشانی ((کوردەواری بەدەم گێڕانەوە لە گێڕانەوەی (خەزنەدار)دا..)) کە لە کتێبی ((هونەری نووسینی چیرۆک))دا بلاوی کردووەتەوە، بە وردی و ئەکادیمی و زانستییانەوە لە هەموو چیرۆکەکانی کۆلیوەتەوە و دەلێ: (د. مارف نە ڕووداوی ڕاستەقینە دەنووسێتەوە، نە مێژوو تۆمار دەکات، بەلکوو ئیلهامیان لێ وەردەگرێت و دەیانکاتە پالپشت بۆ چیرۆکەکانی. گێڕانەوەی دیرۆک لای د. مارف زانست نییە، هونەرە، هونەر بەو مانایەی کاتێک سەرگەرمی گێڕانەوەی ڕووداوێکی مێژووییە، کارەکتەرەکانی زادەی خەیالن، وەک لە ((بووکەشووشە))دا هەستی پێ دەکەین و پێ دەچێت لەو بوارەدا، سوودیشی لە ئەزموونی ((والتەر سکۆت))ی ئینگلیز و ((ئەلیکساندەر دۆماس))ی فەرەنسایی وەرگرتبێت. ڕەسەنایەتیش لەکن ئەو، زادەی بەسەرکردنەوەیەکی ڕاستگۆیانەی کولتووری کوردەوارییە، بەلایەنە تاریک و ڕۆشنەکانییەوە...). (حەمەسەعید حەسەن، هونەری نووسینی چیرۆک، ل146)

حەمەسەعید حەسەن ئەم چیرۆکەی د. مارف خەزنەدار ((ئێوە قارەمانن)) بە نموونەیەکی جوانی چیرۆکی کوردی داناوە کە شان بە شانی چیرۆکی درێژی ((بووکەشووشە)) باسی دەکات و دەلێ: (هەرچەندە د. مارف زۆربەی چیرۆکەکانی لە هەندەران نووسیون، وەلێ شوێنی ڕووداوەکان کوردستانە، ئەم تێبینییە هەردوو چیرۆکی ((بووکەشووشە)) و ((ئێوە قارەمانن)) ناگرێتەوە، کە لە یەکەمیاندا شوێن ((لینینگراد))ی بە سوپای هیتلەر گەمارۆ دراوە و لە دووەمیشیاندا هەرچەندە شوێن هەر ڕووسیایە، وەلێ بیری گێڕەرەوە کە خودی نووسەرە، هەر لە کوردستانە. ئێوە قارەمانن، ناوەڕۆکێکی هێندە ئینساندۆستانەی دەولەمەندی هەیە، شیاوی ئەوەیە وەک نموونەی چیرۆکی کوردی بە گەلان بناسێنرێت). (حەمەسەعید حەسەن، هونەری نووسینی چیرۆک، ل143)

حەمەسەعید حەسەن ڕاستی بۆ چووە، منیش دوای ئەوەی هەموو چیرۆکەکانی د. مارف خەزنەدارم خوێندەوە، دەمویست چیرۆکێک هەلبژێرم و بیکەمە دەق و ڕەخنە و زیاتر تیشکی بخەمەسەر و بە وردییەوە لێی بدوێم، ئەوە بوو لەم چیرۆکەدا هەستی مرۆڤدۆستی و ئاستی بەرزی نووسینی د. مارفم بینی لە چیرۆکنووسیندا، بۆیە ئەم چیرۆکەم هەلبژارد. دواییش کە لێکۆلینەوەکەی حەمەسەعید حەسەنم خوێندەوە وەک نموونەیەکی بەرزی چیرۆکی کوردی دەبینێت، کە بە گەلان بناسێنرێت، زیاتر مکوڕی کردم ئەم چیرۆکەم خۆش بوێت و لەناو هەموو چیرۆکە جوانەکانی د. مارف خەزنەداردا جیای بکەمەوە. چیرۆکی ((ئێوە قارەمانن)) ئەگەرچی نموونەیەکی جوانی ئەدەبی جەنگە کە چیرۆک تۆماری خۆی دەکات و ئێش و ئازارەکانی مرۆڤی کورد و ڕووس و ئەلمان نیشان دەدات و دیمەنە ناشیرین و نەفرینەکانی جەنگ نیشانی خوێنەر دەدات، لە هەمان کاتیشدا دیمەنە مرۆڤایەتییەکان نیشانی خوێنەری کورد و خوێنەرانی دنیاش دەدات ئەگەر وەربگێڕدرێت بۆ زمانەکانی دنیا، لە هەمان کاتیشدا

ئەگەرچی بە تەکنیکی شێوەی ئاسایی جاران نووسراوە، کە سەرەتا و گرێچن و کۆتایی هەیە، لەگەڵ ئەمەش شێوازی گێڕانەوەکەی ئەوەندە هونەری و سەرنجڕاکێشە، خوێنەر سەراسیما دەکات و ناتوانێ تا کۆتایی چیرۆکەکە دەست لە خوێندنەوەی هەڵبگرێت.
زمانی نووسینی دەقەکە ئەگەرچی سادە و ساکار و بێگرێیە، بەڵام ئەوەندە پەتی و جوان و ناسکە، زیادەڕۆیی لە ڕستە و لە پەرەگرافدا نەکردووە، بەڵکوو لە تەکنیکیشدا هەموو توخمەکانی گێڕانەوەی بە جوانی بەرجەستە کردووە. خوێنەر هەست دەکات کە لە بەردەم دەقێکی هونەری جوان و بەرز دایە و لە ئاستی چیرۆکە سەرکەوتووەکانی دنیایە و دەگەینە ئەو بڕوایەی کە چیرۆکی کوردیش لە ئاستی هونەری و ستایل و پێشکەوتندا هیچی لە چیرۆکی هونەریی دنیا کەمتر نییە، ئەگەر زیاتریش نەبێت.
ئەم چیرۆکەی د. مارف خەزنەدار ((ئێوە قارەمانن)) شایانی لێدوانی زیاتریشە، کە لە هەموو لایەنێکەوە لێی بکۆڵرێتەوە و بونیادە شاراوەکانی بخرێتەڕوو.


ژێدەر:

1- د. مارف خەزنەدار، بەرەو ڕۆژ، کۆمەڵە چیرۆک، بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران ژمارە (73)، چاپخانەی سیما، چ/1، سلێمانی 2006، ل98، 99، 100.

2- حەمەسەعید حەسەن، هونەری نووسینی چیرۆک، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، چاپخانەی ڕۆکسانا، چ/2، هەولێر 2022، ل143، 146.


## ئێوە قارەمانن


د. مارف خەزنەدار


ئەو ڕۆژە گوشادییێکی بێسنوور دڵ و دەروونی ئاوەدان کردبووم، بێ پشوودان خەندەی بەختیاری لە لێوما دەباری. هەواڵی وڵاتانی ئازیز و نیشتمانی نازدار بۆنی گوڵاوێکی خۆشی پژاندبووە ژیانم، هەموو کون و قوژبنێکی تەبیعەتی لێ کردبووم بە بەهاری کوردستان.
دەنگوباسی هەندەران، بە ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن ئەوەی دەگەیاند کە جەنگاوەران لە هەندێ لە سەنگەرەکانی ناو شاخەکانا دوژمنیان بەزاندووە، ئەم هەواڵە بۆ یەکێکی وەک من لەم مەڵبەندە دوورەدا، تەنیا شادییە و بەس!
وەکو هەموو جارێک لە کاتی خۆشی و کامەرانی دا، یا لە کاتی دڵ شکاوی و پەژمردەیی دا، بیرم لە مەی و مەیخانە دەکردەوە... مەی بۆ ئەوەی زیاتر ماوە بۆ خەیاڵ فراوان بکەم، بیفڕێنم بە ئارەزووی خۆم، بۆ دوور، ئێکجار دوور بۆ ئەو جێگەیەی هەموو ئاواتمی گرتووەتە باوەشی دوارۆژی ڕووناک.
من چاوەڕوانی ئەوە بووم ئەم یەک دوو سەعاتە زوو تێپەڕێ و بچمەماڵەوە، بەڵام زەنگی دڵ ڕووناککەرەوەم بۆ لێ درا. تەلەفۆن بوو، هاوڕێیەکی ڕووسم بانگی کردم بۆ نانی ئێوارە، هەموو بانگکردنێکی ئەو و دۆستەکانی تریشم دڵ ڕۆشنکەرەوەیێک بوو بۆ من، بەتایبەتی ئەو ڕۆژە دڵم شانۆی ئاهەنگ و بەزم و ڕەزم بوو.
ئێوارە کە لە ماڵی خانەخوێکەم چوومە ژوورەوە، دەستبەجێ هۆی ئەم کۆبوونەوەو دەعوەت و بانگ کردنەم زانی، داپیرە خۆشەویستەکەیان بوو و هاتبوو بۆ سەردانیان. داپیرە لە گوندەکانی بێلۆڕووسیا دەژیا، باس و خواسیم بیستبوو، بەڵام هێشتا چاوم پێی نەکەوتبوو.
پیرێژن چی پیرێژنێک بوو! برژانگ و برۆ و قژی سەری هەموو هەڵکرووزا بوون، پیاو نەیدەزانی ڕەنگیان ڕەشە یا کاڵە! چرچ و لۆچی دەم و چاوی پیرەکەی لەگەڵ شەش



حەوت کون و شوێنی سووتان و لێدان و گوللە تێکەڵ بە یەک بوو بوون، نەعووزوبیللا هەر لە خێو و جانەوەری دەکرد. کە لێی چوومە پێشەوە لە پاش دەست گوشین و چاک و چۆنی گوتی:

- ئازیزەکەم! منیش جوان بووم لە تافی گەنجیم دا، ئەوەندەی ژیانی هەشتا ساڵە چرچی خستووەتە رووم و هێزی لەشی سست کردووم، سەد ئەوەندە، بگرە هەزار ئەوەندە، جەنگ پیری کردووم، لەبەر ئەوە وەکو پیرێژنێکی هەشتا ساڵی تەماشای من مەکە، بەڵکو وەکو پیرێژنێکی هەزار ساڵە!

کە گوێم لەم وتەیە بوو، رەنگم هەڵبزرکا، ئارەقەی تەریق بوونەوە دەموچاوی سوور کردم، وام هەست کرد وەکو من بووبم بەهۆی پەژمردەیی و نالەباریی ئەم پیرێژنە. نەمزانی چۆن وەرامی بدەمەوە! چی بڵێم! چونکە هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد کە نەک هەستکردن بە ناشیرینی، بەڵکو دەربڕینی ئەم ناشیرینییە لەلایەن پیرێژنێکی تێگەیشتوو و دنیا دیتەی وەکو ئەمە روویدا ناچار بە رێزگرتنێکەوە گوتم:

- داپیرە! ئێوە قارەمانن، ئێمە چین! یا ئەوەتە لە کاتی جەنگا منداڵ بووین و هیچمان نەکردووە، یا ئەوەتە هێشتا لە دایک نەبوو بووین.

میوانەکان لە دەوری مێزی نانخواردن کۆبوونەوە، هێشتا تفتوتاڵی قومی یەکەم، کە بۆ تەندروستی پیرێژن خورایەوە، لە دەممانا نەتوابووەوە رادیۆ کەوتە باسی ئەڵەمانیا، کە چۆن لە ئەڵەمانیای رۆژئاوا گەلێک لە نازییە کۆنەجەنگ هەڵگیرسێنەرەکان ئێستاش فەرمانی گەورەیان بەدەستەوەیە، گەلێکیان لەسەر کورسی دەوڵەتی وا دانیشتوون کە لە چاو کاتی جەنگدا پایەیان بەرزتر بووە. یەکێک لە میوانەکان، قوتابییەکی لاوی بیست ساڵەی خوێن گەرم بوو، بە توورەیی و بێزارییەکەوە گوتی:

- ناڵێم! خوا لەناویان بەرێ، کەی لەناو ئەڵەمانا پیاوی باش هەیە!

خەریک بوو وەرامی بدەمەوە، بەڵام پیرێژن قسەی بڕیم و رووی کردە قوتابییەکە و گوتی:

- رۆڵە! ئەمە کاری تۆ نییە، لەو سەردەمەدا تۆ هێشتا لە دایک نەبوو بووی، من بڕیار لەسەر ئەمە دەدەم نەک تۆ!

ئینجا رووی کردە من و گوتی:

- ببوورە! قسەکەتم بڕی، فەرمووا!

- نا .. نا .. داپیرە فەرموو، تۆ قسە بکە، من مەبەستم هیچ نەبوو، دەمەوێ گوێ لە تۆ بگرم، دیارە تۆ دەتوانی بڕیار لەسەر ئەوە بدەی ئەڵەمانەکان باشن یا خراپ.

- بەڵێ .. بەڵێ .. من قسەی خۆمتان بۆ دەکەم، بەڵام فەرموو تۆ قسەکەی خۆتمان بۆ بکە.

- قسەکەی من شتێکی وا نییە، تەنیا ویستم ئەوە بڵێم ئەڵەمان هەموویان خراپ نین.

- دەفەرموو، فەرموو شەرم مەکە.

لەمە زۆر تەریق بوومەوە، نازانم بۆ چ بە دەمما هات و ویستم وەرامی ئەم قوتابییە بدەمەوە، چونکە زۆر باش دەمزانی قسەکانی منێکی ساکار لەم بابەتەوە دەبێتە مایەی پێکەنین بۆ ئەو خەڵکەی کە سەرو سەربردەی لەش داچڵەکێنەریان لایە لە بابەت ئەڵەمانەوە. ناچار لەبەر زۆری داپیرە کەوتمە گێڕانەوەی ئەوەی دەمویست بە قوتابییەکە بڵێم:

- چەند مانگێک لەمەوبەر کە لە بەرلینی رۆژئاواوە بە شەمەندەفەر بەرەو مۆسکۆ دەچووم، بە رێکەوت مامۆستایێکی ئەڵەمان لە فارگۆنەکەما بوو، زمانی رووسی دەزانی، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی ببین بە ئاشنای یەکتری. گەلێ ئارەزووی ئەوەم کرد کە بزانم بیروڕای چییە و لە کاتی جەنگا چی کردووە، کەوتینە گفتوگۆ:

- لە کوێ فێری زمانی رووسی بووی؟

- لە زانستگای هامبۆرگ، لە سەرەتای جەنگدا بەشی رووسیم لەوێ تەواو کرد.

- بیروڕات بەرانبەر کۆمۆنیزم چییە؟

- من کۆمۆنیست نیم، بەڵام رقیشم لە کۆمۆنیزم نییە!

- دیارە لە جەنگدا بەشدار بووی!

- بەڵێ ئەفسەرێکی بچووک بووم، جەنگم بە شتێکی خراپ دەزانی، بەڵام بۆشم نەدەکرا بەربەرەکانی بکەم



زۆریش بە تەنگەوە نەبووم.
- لە جەنگا دووچاری خوێنڕشتن نەبووی؟
- نا، بەڵام گەلێ ڕووداوی خراپم دی، بە من بوایە نەدەبوو ئەم شتانە ڕوو بدەن، بەڵام من ئەفسەرێکی بچووک بووم، هیچم لە دەست نەدەهات و زۆریش بەختیارم کە کەس ئازاری لە دەستی من نەچێشتووە.
- بیروباوەڕتان چییە بەرانبەر نازیزم؟
- نازیزم بیروباوەڕێکی چەوتە، نرخ بە ئینسان نادا، بەی منەوە هیچ جیاوازییێک لە نێوان ئینسانا نییە، جەنگ بارێکی قورس بوو بۆ من، هەر چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد بگەڕێمەوە قوتابخانە و زمانی ڕووسی فێری قوتابییەکانم بکەم.
ئیتر ڕووم کردە خەڵکەکە و گوتم:
- ئەمە بوو ئەوەی دەمویست بیڵێم، دیارە ئەمەش بۆ ئێوە شتێکی وا گرنگ نییە.
پیرێژن کەوتە قسەکردن:
- بەڵێ، ئادەمیزادی ئەڵەمانی وا زۆرن و لەمەش باشتریان هەیە!
ئینجا ڕووی کرد قوتابییەکە و گوتی:
- کوڕم! هێشتا تۆ لە دایک نەبوو بووی، کە ئەڵەمانەکان گوندەکەی ئێمەیان داگیر کرد، هەرچی لاوی بەهێزمان هەبوو، کە ئەمانە ژمارەیان زۆر کەم بوو، بە دیل گیران، بۆ ئەوەی بین بە کۆیلەی ئەو دامودەزگایەی گوندەکەی ئێمەی بەڕێوە دەبرد. جا هەرچی سوخرە و کاری قورس هەبوو هەموویان بەم گەنجە دیلانەی ئێمە دەکرد. لە پاش چەسپاندنی دەسەلاتی خۆیان، حەسارێکیان بە دیلەکان دروست کرد، خانووەکانی لە دار و دەوریان بە شیشی تەل و ئاسن گرت. ڕۆژێکیان خەڵکی گوندەکەیان هەموو گواستەوە حەسارەکە، پیر و ژن و منداڵ. بڕیاریان دەرکرد بۆ بەیانی بە ئاهەنگێکی تایبەتی دەرگای شوورەی ئاسن دابخرێ و ئاگر بەربدرێتە حەسارەکە. ئەفسەرێکی بچووک لە ئەفسەرەکانی ئەڵەمان لە کاتی دروست کردن و دامەزراندنی کوورە بۆ برژاندنی ئادەمیزاد لە سووچێکی شوورەکەدا بە شێوەیێک تۆڕی ئاسنی دروست کردبوو بە ئاسانی هەندێک لە تۆڕەکە لابچێ و کونێکی لێ ببێتەوە زەلامێک بە خشکە بتوانێ پیا بچێ.
پیرێژن ئاخێکی هەڵکێشا و فرمێسکی ڕۆژانی ڕەشی دوا براوی رابردوو بە ڕوومەتە چرچەکانی دا هاتنە خوارەوەو گوتی:
- ئەم کارەساتەم بە چاوی خۆم دی. ئێوارە وەخت بوو، ئەم هەموو خەڵکە خرایە حەسارەوە، دەرگای ئاسن داخرا، هالاوی ئاگر تێکەڵ بە بۆنی گۆشتی برژاوی ئادەمیزاد گڕی سەند، بۆنی ئەم گۆشتە برژاوە و بژانی کەللەی ئادەمیزادی دروست کەری شارستانیەت چوو بۆ عەرشی فەلەک! بەڵێ ئەفسەری ئەڵەمانیش هەر خەریکی ئەوە بوو بە ئەفسەر و سەربازە ئەڵەمانەکان بڵێ: ئەوا خەڵکەکە دەسووتێن و ئێمەش با بڕۆین، بەڵام ئەوان نەڕۆیشتن تا زیاتر لە نیوەی خەڵکەکە سووتان و مردن، ئەوانی تریش نیوەزیندوو بوون. لە پاش ئەوەی بڵاوەیان لێ کرد بە گورجی ئەفسەری دڵسۆزی ئەڵەمان گەڕایەوە شوێنی حەسارەکە، چووە لای کونەکەی خۆی و توانی چەند کەسێک ڕزگار بکا، منیش یەکێک بووم لەوانەی ڕزگار بوون! ئاوایە کوڕم لە ئەڵەمانیشا پیاوی باش هەیە!
ئینجا پیرێژن ڕووی کردە من و گوتی:
- نەتەوەی ئێوە گەلێک بەختیارە، چونکە نە جەنگاوە بۆ ئەوەی زوڵم و زۆری لە خەڵکی بکا و زەوی یەکێکی تر داگیر بکا، بەڵکو لە خەباتایە بۆ ئەوەی مافی خۆی وەربگرێ، ئێوە زۆر سەربڵند و بەختیارن خۆزگەم بە خۆتان.
لە دوای ئەمە پیرێژن بە دەم گریانەوە گوتی:
- توخوا با بەس بێ! ئێمە لێرە بۆ گریان کۆنەبووینەوە، بەڵکو بۆ بەزم و ڕابواردن، با لاوەکانمان دڵگیر نەبن.

**26ی ئەیلوولی 1965**

**سەرچاوە:**

**د. مارف خەزنەدار، بەرەو ڕۆژ، کۆمەڵەچیرۆک، بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران (73)، چاپخانەی سیما، چ/1، سلێمانی 2006، ل101-97.**



# مارف خەزنەدار ناوێکی پڕبەهایە
# لە مێژووی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا

بنیاد خەزنەدار



ـوی مارف خەزنەدار براندێکی پڕبەها و دەوڵەمەندە لە ـاپەڕەکانی مێژووی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا. ئەم ـوە هاوتای چڕکردنەوەی هەوڵ و کۆششی نەپساوەی ـێو سەدەیە لە بواری نووسینی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و ـێژووی ئەدەب و لێکۆڵینەوەی زانستی و ئەکادیمی.

کەسایەتیی ڕۆشنبیری و بواری کارکردنی مارف خەزنەدار وەک مۆزاییکێکی هەمەڕەنگ وایە، جۆرەها بەردی گرانبەهای ـەخۆوە گرتووە، ئەمەش هەموو لایەنەکانی پەیوەست بە کتێب و ئەرشیف و تابلۆی ئۆریجیناڵ و هۆیەکانی بیستن و ـینین و دەیان دەستنووسی کۆن و وێنەی دەگمەن دەگرێتەوە. ـەم گەنجینەیە بە ئاشکرا لە خانووەکەی مەڵبەندی ڕووناکی وەک مارف خەزنەدار خۆی ناوی نابوو) بەدی دەکرێت. ـەو هیوایەی ڕۆژێک لە ڕۆژان بتوانین خەونی لەمێژینەی ـارف خەزنەداری باوک و مامۆستامان بێنینە دی و ئەم کتێبخانە دانسقەیە و ئەم ماڵە وەک جاران گەرموگوڕی بخەینەوە باوەشی و بیکەین بە مەڵبەندێکی ڕووناکبیری، کەسانی ئەم وڵاتەم سوودی لێوەربگرن.

ـەوەی دێ چەند وێستگەیێکە لە بوارەکانی کارکردن و حەز و ئارەزووەکانی مارف خەزنەدار بە کورتی دەیانخەینە ـڕوو، بۆ ئەوەی فرەلایەنەی کەسایەتیی ڕۆشنبیری ئەم ـرۆڤە شی بکەینەوە:

### مارف خەزنەدار و کتێب و خوێندنەوە

نازانم ناوی بنێم حەز، یان خولیا، یان خوو. پەیوەندی مارف خەزنەدار لەگەڵ کتێب چیرۆکێکی عاشقانە بوو، هەمیشە بەبێ یەکتری نەیاندەتوانی ژیان بگوزەرێنن. ئەو لەنێو چوار دیواری کتێبخانەکەیدا هەستی بە ئارامی دەروونی دەکرد، پێی وابوو هەموو گێتی لە دووتوێی ئەم ژوورەدا چڕ کراوەتەوە. خوێندنەوە کرداری هەمیشەیی ئەم زاتە بوو، هەمیشە دەیگوت زۆر بخوێننەوە کەم بنووسن، ئاگاداری کتێب بن، بە جوانی مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، کە کتێبێکتان خوێندەوە لە بەرگەوە تا بەرگ بیخوێننەوە، مەرج نییە ئەو کتێبەی دەیخوێننەوە لەگەڵ بۆچوون و ئایدیۆلۆژیاتان کۆک بێت، بە وریایی کتێب بخوێننەوە و ناوەرۆکەکەی بە وریاییەوە قبووڵ بکەن. ئەمانە و دەیان ئامۆژگاری تر تا ئەمڕۆش لە گوێماندا دەزرینگێنەوە.

### مارف خەزنەدار و خولیای نووسین و چاپکردنی کتێب

نیو سەدە وچانی بێپسانەوە لە بواری نووسیندا، ناوی مارف خەزنەدار لە لاپەڕەکانی مێژووی ڕۆشنبیری و ئەدەبدا بە درەوشاوەیی تۆمار دەکات.

نووسینەکانی لە ڕووی بابەت و زمانەوە هەمەچەشنن، وتار و لێکۆڵینەوە و چیرۆک و بەسەرهات و مێژووی ئەدەب و بابەتی تر، ئەمانە هەمووی جێگەی بایەخ بوون بە لای مارف خەزنەدارەوە. ئەو بە سێ زمان کتێبی بڵاو کردووەتەوە، کوردی، عەرەبی و ڕووسی.

پەیوەندییەکی ڕۆحی لەگەڵ چاپدا هەبوو، شارەزا بوو لە بواری چاپەمەنی و زۆر جار بە هاوەڵی یەکتر سەردانی چاپخانەکانمان دەکرد، ئەو پێی باش بوو خۆی سەرپەرشتی چاپی کتێبەکانی بکات بۆ ئەوەی کەموکوڕییان تێدا نەبێت.

### مارف خەزنەدار و بواری ڕۆژنامەوانی

مارف خەزنەدار هەمیشە بڕوای بەوەدا بوو کە پێویستە مرۆڤ لە کارکردندا لە هەنگاوی بچووکەوە دەست پێ بکات. لە بواری ڕۆژنامەوانیدا وەک ڕۆژنامەنووسێکی ئاسایی دەستی پێ کرد تا گەیشتە پلەی سکرتێری نووسین و سەرنووسەر. لە پاشاندا بە یاوەری جەمال خەزنەدار (دەفتەری کوردەواری) دەرکرد. گرنگترین ڕووداو لە ژیانی ڕۆژنامەوانی مارف خەزنەدار دۆزینەوەی ژمارەی یەکەمی ڕۆژنامەی (کوردستان) بوو، لە پاشاندا پێشنیارکردنی بەرواری 22/4 وەک جەژنی ڕۆژنامەگەریی کوردی.

لە چەندین ڕۆژنامە و گۆڤاردا مارف خەزنەدار ستوونی حەفتانە یان مانگانەی هەبوو، خوێنەر بە پەرۆشەوە چاوەڕێی ئەم ستوونانەی دەکرد. لە پاشاندا هەندێکیان لە چەند کتێبێکدا کۆکرانەوە.

### مارف خەزنەدار و ئەرشیف

شانبەشانی ئەو کتێبە دەگمەنانەی کتێبخانەی (مەڵبەندی ڕووناکی) بەخۆیەوە دەگرێت، بواری ئەرشیفیش جێگەیەکی دیاری هەیە لەم کتێبخانەیەدا. مارف خەزنەدار



خولیای کاری ئەرشیفگەری بوو. ئەو وێڵ بوو بە دوای دۆزینەوەی ڕاستییە زانستییەکان. لە گەشتەکانی بۆ وڵاتانی ئەورووپا و دونیا هەمیشە لە سووچی کتێبخانەکاندا خەریکی دۆزینەوەی کتێب و دەستنووس بوو، پاشان کۆپیکردنیان، یان کردنیان بە مایکرۆفیلم. هەمیشە وتەییەکی دووپات دەکردەوە دەیگوت: "من حەمباڵی کتێبم". بە لای ئەوەوە حەمباڵیکردن بۆ کتێب کارێکی پیرۆز بوو.
ئەرشیفی مارف خەزنەدار بە سەدان وێنەی دەگمەنی نووسەران و ڕۆشنبیران و هونەرمەندان و هاوڕێیان و خزمان و وێنەی گەشتە جۆراوجۆرەکان دەگرێتە خۆی. سەرەڕای دەیان کاسێتی ڤیدیۆ و کاسێتی دەنگ و ئەرشیفێکی دەوڵەمەندی نامەی نووسەران و ڕۆشنبیران و کەسایەتییە سیاسییەکانی کورد و جیهانی.
لە (مەڵبەندی ڕووناکی)دا، گەلەرییەکی گەورەی تابلۆی ئۆریجیناڵی هونەرمەندە دیارەکانی کورد و عێراقی بەدی دەکرێت، سەرەڕای چەندین وێنەی هێلکاری و ئەو وێنانەی کە تایبەت بۆ بەرگ و ناوەرۆکی کتێبەکانی مارف خەزنەدار دروست کراوە.
مارف خەزنەدار زۆر حەزی بە کەرەستەی ئەنتیک بوو، لە گەشتەکانی هەمیشە یادگاری ئەم وڵاتانەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە، ئەم لایەنەش بەشێکی جوانی ماڵەکەی داگیر کردووە.

### مارف خەزنەدار و ژیانی ئەکادیمی و زانکۆ

بەکارهێنانی وشەی (دکتۆر) و (پرۆفیسۆر) بە لای مارف خەزنەدارەوە بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو، ئەزموونی ئەکادیمی مارف خەزنەدار زۆر لەم وشانە گەورەتر بوو. بە تایبەتی بەکارهێنانی ئەم وشانە لە نووسینی ئەدەبیدا بەلای ئەوەوە کارێکی نەنگ بوو. ئەو بە سەدان قوتابی بەکەلۆریۆس و ماستەر و دکتۆرای پێگەیاندووە، بە دەیان لێکۆڵینەوەی زانستی لە گۆڤارەکانی ناوەوە و دەرەوەی وڵات بڵاو کردووەتەوە. زۆرجار لەناو کتێبخانەکەی خۆیدا وانەی بۆ قوتابیان دەوتەوە. خوڵقاندنی کەشێکی ئەکادیمی و ڕۆشنبیری لەم چەشنە بە لای قوتابیانەوە مایەی دڵخۆشی بوو.

### مارف خەزنەدار و دیوەخان و بەڕێکردنی میوان

زۆر دەگمەن بوون ئەو ڕۆژانەی کە تیایدا (مەڵبەندی ڕووناکی) بێ میوان بێت. بەڕێکردنی میوان کاری ڕۆژانەی مارف خەزنەدار بوو، دیارە لێرەدا دایکی خۆشەویستم ڕۆڵێکی بەرچاوی دەگێڕا لەم لایەنەوە.
دیوەخانی ئەدەبی مارف خەزنەدار و خوێندنەوە و شیکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی نووسەران ئەزموونێکی نوێ بوو لە وڵاتی ئێمەدا، لاساییکردنەوەی سالۆنە ئەدەبییە بەناوبانگەکانی جیهان بوو. من بەشبەحاڵی خۆم زۆر سوودم لەم دانیشتنە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییانە وەردەگرت، بەشێکی زۆری ئەم دانیشتنانەش بە کامێرای ڤیدیۆی خۆم تۆمارم کردوون و تا ئێستاش پارێزراون.
مارف خەزنەدار هۆگری باخ و دار و درەخت بوو، هەموو بەیانیان پیاسەیەکی ناو باخچەی ماڵەوەی دەکرد و هەمیشە خۆی بایەخی بە ڕووەکەکان دەدا. لە وەرزی بەهار و هاویندا میوانیی لەناو باخچە بەڕێ دەکرد.
مارف خەزنەدار بە یاوەری دایکم وەک دوو مەلی عاشق بە جوانییەکانی ژیان کاتیان بەسەر دەبرد، هەمیشە بە زەردەخەنەیەکی جوانەوە پێشوازییان لە میوان دەکرد و تا بەردەرگاش بەڕێیان دەکردن. سادەیی کەسایەتیی مارف خەزنەدار ڕەنگدانەوەی پڕئەزموونی ئەم زاتە بوو لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.
هەزاران درووود لە گیانی بێگەردی مارف خەزنەدار، لە ساڵیادی کۆچکردنت وەک هەمیشە تەنیا ئەوەندەم لە دەست دێ دڵۆپێک فرمێسکی وەفاداری و خۆشەویستی و گەورەیی لەسەر مەزاری پاکت بڕێژم.

# دوادیمانە لەگەڵ مارف خەزنەداردا



دیمانە: حەیدەر عەبدوڵلا

سەرلەئێوارەیەکی درەنگ بە دیدەنی پرۆفیسۆر دۆکتۆر مارف خەزنەدار گەیشتم، بینیم هەر چواردەوری بەکتێب گیراوە، زۆر بە زەحمەت لەنێو ئەم هەموو کتێبەدا جێگەیەکم بۆ دانیشتن کردەوە. خاتوو "سەعدیە"ی خێزانی گوتی: ماڵ و خزم و کەس و نان و ئاو و هەناسەمان بووە بە کتێب، ئەوە دەبینن مەتبەخەکەشمان هەمووی هەر کتێبە، (کتێب، کتێب، کتێب!) زۆر لام سەیر بوو کەسێک دوای نووسین (٦٠) کتێب و سەدەها لێکۆڵینەوە و وتار، هێشتا هەر دەخوێنێتەوە. گوتم: مامۆستا دەمەوێت دیمانەیەکت لەمەڕ گەورەیی کتێب و نووسین و خوێندنەوە لەگەڵدا بکەم. بە پاساوی مژووڵی و نەخۆشی خۆی لەم باسە دزیەوە، لێ پێداگریی من وای کرد دوکتۆر داواکەم قەبووڵ بکات، بەڵام بە مەرجێک پرسیارەکانی بۆ بنووسم و دوای ماوەیەک وەڵامم بداتەوە. دوای وەرگرتنەوەی دەستنووسی وەڵامەکان، بۆم دەرکەوت دوکتۆر بایەخێکی زۆری پێداوە و بە وردی وەڵامی پرسیارەکانی منی داوەتەوە.

**حەیدەر عەبدوڵڵا:** هەر لە بەرەبەیانی مێژووی کتێب وەک موقەددەسێک دەردەکەوێت، خەڵک پیرۆزی دەگرن و خوێنەران بە چاوی عیشق و ویقارەوە بۆی دەڕوانن، هەموو ژاوەژاوەکانی ژیان و ئایدۆلۆژیا و تەکنۆلۆژیای هاوچەرخ نەیانتوانیوە بەهای کتێب کەم بکەنەوە. جەنابت وەک کەسێکی مودمین بە خوێندنەوەی کتێب، چۆن باسی مەزنی و گەورەیی کتێبمان بۆ دەکەی؟

**مارف خەزنەدار:** کتێب کۆنترین و یەکەمین پریاسکەیەکە کردەوە و ڕووداو و فیکر و خەیاڵ و ویستی ئادەمیزاد دەپارێزێ لەو ڕۆژەوەی دروست بووە تا ئێستا. شتی تریش پەیدابووە بۆ ئەم پاراستنە، بەڵام نرخی کتێب نەهاتووەتە خوارەوە و سوودی لە جێی خۆیەتی، چونکە لە ماوەی هەزاران ساڵ ئەو پیرۆزییەی بەرانبەر بەکتێب دروست بووە وەک پەیکەرێک تەنیا ناوەڕۆکی بووە بە ڕەمزێکی کردگاری. کە چاوت بە تاکە کتێبێک دەکەوێ، یان کۆمەڵێک کتێب وادەزانی چاوت بە کردگار کەوتووە، لەو ژوورەی کە تێیدا پارێزراوە خۆت لە عەرشی کردگاردا دەبینی. بێگومان ئەمە لە وێنەی کتێبە پیرۆزەکانی گوتەی خودایان پاراستووە، بەرجەستە دەبێ، واتە هەر کتێبێک بە وێنە لە قورئان و ئینجیل و تەورات دەکا، بەم ڕەنگە هەر ئادەمیزادێک هەموو جۆرە کتێبێک بە هاوڕێی ئەو کتێبە پیرۆزانەی ئایینی دەزانێ. ئەوەی گوتم برێکە لە ئەنجامی تاقیکردنەوە و بینینی خۆم بەرانبەر بە کتێب بەگشتی، بەڵام مەسەلەیەکی گرنگ لەم بابەتەوەوە، ئایا کتێب لای هەموو ڕۆشنبیر و خوێندەوارێک پیرۆزە؟ بە وەرامی بەڵێ، یان نا ناگەینە ئەنجام.

خوێندەواری هەمیشە کتێببەدەست هەیە ئەو کتێبەی لەلا پیرۆز نییە، هیی دیکەی بە پێچەوانەش دەکەوێتە بەرچاو. من لێرەدا ئەگەر بەسەرهات و تاقیکردنەوەی خۆم لەم بابەتەوە بگێڕمەوە مانای ئەوە نییە هەموو کەسێکی وەکو من کتێبی خۆش دەوێ. کورە هەژاری لادێیی وا هەیە لە ژیانی خۆیدا چاوی بە کتێب نەکەوتووە، لەوانەیە لە ماوەی خوێندنی سەرەتایی لە کتێبی قوتابخانە بەولاوە چاوی بە هیچ جۆرە چاپەمەنییەکی دیکە نەکەوتبێ، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ بە عاشقی کتێب و ناوی دەچێتە ناو تۆماری سۆفیزمەوە.

**حەیدەر عەبدوڵڵا:** بە بۆچوونی تۆ ئەو کتێبانەی ڕەوڕەوەی ژیان و ژیاری مرۆڤ دەگۆڕن و بونیادی پاشخانی فیکری مرۆڤ دروست دەکەن، چ جۆرە کتێبێکن؟ بە گوزارشتێکی تر چ کتێبێک بخوێنینەوە؟

**مارف خەزنەدار:** پێش ئەوەی بیروڕای من بزانی لە بابەت ئەو کتێبانەوە، پێویستە خوێنەر ئاشنایەتییان لەگەڵ پەیدا بکا، دەڵێم مێژووی ڕۆشنبیری لای ئینسان بەدرێژایی ژیانی لەناو ئەشکەوتەوە تا ئێستا، هێندێ کتێبی دەستنیشان کردووە، ئەمانە بوون بە بنیادی زانین و مەعریفەت لەسەر ڕووی زەوی، لەمانە دەتوانین پەنجە بۆ هەموو کتێبە پیرۆزەکانی ئایینی جوو و مەسیحی و ئیسلام درێژ بکەین.

هەروەها کتێبی تری ئایینە جیاوازەکانی وەکو ڤیدا و ئاڤێستا و ئامۆژگارییەکانی کۆنفۆشیۆس و هیی دیکە. جگە لەمە کۆمەڵێک بەرهەمی تریش بوون بە سەرچاوەیێکی بنچینەیی بۆ زانیاری و مەعریفەی گشتی، وەکو مەلحەمەکانی گلگامێش و ئەلیادە و ئۆدیسیا و ئەنیادە و تۆماری فەلسەفەی گریکی و ئیسلامی سەدەکانی ناوەڕاست، لەگەڵ ئەوەشدا بزووتنەوەی سۆفیزمی کەونی کولتووری ڕۆژهەڵاتی کۆن دەوری هەبوو لە دروستکردنی سەرچاوەی بنچینەیی بۆ مەعریفەت، لەوانە کلیلە و دیمنە و هەزار و یەک شەو و چوارینەکانی عومەری خەیام وکتێبی دیکە.

بەگشتی ئەو کتێبانەی ئینسانی ئەمڕۆی سەر ڕووی زەوی پێویستە بایەخیان پێ بدا دوو جۆرن: یەکەمیان: بەرهەمی داهێنراوی ئەدەبی، وەکو شیعر و وتار و چیرۆک و ڕۆمان، ئەمەیان بۆ هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵی مرۆڤایەتییە. دووەمیان: زانستی و تەکنیک، ئەمەیان بۆ پسپۆڕی و هەموو ئەو زانستانەیە کە لەدەرەوەی بەرهەمی ئەدەبی و هونەری دەکەونە بەرچاو.

بە هەموو جۆرێکیش هەر کەسە بەپێی ویست و ئارەزووی خۆی دەتوانێ ئەو جۆرە کتێبانە بۆ خوێندنەوە هەڵبژێرێ کە لەگەڵ چێژ و میزاج و ویستی خۆی دەگونجێن.

**حەیدەر عەبدوڵڵا**: دەڵێن خوێندنەوە لە ڕوانگەی پێویستی بۆ مرۆڤ چەشنی خۆراکە، ئایا دەشێ وەک کەسی بەدخۆراکمان هەیە، کەسی بەدخوێنەریشمان هەبێت، واتە وەک ئەو خواردن هەرس ناکات ئەویش خوێندنەوە سوودی پێ نەگەیێنێت

**مارف خەزنەدار**: ئەوەی تۆ دەیڵێی پەندێکە لەناو خەڵک: "لەو کاتەی خواردەمەنی خۆراکی لەش بێ، خوێندنەوە، یان کتێب خۆراکی ژیانە." لێرەدا من تێناگەم کەسی بەدخۆراک یانی چی؟! بەڵام چۆن کەسی بەدخوێنەر دەگەم، ئەگەرچی بۆ یەکەم جاریشە ئەم تەعبیرە دەبیستم.

هەرچۆنێک بێ ئەمە هەیە، من وای لێک دەدەمەوە: کەسێک سینگ دەردەپەڕێنێ و شانازی بەوە دەکا کە خوێندەوار و ڕۆشنبیرە، کتێبی خۆش دەوێ، لە ماڵەوە نامەخانەیەکی دەوڵەمەندی هەیە، کەچی ئەو کەسە دوورترین کەسە لە ڕۆشنبیری. لە هەموو ژیانیدا تاکە کتێبێکی لە سەرەتاوە تا ئەنجام نەخوێندووەتەوە، لە ناوەڕۆکی کتێب تەنیا ئاگاداری لە هەندێ لە بەشەکانی هەیە، کەچی لەم کەسە نیمچەخوێندەوارانە نەخوێندەواریشی لەناوەوە هەیە. لەناو ئەم بێسەوادانەدا کەسی وا هەیە بۆ دیکۆر، بۆ ئەوەی خەڵکی بە گەورەی لەقەڵەم بدەن، لە ماڵی خۆی نامەخانەیەک دروست دەکا، هەوڵ دەدا بە کتێبی ئەستوور و گەورە و بەرگاوی جوان نامەخانەکەی برازێنێتەوە. دیاردەیەکی تریش لە بەدخوێنەر دەکەوێتەوە، ئەویش ئەوەیە ئەوەندەی بەتەنگ دانەری کتێبەکەوەیە ئەوەندە بەتەنگ کتێبەکەوە نییە. لە ناوەڕۆکدا بۆ هەنجەت دەگەڕێ خاوەنەکەی پێ سووک بکا، بۆ ئەوەی بڵێ "ترێی ڕەش" هەڵەیە، دەبێ بڵێی: "ترێ ڕەشەکە". هەموو زانیارییەک بە ئارەزووی بیروباوەڕی خۆی دەپێوێ، هێندێ جاریش بە پێچەوانەوە لە مانای نووسینەکە دەگا، ئەمە هەموو بەشێکە لە کردەوەی بەدخوێنەر.

**حەیدەر عەبدوڵڵا**: بۆ ئەزموون وەرگرتن و جیهانبینی سەفەر سوودی زیاترە، یان خوێندنەوەی کتێب، دەکرێ بڵێین تەواوکەری یەکترن، یان جیاوازییان هەیە لە ڕووی بەهرە و چێژوەرگرتن؟

**مارف خەزنەدار**: ئەم پرسیارە گرنگە، بەڵام زۆریش وەڕامی دراوەتەوە. من ناتوانم بڕیار بدەم کامیان گرنگترن، سەفەر یاخود خوێندنەوە! وابزانم هەردووکیان گرنگن. ئەمە بەو کەسە دەگۆڕێ کە بەپراکتیک لەناو هەردووکیان دا دەژی. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە هەندێ بەڵگەت بۆ دەهێنمەوە.

(أ) لە بابەت خۆمەوە ئەگەرچی ئەو زانیارییەی لە ڕێگەی کتێبەوە وەرمگرتووە، هەندێک لەو زانیاریانە زیاترە کە لە سەفەردا بە بینینی ئاشنایەتیم لەگەڵیانا پەیدا کردووە، هەروەها ئەوەی کتێب ڕێگەی بۆ خۆش کردووم لە زۆر شت بگەم کەم نییە. جگە لەوەی هەندێ جاری دیکە سەفەر گەلێ شتی بۆم ڕوون کردووەتەوە، کە کتێب لە هەقی نەهاتووە، ئەمەش لەبەر ئەوە سەفەرەکانی من



درێژخایەن بوون، لە وڵاتانی ئەوروپا و ئەفریقا، لەناو کۆمەڵانی هەمەڕەنگ، لە ڕووی پێشکەوتن و وەزعی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە. ئەم سەفەرانەی من بە ڕوونی لە یادداشتەکانمدا "ڕۆژگاری من" ڕەنگیان داوەتەوە.

(ب) کەسی وا لەناو کۆمەڵ بەرچاو دەکەوێ وەکو ڕۆشنبیرێکی پڕزانیاری، کەچی لە ڕووی سەفەر و بینینی کۆمەڵانی جیاوازەوە تاقیکردنەوەی نەبووە، تەنیا بە خوێندن بووە بە ڕۆشنبیرێکی ئەنسکلۆپیدی، لەوانە: جەودەت ئەحمەد ناجیی برادەری سەردەمی منداڵیم تا کۆچی دوایی.

جەودەت بەڕاستی عاشقی کتێب بوو، لە خوێندنەوەدا هاوتای نەبوو، بەڵام دەستی نووسینی نەبوو، لەگەڵ ئەوەی لە هەموو بابەتێکی زانستی و ئەدەبی و هونەری بە دەموپل پڕزانیاری بوو.

(ج) هێندێ جاری دیکەش کەسانی وا هەڵدەکەون ڕۆمان لە میللەتانی دیکەی گەلێ دوور لە میللەتەکەی خۆی دەنووسن، یەکێک لەوانە نووسەری ئەڵمان "کارل مای"یە. ئەم نووسەرە بەبێ ئەوەی چاوی بە کوردستان بکەوێت، یان سەفەری لایەنێکی ئەفریقیا بکا، هەندێ ڕۆمانی بە زمانی ئەڵمانی لەسەر کورد و ئەوانەی ئەفریقا نووسیوە، لێرەدا بێگومان نووسەر تەنیا بەهۆی کتێبی مێژوو و جوگرافیا و بیستنی زانیاری پەیدا کردووە، ئەو زانیاری و شارەزاییەی لە بابەت میللەتی کورد و خاکی کوردستانەوە دیارە گەیشتووەتە پلەیەک بتوانێ ڕۆمانێکی لێ دروست بکا بە ناوی "لەوڵاتی دلێراندا"، لە پاشانا ڕۆمانەکە کراوە بە فیلمی سینەما.

**حەیدەر عەبدوڵڵا:** تا چەند بروانامەی ئەکادیمی مەرجە بۆ ئەوەی نووسەرێکی باش و سەرکەوتوت لێ دەرچێ، دەشێ مرۆڤ لە دەرەوەی ئەکادیمیا خۆی پێبگەیێنێت و بگاتە ئاستێکی بەرز و مەزن بە تایبەت لەم سەردەمەدا؟

**مارف خەزنەدار:** پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە، ئارەزوو دەکەم قسەیەک لە بابەت وشەی ((ئەکادیمی)) یەوە بکەم. ئەمە یەکێکە لە وشانەی بە زۆری لە چاپەمەنی سەردەم بەکار دەهێنرێت، خەڵکەکە بەتایبەتی ئەوانەی لە ئەوروپا دەژین بەکاری دەهێنن، بەگشتی شێوازەکەی ڕاست نییە و لە جێی خۆی بەکار ناهێنرێ.

ئەکادیمییە لە وشەی گریکی کۆنەوەیە ((ئەکادیمۆس)). ئەمە ڕەمزی ئەفسانەیی زانستی بوو، لە پاشاندا بووە بە ناوی جێگە بۆ دەزگای زانستی بەکار هێنرا. ئەم دەزگایە لە سەرووی زانستگەوەیە. ئەکادیمی بەو کەسانە دەگوترێ کە مامۆستان، یان قوتابی خوێندنی باڵان لە زانستگە، بەم جۆرە هەموو ئەکادیمییەک قۆناغەکانی زانستگەی تەواو کردووە، کەچی هەموو مامۆستایەک، یان قوتابییەکی زانستگە مەرج نییە پەیوەندی بە ئەکادیمیاوە هەبێ. بەڵام ئەگەر وەکو سیفەتێک دەکرێ بۆ خوێندەوار و ڕۆشنبیرێکی گەورە و دیار بەکار بهێنرێ نەک وەکو ئەو فەوزا و شێوانەی لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆوارە کوردیەکاندا دەکەونە بەرچاو. هەر کەسێکیش سەرەداوێک لەناو ورگیدا هەبێ و بە مەرجێ لە ئەوروپا گەڕابێتەوە ((ئەکادیمی)) پێ دەڵێن. وەک سیفەتیش من ئەگەر ببیستم بۆ کەسانێکی وەک تۆفیق وەهبی و جەمیل ڕۆژبەیانی و عەلائەدین سەجادی و شێخ محەمەدی خاڵ و هی دیکە بەکار هێنراوە، دەست خۆشی لە نووسەرەکە دەکەم. بەگشتی بڕوانامەی زانستگە مەرج نییە بۆ نووسەری داهێنەری تێکستی شیعر و پەخشان بە هەموو بابەتەکانیەوە، بڕوانامە زیاتر بە لێکۆڵینەوەی ئەدەب و ڕەخنە و بەراوردکاری ئەو زانستانەی لە ئەنجامی بەرهەمی ئەدەبیدا داهێنراو دروست بوون وەکو زمان و زانستەکانی، عەرووز و کێش و قافیە، ڕەوانبێژی بە هەموو بابەتەکانیەوە.

ئێمە بۆ پێگەیاندنی خوێندەوار و ڕۆشنبیری بەدیمەن حوجرەشمان هەیە، ئەم حوجرەیە مەلای گەورەی بۆ دەرکردووینەتەوە، بەشی زۆری شیعری کلاسیکیمان خاوەن ئەم بڕوانامەیە دروستیان کردووە، بەڵام ئەوە هەیە لە سەردەمی ئێستا ئەو بڕوانامەیە بەتەنیا ڕۆشنبیری

مۆدێرنی سەردەم دروست ناکا. خۆ ئەگەر ڕێک بکەوێ لەگەڵ بڕوانامەی حوجرە لە قوتابخانەی ڕەسمی تازەش بخوێندرێ و ئەم فەزا زانستیانە تێکەڵ بە یەکتری بکرێن لە ئەنجامدا ڕۆشنبیری گەورە لە کۆمەڵدا پەیدا دەبێ.
بەڵگەی ئەم دیاردەیە لە میسر دەست دەکەوێ. هەندێ لە زانایانی ئایینی ئیسلام کە زانستگەی ئەزهەر تەواو دەکەن، لەپاش ئەمە دواپلەی خوێندنی زانستی لە زانسگەکانی ئەورووپا دەبەنە سەر، ئینگلیزی، فەرەنسی، ئەڵمانی، یان ئەوانی دیکە. ئەمە بە هەموو جۆرێکیش ناکرێ بێدەنگ بوەستین بەرانبەر مامۆستایەکی زانستگە، کە دەگاتە پلەی پرۆفیسۆری لە کوردی بەولاوە هیچ زمانێکی تر نازانێ، بەتایبەتی ئەگەر زمانی عەرەبی بزانێ پێی شەرم نابێ زمانێکی ئەورووپایی نەزانێ! یاخود هەر بیر لەو زمانە ناکاتەوە.
لەگەڵ ئەم هەموو بیروڕا و بۆچوونانەش، نەک تەنیا لە دەرەوەی زانستگە، بەڵکو لە دوای خوێندنی دوو سێ پۆلی قوتابخانەی سەرەتایی ڕۆشنبیر و خوێندەواری وا هەیە خۆی پێگەیاندووە تا گەیشتووەتە لووتکەی بەرزی داهێنان.
بەڵگە بۆ ئەم قسەیە هەردوو نووسەری گەورەی میسری: تەها حسێن و عەباس مەحموود عەقادە، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا یەکەمیان بڕوانامەی هەرەبەرزی زانستگەی ئەزهەر و زانستگەی پاریسی وەرگرت، کەچی عەقاد لە پۆلی چوارەمی سەرەتاییەوە وازی لەخوێندن هێنا، بەڵام بەناوباگترین نووسەر و ڕۆشنبیری میسری بوو، جا ئەگەر تەها حسێن لەفەرەنسا فێری زمانی فرەنسی بووبێ، عەقاد لە قاهیرە بەبێ مامۆستا خۆی فێری زمانی ئینگلیزی کردبوو.

**حەیدەر عەبدوڵڵا:** چاپەمەنی ئێستای کوردی شێواو و شپرزەیە، شالاوێکی زۆری کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤار دەردەچن، زۆرکەم لا بەلای مەعریفە و ڕۆشنبیری دەکەنەوە، لە ڕوانگەی زمان و ڕێنووسی کوردییش لاوازن، تۆ وەک کەسێکی نووسەر و ڕۆشنبیر ئەم دیاردەیە بۆچی دەگێڕیەوە؟

**مارف خەزنەدار:** هۆی شێواوی و شپرزەیی ڕەنگدانەوەی جۆری بۆچوون و بینینی دەسەڵاتە. دەسەڵات واتە ئیدارە، بەڕێوەبەر، کاربەدەست، یان بە واتایەکی ڕوونتر حکوومەت، ئەگەر لە هەر کۆمەڵێک (موجتەمەعێک) وەزیفە بدرێتە لێزان و شارەزای کارەکە، بە مەرجێ ئەو کەسە ئازاد و سەربەست بێ لە کردەوە و ئیدارە، ئاژاوە لەنێو کۆمەڵدا نامێنێ. ئاژاوەی ئێمە تەنیا لە چاپەمەنی و ڕۆژنامەگەریدا نییە، بەڵکو لە هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵ، بەتایبەتی ئابووریی و کۆمەلایەتی.
ڕێگە بەم هەموو ڕۆژنامە و کۆوارانە دەدرێ بە ناوی دیموکراتی و سەربەستییەوە، کەچی لەم لایەنەوە مەرج هەیە بووە بە قانوون و نەریت. لە هەموو دنیا سەرنووسەری ڕۆژنامە و کۆوار پێویستە خوێندەوار بێ. خاوەن ئیمتیاز پارەداربێ، ئەگەر خوێندەواریشی نەبێ مەسەلە نییە، کەچی زۆرجار دەنووسن خاوەن ئیمتیاز هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرایە، بەڵام سەرنووسەر سەرەواوێک لە ورگیدا نییە.
بەگشتی ڕۆژنامەگەریی کوردی کەوتووەتە دەست ناشارەزایانەوە. زۆربەیان پێش هەموو شتێک ئاگاداری مێژووی سەنعەتەکەی خۆیان نین، لەبەر ئەوە ئەو وشە و زاراوە و تەعبیر و لێکسیکۆنەی بەهۆی زانا و ڕۆشنبیری کورد لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە دروست بوو، بەتایبەتی لەسەر لاپەڕەکانی کۆواری ((گەلاوێژ)) (١٩٣٩- ١٩٤٩) و ((دەنگی گێتی تازە)) (١٩٤٣- ١٩٤٧) ڕۆژی ئەمڕۆ لەکار کەوتن، لەباتی ئەوەی پارێزگاری بکرێن، بەربەرەکانی کران و لە جێی ئەوانە وشەی بێ مانای ناقولای ناکوردی کەوتنە ناوەوە، لێرەدا ماوەی باس کردنیان نییە. پێویستە لایەنێکی زانستی هەبێ سەرپەرشتی ئەم کارە بکا، بە مەرجێ بە قانوون دەستەلاتی هەبێ موحاسەبەی هەموو کەسانێک بکا کە زمانی نووسین دەشێوێنن، پێوست ناکا موحاسەبە تەنیا لە مەجالی بیروڕا و بۆچوونی فیکری و سیاسی بێ، تێکدانی زمان زیانی لەوە زیاترە.

**حەیدەر عەبدوڵڵا:** حەز دەکەین بە جۆر و شێوازی نووسین و خوێندنەوەی تۆ ئاشنابین، چۆن دەخوێنیەوە؟ کەی دەخوێنیەوە؟ کاتی دەنووسی هەست بە چی دەکەی؟

**مارف خەزنەدار:** ئەوەی ناوی کتێب بێ



دەیخوێنمەوە، زیاتر ئەو کتێبانەی پێچەوانە و دژی بیروباوەڕی منیان گرتووەتە خۆ. کتێبی سیحر و جادوو و ئەفسانە و هەموو شتێکی باوەڕمان پێیان نییە، لەبەر ئەوەی بە هۆشیاری دەیانخوێنمەوە، سوودیان لێ وەردەگرم و شتی تازەم فێر دەکەن. لە بیروباوەڕی هەڵە، لە ئەدەب و فەلسەفە قازانجم زۆرە. لە سەرچاوە و نووسینی ناڕاست و بیری غەیبی دەستکەوتم زۆر بووە. لە نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی سەرکەوتنم لەوەدابوو، فێری ئەوە بووم ئەم هەڵانە نەکەم. نووسین بۆ منداڵان عیشقی هەمیشەییمە. ژنم زۆر خۆش دەوێ، هەرچی لەسەری بنووسرێ دەیخوێنمەوە، تەنیا یەک شت نەبێ "بەرگریکردن لە مافی ئافرەت"، چونکە وا دەزانم ئەو ئادەمیزادە نازدارە بۆ جوانی و دڵداری دروست کراوە.

هەرچی جۆری نووسینیشە ئەمەیان تۆ دەیزانی من چی دەنووسم! چونکە تۆ دەیانخوێنیەوە. بەکورتی ئەمەیان بابەتە. یەکەمیان من خۆم زیاتر بە نووسەر دەزانم. وتاری ئەدەبی و چیرۆکی کوردیادە و نالی لە دەفتەری نەمریدا و هیی دیکە. ئینجا خۆم بە مامۆستای زانستگە دەزانم و لەگەڵ لێکۆڵینەوە دەژیم.

لە هەموو شوێنێک و کاتێکدا دەخوێنمەوە. لەناو ماڵ، لە جێگەی کار، لەناو پاپۆڕ و شەمەندەفەر و فڕۆکە، بە شەو بە ڕۆژ، بە مەرجێک کەس نەبێ قسەی لەگەڵدا بکەم. ئیتر ناچار دەبم گوێ لەوە بگرم، ئەوەی لەنێو کتێبەکەدا نووسراوە، واتە دەمی من سێ شتە: بیرکردنەوە، خوێندنەوە، نووسین. لەمەبەولا هیچی تر نییە. کە دەست بە نووسین دەکەم وادەزانم ئەوەی لە خەیاڵ و مێشکم دایە وەکو خۆم دەمەوێ ناچێتە سەر کاغەز، ئەمەیان لە کاتی نووسینی بەرهەمی داهێنراوی ئەدەبی، بەڵام کە دەست بە نووسین دەکەم بە پێچەوانەوە بیروڕای زۆر جوانم بۆ دێ و دڵم خۆش دەبێ، ئیتر نازانم باوەڕ بە تیۆری ئەفلاتوون و مەلایکەتەکە بکەم، یان بە شوێن شەیتانەکانی دۆڵی عەبقەری عەرەبی بگەڕێم!

**حەیدەر عەبدوڵڵا:** حەز دەکەی چی بە نووسەرە نوێیەکان بڵێی، کە هەڵپە و پەلەیانە لەخۆدەرخستن و بڵاو کردنەوەی بەرهەمەکانیان؟

**مارف خەزنەدار:** بەو نووسەرانە دەڵێم زۆر بخوێننەوە و کەم بنووسن، چونکە نووسین پێویستی بە زانیاری هەیە، زانیارییش بە خوێندن دەست دەکەوێ. هەرچەندە ناتوانم موعادەلە یان تیۆرێ بۆ ئەم مەسەلەیە دابنێم، بەڵام ئەوە دەڵێم لە سەرەتادا نووسەری گەنج پێویستە زۆر بخوێنێتەوە. لە ناوەڕاستی ژیانیدا دەتوانێ ماوەی نووسین و خوێندنەوە وەک یەک بن، بەڵام کە بەساڵاچوو دەتوانێ نووسینی لە خوێندنەوە زیاتر بێ، چونکە زانیاری گشتی زۆر دەبێ. من خۆم ئەم بیروڕایەم نەخستووەتە پراکتیکەوە، ئێستا و ئەوساش کاتی خوێندنەوەم لە نووسینەوەم زیاترە.

**حەیدەر عەبدوڵڵا:** دواوتە و پەیامت بۆ خوێنەر و نووسەران؟

**مارف خەزنەدار:** خوێنەر مافی خۆیەتی چی دەخوێنێتەوە، دیارە مەبەستم بەرهەمی داهێنراوە: شیعر، چیرۆک، ڕۆمان هتد... پێویستە بیروڕای خاوەن کتێب بەهێند هەڵبگرێ، واتە ڕایەکی بەدڵ نەبوو بە قوربانی ئەو بیرەی خۆی نەکا کە بە دڵیەتی. شتەکان تێکەڵوپێکەڵ نەکا. ئەگەر بۆچوونێکی دیارکراوی خاوەن کتێبێک بە دڵی نەبوو، نابێ هەموو بەرهەمەکانی ڕەفز بکا. ئەمە لە نێوەندی خوێندەواری ئێمەدا باوە. هەرچی نووسەریشە پێویستە بەرهەمی داهێنراوی سەرچاوە بێ بۆ مشتومالکردنی عەقڵ و خەیاڵ و چێژی خوێنەر، لە چوارچێوەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەی خۆیدا. بەمەش دیارە ناتوانێ هەموو تاکێکی کۆمەڵ ڕازی بکا، ئەو کاتەی ئەوانەی ڕازی نابن، لە خانەی مرۆڤی ئاسایی دەچنە دەرەوە.




# د. مارف خەزنەدار لە دووتوێی یادداشت و نامەکانیدا

بەڕێز عەباس عەلی

(د. مارف خەزنەدار 1930-2010) چاپی یەکەمی یادداشتەکانی بە ناونیشانی (ڕۆژگاری من) لە نێوان سالانی 2009-2014 بلاوبووەتەوە، کە بریتییە لە حەوت بەرگ، بەرگی یەکەم و دووەمی سالی 2009 و بەرگی سێ و چوار و پێنج سالی 2010 و بەرگەکانی شەش و حەوتیش دوای کۆچی دوایی خۆی بلاوکراوەتەوە، بەرگی شەش سالی 2011 و بەرگی حەوت سالی 2014 بلاکراوەتەوە. کۆی لاپەڕەکانی هەر حەوت بەرگەکەش بریتییە لە (1694) هەزار و شەش سەد و نەوەدوچوار لاپەڕە!

یادداشتەکانی لە ڕۆژی لە دایکبوونییەوە دەست پێ دەکات تا وەکو سالی 1991، بۆ هەر بەرگێک بەم شێوەیە ناونیشانەکانی نووسیوە: بەرگی یەکەم (پەیدابوون 1930-1939)، بەرگی دووەم (دروستبوون 1949-1960)، بەرگی سێیەم (ژیانی ڕووسیا 1960-1968˙ A)، بەرگی چوارەم (ژیانی ڕووسیا 1960-1968˙ B)، بەرگی پێنجەم (کەمێک ئاشتی و برێک هێمنی 1968-1975)، بەرگی شەشەم (هەڕەشەی سیاسی و گەشەی ڕۆشنبیری 1975-1983)، بەرگی حەوتەم و دوابەرگ (مەلبەندێکی دیکەی ژیانم و گەرانەوە بۆ نیشتمان 1983-1991).

بۆ سالی دەسپێک و کۆتایی هەر بەرگێک مەبەستی هەبووە و مانای تایبەتی هەیە لە ژیانی دوکتۆر مارف خەزنەداردا، بۆ ئەو سالانە سالی گۆڕانکاری و ڕووداوی ژیانین جگە لە سالەکانی کۆتایی بەرگی پێنج و حەوت نەبێت، وەک چۆن لە ژیان و مێژووی گشتی میللەتاندا سالەکان جیا دەکرێنەوە بەهۆی ڕووداوێکی گرنگەوە.

بۆ بەرگی یەکەم سالی 1930-1949ی داناوە، سالی 1930 سالی لە دایکبوونییەتی و سالی 1949 ئەو سالەیە بۆ خودی کەسێتیی خۆی ڕووداوە بۆیە کۆتایی پێهێناوە، چونکە وەک خۆی دەلێت: ئەو سالە وەکو سالەکانی پێشوو نەبوو، ڕۆژگاری پاش ئەویش سالی وای تێدا نەبووە! لەو سالەدا بەشداری خۆپیشاندان دەکات لە کەرکووک و دواتریش گواستنەوەی بۆ زیندانی لە بەغداد بەهۆیەوە نەهامەتی دەردەسەری زۆری بەسەردا هاتووە، هەربۆیە بە سالی گۆڕانکاری لە ژیانی خۆی داناوە، بۆ نموونە بەهۆی بەشداری لە خۆپیشاندان زیندانی دەکرێت، لە قوتابخانە دەردەکرێت و دوور دەخرێتەوە، باوکی کۆچی دوایی دەکات، هەر لەو سالەدا هەژاری و دەستکورتی و برسیەتی زۆری بۆ دەهێنێت، وردەکاری هەموو ئەو ڕووداوانە دەگێڕێتەوە و سەرچاوەیەکی گرنگ و بایەخدارە بۆ توێژەران و لێکۆلەران کە بیانەوێت کۆلینەوە بکەن. چاکەیەکی ئەو سالەش وا کردووە ببێتە بنەمای ژیان و کاریگەری لەسەر دابنێت، لەو سالەدا خۆی دەدۆزێتەوە و دەبێتە خاوەنی بیروڕای سەربەخۆ و ئازادی خۆی و خۆی بیر بۆ خۆی بکاتەوە نەوەک ئەوانیتر بیری بۆ بکەنەوە! دوای ئازادبوونی لە زیندان دەگەڕێتەوە هەولێر و لەو قۆناغەشدا گۆرانی شاعیر مالی لە هەولێر دەبێت و سەردانی گۆرانی شاعیر دەکات و بۆ دووەمجار ئاشنای بینینی دەبێت و لەو بارەیەوە دەربارەی گۆران هەندێک باس دەکاتەوە و لە سەرەتاکانی بەرگی دووەمی یادداشتەکانی دەگەڕێتەوە سەرباسکردنی گۆران، بە باسکردنی چیرۆکی ئەو ڕۆژەی باوکی کۆچی دوایی دەکات و کاریگەرییەکانی کۆتایی بە بەرگی یەکەمی دەهێنێت.

بەرگی دووەمی بۆیە بە سالی 1960 کۆتایی پێهێناوە، لەبەر ئەوەی لەو سالە و بەدیاریکراوی لە 16ی مارتی 1960 بۆ درێژەدان بە خوێندنی بالا لە بەغداوە سەفەر بۆ ڕووسیا دەکات و عێراق و کوردستان بەجێدەهێلێت و وێستگەیەکی تری ژیانی لە تاراوگە دەست پێ دەکات، کە بۆ ژیانی دکتۆر مارف خەزنەدار ڕووداوە و کۆتایی قۆناغێک و دەسپێکی قۆناغێکی ترە.

بەرگی سێیەم و چوارەمی بیرەوەرییەکانی دکتۆر مارف خەزنەدار تایبەتە بە ژیانی ڕووسیا و زۆرترین لاپەڕەی یادداشتەکانی بۆ تەرخان کردووە، کە بریتییە لە (496) چوارسەد و نەوەدوشەش لاپەڕە. ئەم دوو بەرگە وەک

لە ناونیشانەیدا دیارە تاوەکو ساڵی (1968)ە، چونکە لەو ساڵەدا کۆتایی بە ژیانکردن لە ڕووسیا دێت و دەگەڕێتەوە عێراق و کوردستان و قۆناغێکی تری ژیانی دەست پێ دەکات، بۆیە ئەویش کۆتایی بە نووسینەکەی دێنێت.

بەرگی پێنجەمی یادداشتەکانی بە ساڵی 1968 دەست پێ دەکات ئەو ساڵەی ڕووسیای بەجێدێڵێت و دەگەڕێتەوە و بە ساڵی 1975 کۆتایی دێت، ئەوەی مایەی سەرنج و تێبینییە ئەوەیە وەک بەرگەکانی تر هۆکاری ئەوەی تێدا نییە، یان بابڵێین ڕووداوێک ناگێڕێتەوە کە لەو ساڵەدا ئەوەندە کاریگەر بووبێت لە ژیانیدا ئەو بەرگەی لەو ساڵەدا کۆتایی پێهێنابێت، بەڵام لە بەرگی شەشەمدا کە دوای چەند لاپەڕەیەک بە .حەسرەتەوە باسی نسکۆی 1975 و هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول دەکات، ئەو ساڵەی کە لە بەرگی پێنجەمدا باسی نەکردووە و هەر ئەم ساڵەی بەرگی شەشەمە کە نسکۆی (1975)ە، ئەوەی جیای دەکاتەوە ئەم ساڵە بە بەراورد بە ساڵەکانی تر، کە بۆ بەرگەکانی تر دایناوە ڕووداوێکی سیاسی گشتییە کوردە و پەیوەند نییە بە تەنیا ژیانی دوکتور مارف خەزنەدارەوە.

بەرگی شەشەمی یادداشتەکانی بە ساڵی 1975 دەست پێ دەکات و بە ساڵی 1983 کۆتایی دێت. ساڵی 1981 خانەنشینی دەکەن نەوەک خۆی خانەنشین بێت. ئیدی دوای ساڵێک و چەند مانگێک لە ماڵەوە گۆشەگیری هەڵدەبژێرێت و خەریکی نووسینی چەند کتێبێک دەبێت لە بەغداد و دواتر دەگەڕێتەوە هەولێر، ساڵی 1983ی داناوە بۆ کۆتای باسەکانی یادداشتەکانی بەرگی شەشەمی لەو ساڵەدا ڕووداوێک ڕوودەدات، کە وێستگەیەگی تری گرنگی ژیانی دوکتور مارف خەزنەدارە لەو ساڵەدا دەچێتە دەرەوەی وڵات بۆ کارکردن لە زانکۆی غەننابە لە وڵاتی جەزائیر و تا ساڵی 1988 لەوێ دەبێت. بەرگی حەوتەم و دوابەرگی بە ساڵی 1991 کۆتایی دێت، کە ئەمەش ڕووداوێکی گشتییە و ساڵی ڕاپەڕینەکەی گەلی کوردە.

ناوداران، ئەدیبان، نووسەران، سیاسەتمەداران، ڕۆشنبیران و چین و توێژە جیاوازەکانی تر لە گەلانی دنیا لەژێر ناونیشانی جیاواز بیرەوەری و یادداشتەکانی خۆیان دەنووسنەوە، ئۆتۆبیۆگرافیا لە زمانی کوردیدا پێی دەوترێت یادداشت نووسینەوەی گرنگی و بایەخی زۆری هەیە، هەر ئەم هەستکردن بە گرنگی و بایەخیەی یادداشت وای کردووە لە سەرەتای سەدەی یستویەکەمەوە ژمارەیەکی زۆری تاکی کوردی یادداشتی خۆیان بنووسنەوە و بڵاوی بکەنەوە.

یادداشتەکانی دوکتور مارف خەزنەدار تێکەڵەیەکە لە یادداشتی تایبەتی و گشتی لەگەڵ باسکردنی ژیانی خۆی و پەیوەندییەکانی، زۆر باسی گشتی تر دەورووژێنێت و ئاماژەیان پێدەکات. یادداشتەکانی لە ڕووی ژمارەی بەرگ و زۆری لاپەڕەکانییەوە بە یەکەم و گەورەترین یادداشتنامە دادەنرێت لە مێژووی کورددا کە ئەکادیمییەکی کورد نووسیبێتی! لە ڕووی زۆری و چڕی باسەکانی و زانیارییەکانی ناوییەوە دەتوانین بڵێین دەچێتە ڕیزی ئەو کتێب و یادداشتانەوە، کە مرۆڤ کاتێک لە خوێندنەوەیدا دەگاتە بەرگی کۆتایی خەمی ئەوە دایدەگرێت، کە کۆتایی دێت و ئارەزووی ئەوە دەکات بەرگی تریشی بەدوادا بهاتبایە.

لەو یادداشتانەیە بە پێچەوانەوە لەبەر زۆری ژمارەی لاپەڕەوە ناتوانیت لێی هەڵبێیت، بەڵکو لەگەڵ کۆتایی هاتنی هەر بەرگێکدا بێ دابڕانێکی زۆر دەست دەبەیت بۆ بەرگی دواتر، وەک چۆن دەریا کە لە کاتی خواردنەوەی ئاوەکەیدا لەبەر سوێرییەکەی لەبری ئەوەی تینوویێتت بشکێنێت تینووترت دەکات، خوێندنەوەی یادداشتەکانی دوکتور مارف خەزنەدار بە هەمان چەشنە لە خوێندنەوەی هەر بەرگێکدا هەست دەکەیت بەرگ لە دوای بەرگ تینووتر دەبیت و تینوویێتیت ناشکێت!

یادداشتەکانی دوکتور مارف خەزنەدار تژییە لە ڕووداو و چیرۆک و بەسەرهاتی جیاواز و هەمەڕەنگ، بەهۆی زۆری گەڕان و گەشتەکانی و ئاشنابوونی بە ژمارەیەکی زۆری کەسایەتی جیاواز، ئەمەش وای کردووە لە خوێندنەوەیدا خوێنەر گەشت و گەڕان بۆ زۆر شوێن بکات بێ ئەوەی بینیبێتی و زۆر کەسیش بناسێت بێ ئەوەی چاوی پێکەوتبێت.

دوکتۆر مارف خەزنەدار ساڵی 1937

دەچێتە قوتابخانە و دەبێتە قوتابی پۆلی یەکەمی سەرەتایی لە قوتابخانەی یەکەمی هەولێر (ئوولا)، ئەوەی جێگەی سەرنج و تێبینییە بە گشتی دیدی ئێمە بۆ ڕابردوو لە کایەی پەروەردە و فێرکردن هەمیشە بریتییە لەو ڕستەیەی کە کەسوکاری قوتابی بە مامۆستانیانیان وتووە و مامۆستایانیش درێغیان نەکردووە لە جێبەجێکردنی دایک و باوکی قوتابی کە بە مامۆستایانیان وتووە: (گۆشتەکەی بۆ ئێوە و ئێسقانەکەی بۆ من) و بەم شێوەیە پێشوازی لێکراوە! بەڵام دوکتۆر شانسی زۆرباش بووە وەک دەگێڕێتەوە بەڕێوەبەری قوتابخانە هەر لەیەکەم ڕۆژەوە بەماچ پێشوازی لێکردووە و مامۆستای وانەکەشی جانتایەکی بە دیاری پێشکەش کردووە! لەڕێگەی خوێندنەوەی ژیانی سەرەتای قوتابێتی دوکتۆر مارف خەزنەدارەوە پەروەردەکاران دەتوانن پەند وەربگرن، چونکە باس لەوە دەکات لەگەڵ ژیانی قوتابخانە نەگونجاوە و بەختەوەر نەبووە تەنانەت وانەی یەکەم و دووەمی لاناخۆش بووە سێیەم و چوارەمی دڵخۆش بووە، چونکە نزیک بووە لە کۆتایی دەوام و سێ ڕۆژی یەکەمی هەفتەی مات و وەڕس بووە، کەچی ڕۆژانی پێنج شەموو هەینی دەم بە پێکەنین و دڵشاد بووە، ئەم نموونەیە پێمان دەڵێت هەر منداڵێک لە سەرەتادا بەو شێوەیە بوو لە قوتابخانە ئیدی ڕاستەوخۆ پیاسەیەکی بۆ نەکرێت بەوەی داهاتووی نییە و نابێت بە هیچ وەک لە تێڕوانینی زۆرینەدا باوە!

لە ژیانی قوتابێتی دوکتۆر مارف خەزنەدار مامۆستاکانی وەک یەک چاک یان خراپ نەبوون، لەو بارەوە دەڵێت: ئەوەی سەیرێ ئەوە بوو زۆرجار نزیکییان لەگەڵ باوکمدا دەبووە هۆی ئەوەی زیاتر لێم بخوێنن و سەرکوتم بکەن. نامق کەمال نەجیب نەبێ، کە دۆستێکی نزیکی باوکم بوو، ڕێزی لێ دەنام و هانی دەدام بۆ خوێندن.

هەندێ لەوانی تر بە جۆرێ سەرکەوتیان دەکردم کە باوەڕم بەخۆم نەمێنێ. حاجی کەریم ئەفەندی بەجوببە و عەمامەوە وانەی ئایینی پێ دەگوتین، کەچی یەکێ لە قسە ناخۆشەکانی بەمن ئەوەبوو دەیگوت: تۆ کوڕی باوکێکی چاکی، بەڵام لە دوارۆژدا شووتی و کاڵەکیشت بۆ نافرۆشرێ! بێگومان ئەم مامۆستایە لەم بڕیارەیدا ناڕاست بوو لە ڕووی سایکۆلۆجی و پەروەردەییەوە. بەڵام تاهیر عەبدوڵڵا لەبەرئەوە سەرزەنشتی دەکردم، چونکە لەوانەی ژمارە خراپ بووم، ڕێی چارەکردنی ئەمە ئاراستەکردن و ئامۆژگاری بوو، کەچی ئەو داری بۆ ئەمە بەکار دەهێنا.

دوکتۆر مارف خەزنەدار منداڵ دەبێت باوکی ژن بەسەر دایکیدا دەهێنێت، کەسایەتیی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان (کاپتن حەمەدی مەولوودیان) لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا بەناونیشانی (کوردبوون) لە زۆر جێگەدا باسی دڵڕەقی و خراپی باوەژنەکەی دەکات و ئاماژە بە کاریگەرییە نەرێنییەکانی دەکات لە ژیانی خۆیدا و چیرۆکی سەیر و سەمەرە دەگێڕێتەوە لەوبارەیەوە! ئەو وێنەیەت بۆ دروست دەبێت وا دەزانیت کە هەموو باوەژنێک وایە و ئەو وێنەیەش دروستکراوە لای تاکی کورد کە هەموو باوەژنێک بەو شێوەیەیە دوکتۆر مارف خەزنەدار ئاماژە بەوە دەکات خۆشی پێش ئاشنابوونی باوەژنەکەی هەمان وێنای هەبووە، بەڵام نازێ خانی باوەژنی دوکتۆر مارف خەزنەدار تەواو پێچەوانەی باوەژنەکەی کاپتن حەمەدی مەولوودیان میهرەبان و ڕەفتار و مامەڵە جوان بووە، لە زۆر شوێنی بیرەوەرییەکانیدا وەسف و سەنای دەکات و ئاماژە بە کاریگەری و چاکەکانی دەکات بەسەرییەوە و باوەژنی زۆر خۆشویستووە دوکتۆر مارف خەزنەدار بەمشێوەیە پێناسەی دەکات: (نازێ خان ژنێکی تێگەیشتوو بوو شارستانی و ڕۆشنبیرییانە بیری دەکردەوە). نازێ خان کاتێک بە بووک هاتووەتە لای باوکی دوکتۆر مارف خەزنەدار سندووقێک کتێبیشی لەگەڵ خۆی هێناوە. دوکتۆر مارف خەزنەدار بە نازێ خان دەڵێت دایکی دووەمم ئەوکاتەی کە نازێ خان کۆچی دوایی دەکات دوکتۆر مارف خەزنەدار لە ڕووسیا دەبێت و هەواڵی مەرگی دەبیستێت و بە حەسرەوەتەوە ئاماژە بە مەرگەکەی دەکات. تەنانەت نەیتوانیوە هەواڵی

باوەژنەکەی ڕابگەیەنێت چونکە ترساوە گاڵتەی پێبکەن بەهۆی ئەو وێنە نەرێنییە گشتییەی بۆ باوەژن هەیە، لە کاتێکدا بۆ ئەو دایکێکی تر بووە نەوەک باوەژن.

دوکتۆر مارف خەزنەدار لە یادداشتەکانی خۆیدا تەنیا باسی خۆی و خێزانەکەی ناکات، بۆ نموونە لە سەرەتای گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی خۆیدا و لە دەورەی ژیانی منداڵیدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ئاماژە بە دۆخی ڕامیاری، کۆمەڵایەتی، دابونەریت، خوو و هەڵسوکەوتی ئەو ناوچە و شوێنانەش دەکات کە بینیویەتی و تیایدا ژیاوە، ئەمەش سەرچاوەیەکی گرنگ و بە بایەخە بۆ توێژەران و لێکۆڵەران، لە شوێنێکدا ئاماژە بەوە دەکات کە لەگەڵ باوکیدا شەوان دەچوونە سەردانیکردنی ماڵەکان بینیویەتی وێنەی ڕەزا شا و کەمال ئەتاتورک و مەلیک فەیسەڵیان هەڵواسیوە، بیانوویان ئەوەبووە ئەو سەرکردانە نەتەوەی خۆیان ڕزگار کردووە، هەروەها جووەکانی هەولێر و پەیوەندییان لەگەڵیاندا، چاخانەکانی هەولێر، ساتی دەستپێکردنی دووەمین جەنگی جیهانی و بارودۆخی ئەکاتەی هەولێر، هەروەها چۆن بە بێ هوشیاری و ئاگایی خەڵکی دژایەتی ئینگلیزیان کردووە و لایەنگیری ئەڵمانیا بوون، تەنانەت گەیشتبوونە ئەوەی پێیان وابووە هیتلەر موسڵمانە! ئاماژە بە نەزانی و ناهۆشیاری کورد دەکات لە مامەڵەکردن لەگەڵ ڕووداوەکاندا.

بەهۆی ئەوەی باوەژن و باوکی کتێبیان هەبووە و ئاشنابوون بە کتێب، بۆیە ئەمیش هەر لە منداڵییەوە و لە قۆناغی دووی سەرەتاییەوە ئاشنای کتێبی دەرەوەی قوتابخانە دەبێت و دەست دەکات بە کۆکردنەوەی کتێب و دەبێتە خاوەی کۆمەڵێک دیوانی شیعری شاعیرانی وەک (نالی، سالم، کوردی، حاجی قادری کۆیی، مەحوی، شێخ ڕەزا، میسباح، تاهیر بەگ و... تاد). ئەمەش سەرەتای هۆگربوونی بووە بە کتێب و خوێندنەوەوە و دوورکەوتنەوە لە کتێبی خوێندن، وەک خۆی باسی دەکات، لە قۆناغی ناوەندی و ئامادەییش خوێندنەوەی کتێب و گۆڤار پیشەی هەمیشەیی بووە، ساڵی 1939 پۆلی سێی سەرەتایی دەبێت و لەو بارەیەوە دەنووسێت: تاقیکردنەوەی سەری ساڵ نزیک بوو بووەوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەوەسم لەسەر خوێندن و کتێبی قوتابخانە نەدەما، هەموو کتێبێک بەلامەوە کتێب نەبوو، چەند ڕقم لە کتێبی قوتابخانە دەبووەوە ئەوەندە و زیاتریش کتێبی دەرەوەم خۆش دەویست، دوورکەوتنەوەم لە کتێبی قوتابخانە نزیک بوونەوەم بوو لە کتێبی دەرەوە، نەمدەزانی چی نهێنییەک ڕام دەکێشێ بۆ کتێبی دەرەوە! ئەمە بووە هۆی ئەوەی لەوانەکانی قوتابخانە باش نەبم، بایی ئەوەندە کۆششم دەکرد لە تاقیکردنەوەدا سەر بکەوم و هەموو ساڵێک پۆل بگۆڕم، کەس لەم ڕاستییە نەدەگەیشت، نە باوکم و دایک و کەسوکار، نە مامۆستا و قوتابی، نە کەسی تر. زیرەکی لای ئەوان لەوەدا بوو هەموو ساڵ بە نمرەی بەرز دەربچی. هەروەها لە شوێنێکی تردا دەڵێت: نەمدەویست چاوم بترووکێ بۆ لای کتێبەکانی قوتابخانە، چونکە ڕەزایان گەلێ قورس بوو لەپێش چاوم. دوکتۆر مارف خەزنەدار لە لاوێتییەوە بە جۆرێک هۆگری کتێب و خوێندنەوە دەبێت هەرکاتێک لە بەغداد کاتی گونجاوی هەبوایە ڕۆیشتووە بۆ کڕینی کتێب، لەنێوان خواردنی باش و کتێبی باش دووەمیانی هەڵبژاردووە! ساڵی 1960 پێش ئەوەی سەفەری ڕووسیا بکات دایکی بەمشێوەیە ئامۆژگاری کردووە: ئەوەندە خوو مەدە کڕینی کتێب و گۆوار و ڕۆژنامە، پارەت بەفیڕۆ خەرج مەکە، هەموو هەفتە خۆت بشۆ ئەمەت لە بیر نەچێ! لە یادداشتەکانی دوکتۆر مارف خەزنەدارەوە دەتوانین ئەوە بدۆزینەوە و بخوێنینەوە، کە چۆن و لە کەیەوە لە شیعر گەیشتووە و توانیویەتی بیروڕای خۆی دەبڕێت و دیدگای خۆی بخاتە ڕوو بەرانبەر شیعر و شاعیر. دۆخی چاپ و چاپەمەنی و کتێب لەو ڕۆژگارەدا، سەردانی بۆ سلێمانی لە ساڵانی چلەکان و گێڕانەوەی زۆر لایەنی ئەو کاتە وەک شێوەی بیناسازی و دابونەریت و قوتابخانەکانی چاخانەکانی و شوێنە گەشتیارییەکانی وەکو سەرچنار...تاد. هەندێکجار کەوتووەتە بەراوردکردنی سلێمانی و هەولێر لە هەندێک لایەنەوە، بۆ نموونە وەک بەراوردی ئەوەی بۆ چی قوتابخانەکان لە سلێمانی ناویان هەیە، وەک قوتابخانەی فەیسەڵییە، کەچی قوتابخانەکانی هەولێر بە ژمارەن، وەک ژمارە یەکەم و دووەم!



تامەزرۆی دیتنی شێخ مەحموود بووە، بەڵام ڕێک نەکەوتووە و شێخ قادری برای بینیوە، بەڵام ئاواتی دێتەدی و ساڵی 1956 چاوی بە شێخ مەحموود دەکەوێت.

ئەوەی مایەی سەرنجە لە بیرەوەرییەکانی دوکتۆر مارف خەزنەدار ئەو وردەکارییە لە گێڕانەوەدا، کە سەردانی ماڵە خزمێکی یان کەسێکی تر دەکات وردودرشتی دەگێڕێتەوە و دەتوانین بڵێین شتێکی ئەوتۆ بەجێناهێڵێت نەیگێڕێتەوە، سەردان و گەشتەکانی لە گەڵ خێزان و کەسوکاریدا هیچ نەماوە نەیڵێت وەک ئەوەی لە سەیران باسکردنەکان لەسەرچیبوون و جۆری نانخواردن. دۆخی سینەمای ئەوکات و فیلمەکانیان و چۆنێتیی سەردانکردنی ژنان و پیاوان لە سینەمای موسڵ و هەولێر و کەرکووک. بینینی گەورە پیاوانی کورد هەر لە منداڵییەوە مایەی سەرسامی دوکتۆر مارف خەزنەدار بووە، لەوانە بینینی مەلا ئەفەندی. کتێبی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی ڕەفیق حیلمی وەک سەرەتایەک کاریگەرییەکی زۆری هەبووە بەسەرییەوە، بۆ ئاشنابوون بە ژمارەیەکی زۆری شیعر و ژیانی شاعیران. دووەمین جەنگی جیهانی و کاریگەرییەکانی و ڕەوت و ئاراستە فیکری و حیزبییەکان و بارودۆخی کۆتایی جەنگ و ئاشنابوونی بە هەندێ ڕێکخراو و حیزبی کوردی، وەک هیوا و شۆڕش و ڕزگاری و یەکێتیی تێکۆشین و خوێندنەوەکانی بۆ ئایدیۆلۆجیای چەپ لەو قۆناغەدا و بارودۆخی خوێندن، لەو بابەتانەن ئاوڕیان لێ دەداتەوە. کەسایەتیی ناسراوی کورد گیو موکریانی لەو کەسایەتییانە بووە دوکتۆر مارف خەزنەدار ناسیویەتی، تەنانەت بۆ ماوەی سێ مانگ لە دوکانی وێنەگرتنەکەیدا شاگردی کردووە.

لە ڕێگەی خوێندنەوەی یادداشتەکانی دوکتۆر مارف خەزنەدارەوە بەهۆی زانیارییەکانییەوە دەکرێت خوێندنەوە بۆ دونیابینیی تاک و کۆمەڵی کوردی بکرێت، لە هەندێک لایەنەوە، بۆ نموونە لە گێڕانەوەیەکیدا، کە دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم و کاتی بەهار و نەورۆز دەڵێت: ئێمە لە ئاگرکردنەوە دەترساین، ترسمان لە میری و ئینگلیز نەبوو، بەڵکو زیاتر لە خۆمان هەندێ مەلا و شێخ و دەروێش و سۆفی و چەقووەشێنی کورد و ئەوانەی بە تورکمانی قسە دەکەن، ئەمانە دەیانگوت ئەمە ئاگری مەجووس و زەردەشتییانە! دوکتۆر مارف خەزنەدار شاربەدەرکردنەکەی مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانیش دەگێڕێتەوە، کە چۆن بەهۆی ئەوەی جەژنی نەورۆزی بە حەڵاڵ زانیوە ئیهانە کراوە و لە هەولێر دەریان کردووە و نەیانهێشتووە بمێنێتەوە و ڕاویان ناوە بۆ کەرکووک!

هاشم عەقراوی هاوڕێی سەردەمی قوتابخانەی دوکتۆر مارف خەزنەدار بووە، دوای دەبێتە وەزیر دڵی لە دوکتۆر مارف خەزنەدار دێشێ بەو بیانووەی لەبەر ئەوەی گوتوویەتی: دەوڵەت دەتوانێ لەسەر شەقام هەزار وەزیر هەڵبژێرێ، بەڵام ناتوانێ مامۆستایێکی زانستگا بدۆزێتەوە... وای زانی بوو مەبەستی لە وەزیرەکە ئەوە و لە مامۆستاکە عەلائەدین سەجادییە!

دوکتۆر مارف خەزنەدار خوێندنی ئامادەیی لە کەرکووک خوێندووە و بۆ ماوەیەک لەوێ ژیاوە و بارودۆخی خوێندن و سیاسی و پەیوەندییەکانی خێزانەکەی دەگێڕێتەوە، لەگەڵ مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی پەیوەندی باشی هەبووە و بەیەکەوە سەردانی شوێنەکانیان کردووە لە کەرکووک، هەر لەکەرکووک شوکر مستەفا و محەمەدتۆفیق وردی دەناسێت و ئاشنایەتی و ناسیاوی لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی تر دروست دەکات، بۆ یەکەمجار لە کەرکووک قانیعی شاعیر دەبینێت. بارودۆخی کۆمەڵایەتی شاری کەرکووک و شێوازی ژیان و بازار و چایخانەکانیان و کاکەییەکان باس دەکات و لە چەند ڕوویەکەوە دیسانەوە بەراوردی دەکات بە شاری هەولێر. یەکەم چیرۆکی دڵداری و خۆشەویستی دوکتۆر مارف خەزنەدار لە شاری کەرکووک تا ڕادەیەک جیاواز و نائاوە. ئەویش ژنێک دەبێت بە ناوی سەبیحە، کە مێردی هەیە و منداڵێکیشی هەیە، بەڵام ئەوکاتەی

دوکتۆر مارف خەزنەدار کەوتووەتە داوی دڵدارییەوە وایزانیوە کچە، چونکە سەبیحە تەمەنی منداڵ بووە و لەوە نەچووە مێردی کردبێت، دواتر ئەمەی بۆ دەردەکەوێت لە ڕێگەی باوەژنەکەیەوە. دواتر پەیوەندی دروست دەکەن و وای لێدێت پەیوەندییەکە بەیەکەوە دەڕۆن بۆ سینەماش!
دوکتۆر مارف خەزنەدار وەک دەگێڕێتەوە، تەمەنی نەگەیشتووەتە بیست ساڵ وتاری نووسیوە، لەسەر چیرۆکی ڕووسی و شیعری ئینگلیزی و فەرەنسی، وتارێکی لە بابەت چیرۆکنووسی گەورەی ڕووسیا (چێخۆف) نووسیوە و لە گۆڤاری (گەلاوێژ) بڵاوبووەتەوە.
لە سەرەتای سەردەمی لاوێتییەوە کە لە سەرەتای بیستەکانی تەمەنی دابووە و قوتابی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی بووە بەهرەی نووسین و وەرگێڕانی تێدا دەردەکەوێت و لە ڕۆژنامەی (هەولێر)ی ئەو سەردەمەدا گۆشەیەکی دەبێت بە ناونیشانی (لە ئاوازی ڕۆژئاوا) دەست بە بڵاوکردنەوەی بابەتی وەرگێڕدراو دەکات لە عەرەبییەوە بۆ کوردی، بەتایبەتی شیعری شاعیرانی ڕۆژئاوای وەکو (لامارتین، لاندەر، بایرۆن، ئۆسکار وایلد، تۆماس مۆر، هێنری هاینی، والتەر دی لامار، شکسپیر، شیلی و...تاد).
ناکرێت بتەوێت لە بارودۆخی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی لە ساڵانی پەنجاکانی سەدەی ڕابردووی کوردستان بە شێوەیەکی گشتی و شاری هەولێر بە شێوەیەکی تایبەتی تێبگەیت و یادداشتەکانی دوکتۆر مارف خەزنەدار نەخوێنیتەوە.
دوکتۆر مارف خەزنەدار سەرەتا لە کۆلێجی ئابووری و بازرگانی زانکۆی بەغداد وەردەگیرێت، بەڵام بەهۆی ئەوەی پارەی کرێی خوێندنی پێنادرێت، کە بریتییە لە پێنج دینار بە نابەدڵی و دڵشکاوییەوە واز دەهێنێت، چونکە لە شەو خوێندوویەتی نەوەک لە ڕۆژ خوێندنی شەویش بە پارە بووە و ویستوویەتی لەو ڕێگەیەوە هەم کرێی خوێندن و هەمیش بژێوی ژیان پەیدا بکات، چونکە نەیتوانییەوە لە ڕۆژ دەوام بکات! لە 31ی مارتی 1952 بۆ یەکەمجار وەک مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی دادەمەزرێت لە گوندی (عەوێنە)، کە یەکێکە لە گوندەکانی ناوچەی دزەیی.
دوکتۆر مارف خەزنەدار لە هەندێک شوێنی یادداشتەکانیدا ژیانی تایبەتی خۆی دەگێڕێتەوە، وەکو چوونی بۆ تیاترۆ و کاباری(مەلها)کان. دوکتۆر مارف خە[illegible] [illegible] [illegible] عەرەبی کۆلێژی ئەدەبیات و زانستی بەغدا[illegible] تەواو [illegible] وەرگیرانی لەو بەشە و چیرۆکی دژایەتیکردنی بۆ ئەوەی لەو بەشە نەخوێنێت، لەوانەیە تەنیا بەسەر دوکتۆر مارف خەزنەداردا هاتبێت! مامۆستا و ڕاگر پێی دەڵێن بچێتە بەشێکی تر بەتایبەتی ئارکیۆلۆجی، بەڵام ئەو هەر سوور دەبێت لەسەر بڕیارەکەی و تادواتر وەری دەگرن.
دوکتۆر مارف خەزنەدار نەوەک هەر ژیانی جیاواز و تایبەتمەند بووە، بەڵکو لە خەڵاتوەرگرتنیشدا تایبەت بووە، ئەوەتا ساڵی 1954 ئاهەنگێک ساز دەکرێت بەهۆی هاتنی قوتابیانی تازەوە لەو ئاهەنگەدا بڕیاردراوە خەڵات و پاداشت بدرێت بەسەر دەرچووەکانی خاوەن شیکترین جلوبەرگی کوڕوکچ، جوانترین خواردن خۆر، جوانترین جگەرەکێش، باشترین هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی، لە ئەنجامدا دوکتۆر مارف خەزنەدار پاداشتی جوانترین جگەرەکێش وەردەگرێت، کە بریتی بووە لە گلۆسێک جگەرەی کامیل(camel) لەگەڵ چەرخێک. ئەوەندە بە بەردەوامی جگەرەی کێشاوە و جگەرەکێشێکی ئەوتۆ بووە زۆرجار پێویستی بە شقارتە نەبووە!
ژیانی قوتابێتی کۆلێجی ئەدیبیاتی بەغداد و ناسینی چەند کەسایەتیەکی ڕۆشنبیر و شاعیر و بەناوبانگ باسکردنی بڵاوکراوە و بارودۆخی ڕۆشنبیری ساڵانی پەنجاکان بڵاوکردنەوەی نووسینەکانی لە ڕۆژنامەکاندا و چیرۆکی بڵاوکردنەوەی کتێبی شیعری (أغانی کردستان) و دەنگدانەوەکانی، کە وەرگێڕانی چەند شیعرێکی کوردییە بۆ سەرزمانی عەرەبی تا ئەوکاتیش هەر قوتابی کۆلێج بووە و دەرچوونی لە کۆلێجی ئەدەبیات ساڵی 1957 بەشێکی گرنگی بەرگی دووەمی یادداشتەکانی پێکدەهێنن.
دکتۆر مارف خەزنەدار یادداشتەکانی تەنیا زانیاری کەسی نین، بەڵکو سەرچاوەیەکی گرنگی مێژوویین، ئەویش بەهۆی ئەوەی هەندێک کەسایەتی بینیوە کەسایەتیی گشتین و لە میانەی چاوپێکەوتن لەگەڵیاندا دید و ڕوانینیان باس دەکات لەو کاتەدا، یەکێک لەو



سەرگوزەشتە گرنگ و مێژووییەیانەی دەیگێڕێتەوە بینینی شێخ مەحموودی حەفیدە. لە زووەوە تامەزرۆی بینینی شێخ مەحموود بووە تا ئەو کاتەی قوتابی کۆلێج دەبێت ئاواتەکەی دێتەدی، ساڵی 1956 شێخ مەحموود دواڕۆژەکانی ژیانی لە نەخۆشخانەی سامەرائی لە بەغداد بەسەر دەبات. لە ڕێگەی یارمەتیدانی ڕەفیق حیلمییەوە دەتوانێت لەگەڵ گیو موکریانی و بەشیر موشیرەوە سەردانی نەخۆشخانە بکات و چاویان بە شێخ بکەوێت و سەردانی بکەن پێش ئەوانیش مەلیک فەیسەڵی دووەم و عەبدولئیلاە لای شێخ بوون و سەردانیان کردووە. دکتۆر مارف خەزنەدار دەڵێت دوای خۆناساندن کەوتە قسەکردن لەگەڵماندا. لە قسەکانی شێخ مەحموود بۆیانی کردووە ئەمانە بوون: ئێمە ئیشی خۆمانە نەئەزانی، پیاوی دڵسۆز کەم بوون، هەڵەمان ئەکرد، فێری سیاسەت نەبووین، نەماندەزانی چۆن لەگەڵ دوژمندا حیسابی خۆمان بکەین، خوێندەوارمان بکەم بوو، ئێمە سەرنەکەوتین، بەڵام ئێوەن ئومێدی ئەم کوردە قوڕبەسەرە، چارێکی بکەن، ئەوەی ئێمە بۆمان نەچووە سەر ئێوە بەعیلم و مەعریفەت بیکەن. پێش ئەوەی ماڵئاوایی لە شێخ مەحموود بکەن دکتۆر مارف خەزنەدار داوای دیاری لێ دەکات شێخ مەحموودیش تەسبیحەکەی دەداتێ.

لە ڕێگەی ئەم یادداشتانەوە هەندێک زانیاری مێژووییمان بۆ ئاشکرا دەبێت، بۆ نموونە ڕەفیق حیلمی خۆی وردەکاری چۆنێتیی چاپکردنی یادداشتەکانی نەگێڕاوەتەوە، لە یادداشتەکانی دکتۆر مارف خەزنەدارەوە بۆمان دەردەکەوێت ساڵی 1957 بەرگی یەکەم تا پێنجەم خۆی پاکنووس و سەرپەرشتی چاپی کردووە و جەمال خەزنەداری براشی بەرگی شەش.

دوکتۆر مارف خەزنەدار وەک خۆی دەیگێڕێتەوە هەمیشە خەونی بەوەوە بینیوە ببێتە پارێزەر، دوای ئەوەی دەبێتە قوتابی کۆلێجی ئەدەبیات مەیلی دەکەوێتە سەر ئەدەب و فەلسەفە و بەدرێژایی ژیانی بەردەوام دەبێت.

جیاواز لە هەموو ئەو کەسایەتییانەی لە ژیانیدا هەیە و باسی کاریگەرییەکانیان دەکات (توفیق وەهبی) جێگەیەکی تایبەتتری لای هەیە و کاریگەرییەکانیان لەوانیتر زیاتر بووە لەسەری ئەمەش کاتێک زیاتر ڕوون دەبێتەوە، کە بیرەوەرییەکانی دەخوێنیتەوە لە زۆر شوێندا ناوی دەهێنێت و وەسفوسەنای دەکات، بۆ نموونە لە جێگەیەکدا بەم شێوەیە هەستی خۆی دەردەبڕێت و دەنووسێت: چۆن چوار ساڵی خوێندنی کۆلێجی ئەدەبیات باوەڕنامەی پێبەخشیم، هەروەها توفیق وەهبی و کوڕەکانی و ماڵەوە و نامەخانەکەی باوەڕنامەیێکی مەزنتریان پێ بەخشیم هەتا هەتایە شانازی پێوە بکەم. توفیق وەهبی فێری هەموو ئەو شتانەی کردم کە لە کۆلێج فێریان نەدەبووم، من ناڵێم ئەوانەی توفیق وەهبی تەواوکەری کۆلێج بوون، پێچەوانە ڕاستە، کۆلێج تەواوکەری قوتابخانەی ماڵی توفیق وەهبی بوو بۆ من!

دوکتۆر مارف خەزنەدار ساڵی 1957، کە ئەوکات تەمەنی 27 ساڵ دەبێت لەگەڵ سەعدیە ساڵح عەلی چەغماغچی تەمەن 17 ساڵی پوورزای لە باوکەوە، هاوسەرگیری دەکات و حەسەن زیرەک گۆرانییێژی ئاهەنگەکەیانە.

دوای تەواوکردنی کۆلێجی ئەدەبیات ساڵی 1957، لە قوتابخانەی ناوەندی شەرقیە لە شاری کەرکووک وەک مامۆستای زمانی کوردی دادەمەزرێت. ئیدی لەوێوە ئاشنابوونی بە شاعیران و نووسەران و ئەفەندییانی خەڵکی کەرکووک لە چایخانە و کۆڕ و کۆبوونەوەکان زیاتر دەبێت. چایخانەی مەجیدییە لە و سەردەمانەدا شوێنی کۆبوونەوەی مامۆستایان و خوێندەواران و شاعیران بووە، وەک چایخانەیەکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو وەکو یانەیەکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی بووە. دوکتۆر مارف خەزنەدار لەوێ تەنیا خەریکی مامۆستایەتی نابێت، بەڵکو خەریکی کاری ڕۆژنامەگەری دەبێت و یەکێک دەبێت لە دامەزرێنەرانی گۆڤاری (شەفەق)، کە یەکەمین گۆڤاری کوردی بووە بایەخی بە لێکۆڵینەوە و ڕەخنە داوە، لەسەر ئەو گۆڤارە و نووسەرانی و هەڵومەرجی دەرچوونی و

ناوەڕۆکییەوە بیرەوەرییەکانی خۆی دەگێڕێتەوە. کاریگەری گۆڤارەکە و لە هەمان کاتدا بارودۆخی فەرهەنگی ئەو کاتەشمان پیشان دەدات لە شوێنێکدا دەڵێت: شاعیر و نووسەر و خوێندەوارانی سلێمانی شانازییان بە گۆواری (شەفەق)ەوە دەکرد، ناوەڕاستی هەموو مانگێک بەتاسەوە چاوەنۆڕ بوون، ئێمەش هەوڵمان دەدا لە کاتی دیاریکراو دەربچێ. کە (شەفەق) دەگەیشتە سلێمانی نامەخانەی گەلاوێژ دەووروژا، لە ژوورەوە جێ نەبوو، بەڵام خەڵکی لە دەرەوەش لەپێش دەرگای ناماخانەکە شۆستەکەیان دەگرت، ڕێبواریان هەراسان دەکرد.

کودەتاکەی 14ی تەمووزی 1958 لە عێراق و لێکەوتەکانی و دەنگوباسەکانی و دەستکەوتەکانی بۆ کورد و هەلومەرجی ئەوکات، بە وردەکارییە باس دەکات، هەندێکجار دەکەوێتە بەراوردکردن لەنێوان سەردەمی پاشایەتی و سەردەمی کۆماری، بۆ نموونە ساڵی 1959-1958 یەکەمین ساڵی مامۆستایەتی دەبێت لە سەردەمی کۆماری و ڕەخنەی ئەوە دەگرێت چۆن دوای پاشایەتی و سەردەمی کۆماری قوتابخانەکان بوونە شوێنی سیاسەت و حیزبایەتی و دەڵێت: ماڵ وێرانی لەوەدایە قوتابخانە ببێتە مەڵبەندی سیاسەت و پارتایەتی. لە سەردەمی مەلیکدا داوایان لێ نەدەکردین بەشان و باهووی خاوەنشکۆدا هەڵبڵێین، کەچی لەو دەورەدا هەندێ دووڕوو و ماستاو ساردکەرەوە بۆ خۆبردنە پێشەوە داوایان دەکرد پارتیایەتی و سیاسەتی ڕۆژانەی شۆڕش بێتە ناو پۆلی خوێندنەوە.

گەشتی بۆ ڕووسیا بە ڕێگەی چەند فڕۆکە و فڕۆکەخانە و دەوڵەتێکەوە دەبێت و ڕاستەوخۆ بۆ ڕووسیا نابێت و ئەمەش وادەکات پایتەختی چەند دەوڵەتێکی جیاواز ببینێت وەک ئەستەموول و ڤیەننا و ستۆکهۆڵم و دواجار دەگاتە مۆسکۆ. مۆسکۆ بۆ دوکتۆر مارف خەزنەدار جیهانێکی نوێ بوو کرملین و گەڕان و میترۆکانی مۆسکۆ سەرەتای ژیانە نوێیەکەی بوو لە وڵاتەدا لەوێش بەردەوامە لە باسکردنی ئایین و دابونەریتی کۆمەڵگەی ڕووسی و چۆنێتیی سیاسەتکردنیان وەک چۆن پێش سەفەرکردنی لە کوردستان و عیراقیشدا بە هەمان شێوە هەرشوێنێکی بۆ بڕۆیشتایە بە وردەکاری گێڕاویەتییەوە.

ئەو کورد و عەرەبە عێراقیانەمان پێدەناسێنێت کە چۆن ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی خۆیان گوزەراندووە، لە ڕووسیا چۆن کەسانی جیاوازی ناسیوە و پەیوەندی لەگەڵیان چۆن بووە بۆمان دەگێڕێتەوە، گەشتەکانی لە بۆنە جیاوازەکاندا لەگەڵ مامۆستاکانی زمانی ڕووسی و زانستگە بۆ ناوخۆی ڕووسیا بەشێکی گرنگی گێڕانەوەکانێتی ئیدی ئەوەندە جوان و سات بە سات گەشتەکانی دەگێڕێتەوە ئاشنات دەکات بەو ناوچانەی گەشتی بۆ دەکات و شارەزای شوێنەکات دەکات و لەگەڵ خۆی گەشتی ئەو ناوچانەت پێدەکات وەک هەمیشە تەنیا باسی خۆی ناکات، بەڵکو لە هەموو ڕوویەکەوە ئەو شوێنانەت پێدەناسێنێت جگە لە چەندین زانیاری هەمەڕەنگ.

ڕەخنە لە خوێندن لە ڕووسیا دەگرێت، کە هەموو خوێندکارێکی دەرەوەی ڕووسیایان دەرچوواندووە ئەوەی باش بوایە یان خراپ بوایە، بۆ نموونە لە خوێندنی زمانی ڕووسی هەموو خوێندکارەکان دەرچوون لە کاتێکدا هەموویان شایستەی ئەو دەرچوونە نەبوونە، بەڵام بۆ خوێندکاری خۆیان وانەبووە! دوکتۆر مارف خەزنەدار لە ڕووسیا جگە لە خوێندن بە چالاکی ڕێکخراوەیشەوە سەرقاڵبووە، بۆ نموونە لە کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا.




دوکتۆر مارف خەزنەدار کەمترین ژیانی لە مۆسکۆ بووە و زۆرترین ژیانی کە زیاد لە حەوت ساڵ دەکات لە سانت پیترسبۆرگ(لینینگراد) بردووەتە سەر. لەوێوە سەرەتای خوێندنی ئەکادیمی لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی بەشی کوردی دەست پێ دەکات و ئاشنا دەبێت بە ناوە ئەکادیمییە ناسراوەکانی ئەوکات، وەک ئۆربیلی و قەناتی کوردۆ و یووسفۆڤیچ تسووکەرمان و ڕوودێنکۆ و ڤاسیلیێڤنا و مووسەیلیان.

ئیدی لەوێوەوە سەرگوزەشتەی سەرەتاکانی خوێندنی دەست پێ دەکات و قەناتی کوردۆ دەبێتە سەرپەرشتیاری نامەی دوکتۆراکەی بە ناونیشانی (مێژووی ئەدەبی کوردی تازە 1890 تا سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەم)، لە ساڵی 1963 دوکتۆراکەی تەواو دەکات خۆی لە یادداشتەکانیدا بە وردی باسی سەرەتاکانی

چۆنێتیی گفتوگۆکردنی نامەکەی تا کۆتایی دەکات و بە پلەیەکی بەرز نامەکەی وەردەگیرێت، بەهەمان شێوەی تۆفیق وەهبی قەناتی کوردۆش لەو کەسایەتییانەیە کاریگەری زۆری لە ژیانیدا هەبووە.

گێرانەوەی ژیان و ڕووداوەکانی ڕووسیا بە سەرنجڕاکێشییەوە دەگێڕێتەوە لە بچووکترین شتەوە بۆ گەورەترین شت. ڕابواردنەکانی خۆی لەو ولاتەدا ناشارێتەوە و ئاماژەیان پێدەکات. دوکتور مارف خەزنەدار بە وردی باسی مێژوو و کارەکان و کاریگەرییەکانی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسی دەکات و ئاماژە بە پەیوەندی خۆی و مامۆستا و پسپۆرەکانی زانستە جیاوازەکانی ئامۆژگا دەکات. هەر ئەوکات و لە کاتی خوێندنی دەبێت دەست دەکات بە گەڕان بەناو ئەرشیف و دەستنووس و نامەخانە (کتێبخانە)ی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسی، لە کاتی گەڕان و بینینی گۆوار و ڕۆژنامەکان بۆ یەکەمینجار یەکەمین ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان) دەدۆزێتەوە، چیرۆکی دۆزینەوەی دەگێڕێتەوە، دوای ئەوەی بۆی دەردەکەوێت ڕۆژنامەی کوردستان لە 22 ی نیسانی 1898 لە قاهیرە دەرچووە، بە پێشنیاری خۆی دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان لە 22/4/1968 لە ڕۆژنامەی (برایی" التآخی") وتارێک لەو بارەیەوە بلاو دەکاتەوە و لە ناوەڕۆکی وتارەکە باس لەوە دەکات با ڕۆژی دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان) بکەین بە جەژنی ڕۆژنامەگەری کوردی. (جەژنی ڕۆژنامەگەری کوردی) لەو ڕۆژەدا دەکرێتەوە و بۆیە یادکردنەوەی ئەو ڕۆژە شانازییەکەی بۆ دوکتور مارف خەزنەدار دەگەڕێتەوە و مێژوو بە ناوییەوە تۆماری کردووە.

لە ڕووسیایە و جار بە جار یادەوەرییەکانی هەراسانی دەکەن و دەیهێننەوە بۆ لای میدیای کچی و خێزانەکەی و نیشتمان، لەو بارەوە دەڵێت: بە لەش لە ڕووسیای دوور و بەگیان لەناو شاخ و دەشت و دۆڵی نیشتمان بووم. من نەمدەزانی دوورکەوتنەوە لە خاک قازانجی ئەوەندە زۆرە، ئەوەی لە نیشتمان بە خەیاڵمدا نەدەهات لەوێ بیرم لێ دەکردەوە، ئەو بیرەوەریانەی لە یادم چوو بوونەوە بە وولاتی غوربەتدا لە ئاسۆی بیرمدا چاوشارکێیان لەگەڵمدا دەکرد. هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی ئەوەی نووسینی چیرۆک لە مێشکمدا زیندوو بێتەوە و بیرەوەرییەکانی نیشتمان ببن بە سەرچاوەی ئەو چیرۆکانە. کاتێکیش لە ڕووسیا دوای هەشت ساڵ دەگەڕێتەوە جێهێشتنی جوانییەکانی سانت پیترسبورگ و بیرەوەرییەکانی لەو شارە و شوێنەکانی دی ئاسان نەبووە و کەوتووەتە نێوان دوو بەرداشی سەختەوە و بە ئاسانی یادەوەرییەکانی وازی لێناهێنن، لەبارەی کاریگەری و هێزی یادەوەرییەوە لە یەکێک لە ڕۆمانەکانی ڕۆماننووس (بەختیار عەلی) ڕستەیەکی سەرنجڕاکێش هەیە، کە دەڵێت: (یادەوەری تاکە جلێکی چلکنی پیسە کە ئینسان ناتوانێت زوو زوو بیشوات). دوکتور مارف خەزنەدار لە دوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ بیرەوەرییەکانی سانت پیترسبورگ و خێزان و زاگرۆسی کوڕی یەخەی بەرنادەن و وەک خۆی دەڵێت: بەبێ بیرەوەری ئەو خاکە دەروونم هەوارێکی پڕهاوار بوو! بۆیە ساڵی 1976 سەفەر و گەشت بۆ ڕووسیا و سانت پیترسبورگ دەکاتەوە. ئیدی دەکەوێتە بەراوردکردنی ئەمڕۆی سانت پیترسبورگ و ساڵانی شەستەکان و ئەو نزیکەی هەشت ساڵەی لەوێ بووە، زاگرۆس تەمەنی سێ ساڵ بووە جێیهێشتووە و ئێستا دوای هەشت ساڵ بە یازدە ساڵی دەیبینێتەوە و بە بابا بانگی دەکات! قەناتی کوردۆ دەبینێت و سەردانی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسی و جێگەی دڵخوازی دەکات. دوایین سەفەری بۆ ڕووسا ئەوەی لە بیرەوەرییەکانی دەیگێڕێتەوە ساڵی 1987 دەبێت، ئەمجارە لە بری بینینەوەی قەناتی کوردۆ ئەو مامۆستایەی کە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر دوکتور مارف خەزنەدار هەبووە، سەردانی گۆڕەکەی دەکات و فرمێسکی غەمباری دەڕێژێت. وەک هەمیشە لەم سەفەرەشیدا بە شێکی گرنگی باس باسی سانت پیترسبورگ و ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسییە.

دوكتۆر مارف خەزنەدار پشوویەکی خوێندنی هەبوووێت هەروا دەستەوەستان دانەنیشتووە و لە ماڵەوە بەڕێی بکات! سەفەر و گەشت بەشێکی گرنگی ژیانی پێکدەهێنێت. لە پشووی خوێندنی ساڵی 1961 لە 18ی تەمووز – 25ی ئاغووست سەفەری ئەرمەنستان و چیای ئەلەگەز قەفقاس دەکات و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەمووی بە زنجیرە دەگێڕێتەوە. چی دەبینێت دریغی ناکات لە گێڕانەوەی شار و گوند و سروشت و دابونەریت و کەسایەتییەکان و ئەوەی تۆ بە خەیاڵدا نایەت ئەو باسی دەکات، باسکردنێک هەمووی زانیاری و بابەتی گرنگ ئەم سەفەر و گەشتە تەنها سەفەر و گەشتی کەسێکی ئاسایی نییە بۆ خودی خۆی، بەڵکو سەرچاوەیەکی زانیارییە بۆ ئەوانەی دەیخوێننەوە وەک چۆن کتێبێکی زانستی و مێژوویی دەخوێننەوە و بەسەر کۆمەڵێک زانیاریدا دەکەون! بۆ نموونە 9/8/1961 کە چاوی بە عەرەبی شەمۆ دەکەوێت بە چێژەوە دەیگێڕێتەوە و هەندێک باس لە دەمی عەرەبی شەمۆوە ئاماژە پێدەکات.

دیمەنی جوانی شاری سانت پیترسبۆرگ هەمیشە سەرنجی دوکتۆر مارف خەزنەداری ڕاکێشاوە لە هونەری بەرزی بیناسازی و سروشتەکەی و گەلەری و زەریاچەی ناو پارکی و... تاد. لەو شارانەی ژیانی بووە کە هەمیشە لە یادەوەریدا ئامادەیی هەبووە و کاریگەری هەبووە لەسەری و زۆربەی شوێنە جیاوازەکانی بینیوە و سەردانی کردووە، دەتوانین بڵێین کونج و کەلەبەری سانت پیترسبۆرگی بینیوە، چونکە کە یادداشتەکانی ڕۆژگاری ڕووسیای دەخوێنیتەوە هەمیشە ئەو شارە ئامادەیی هەیە و لە هەر کاتێکی جیاوازدا باسی لایەنێکی ئەو شارە دەکات، شارێک بۆ خۆی بریتی بووە لە مۆزەخانەیەکی گەورە. هەموو وڵاتێک یان شارێک شوێنێکی هەیە و بە تایبەتمەندی ئەو شوێنە دەناسرێتەوە ئەوەندە گرنگ و کاریگەرە ئەگەر سەردانی ئەو شوێنەت نەکردبێت، وەک ئەوە وایە وڵاتەکە یان شارەکەت نەبینیبێت. شاری سانت پیترسبۆرگ بۆ ڕووسیا بەو شێوەیەیە دوکتۆر مارف خەزنەدار دەڵێت: ئەوەی بهاتایە ڕووسیا بۆ خوێندن یا بینینی، بۆ ماوەیەکی کەم یا زۆر، ئەگەر سانت پیترسبۆرگی نەدیایە، نەدەبوو بڵێ ڕووسیام دیوە، خۆ ئەگەر لەوێش بژیایە دەیتوانی بڵێ هەموو ڕووسیای پانوبەرینم دیوە.

کاتی خۆی پیتەری گەورەی قەیسەری ڕووسیا ئەم شارەی بەو شێوەیە دروست کردووە، پێش دروستکردنی هەموو ئەورووپا گەڕابوو، بۆ ئەوەی دیارترین دروشمی هەر شارێک بێنێتە ئەو شارەی دروستی دەکات! یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی یادداشت و بیرەوەرییەکانی دوکتۆر مارف خەزنەدار ئەوەیە لە بیرەوەرییەکانیدا تەنیا ئەوە ناگێڕێتەوە کە خۆی بینیویەتی، بەڵکو زۆرجار دەگەڕێتەوە بۆ مێژوو و زانیاری لەبارەی ئەو شوێنە دەگێڕێتەوە، بۆ نموونە بە گەڕانی بە شوێنە جیاوازەکانی شاری سانت پیترسبۆرگ جگە لە گێڕانەوەی ئەوەی دەیبینێت دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی ڕووسیا، کە دەچێتە وێستگەیەکی شەمەندەفەر بە باسکردنی وێستگەکە کۆڵنادات باسی مێژووی وێستگەی شەمەندەفەر دەکات لە ڕووسیا، کە دەچێتە سەردانی ماڵی پووشکین هەر باسی ماڵەکەی ناکات چی بینیوە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی ژیانی پووشکین و سەردەمەکەی و ئەوەی دەیزانێت باسی دەکات! بۆ زۆرێک لە باسەکانی تریش هەروای کردووە.

دوارۆژەکانی ژیانی گۆرانی شاعیر لە نەخۆشخانەی کرملین لە مۆسکۆ و سەردانیکردنی دوکتۆر مارف خەزنەدار و گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکدیدا. هەندێک زانیاری و بۆچوونمان لە دەمی گۆرانی شاعیرەوە بۆ تۆمار دەکات، کە سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ تێگەیشتن لە دونیابینیی گۆران، بۆ نموونە بەتایبەتی لەو جیاوازییەی کە گۆران بینیویەتی لەنێوان تیۆر و پراکتیکی ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم تا لە کوردستان و عێراق بووە تیۆری مارکسیزم شتێک بووە و لە ڕووسیا بە پراکتیکی شتێکی دیکەی بینیوە، لەو بارەوە دوکتۆر مارف خەزنەدار دەڵێت: نویشکی بیروڕای گۆران وەکو لەم دانیشتنەدا بۆمی دەربڕی ئەوەبوو، پراکتیکی ئەو تیۆرییەی باوەڕی پێ هەیە و لەو وڵاتەدا لەسەری دەڕۆن ئەوە نەبوو کە چاوەڕوانی دەکرد.

بۆ ئەوەی شارەزای کولتوور و ژیانی ڕووسەکان بیت و مەعریفەی هۆشیاریت لەبارەیانەوە فراوان بکەیت، دەبێت



یادداشتەکانی دوکتۆر مارف خەزنەدار بخوێنێتەوە، ئەوەی لەم یادداشتانە بەو وردەکارییانەوە دەستت دەکەوێت گومان دەکەم لە کتێبی تردا بە ئاسانی دەستت بکەوێت!

وا دەردەکەوێت دوکتۆر مارف خەزنەدار بەشێکی یادداشتەکانی لە کاتی خۆیدا نووسیبێتەوە، ئەو کاتەی لە ڕووسیا دەبێت بۆ خوێندن لە سەفەرەکەی بۆ ئەرمەنستان ڕۆژ و مانگ و ساڵ دەنووسێت ڕۆژەکان بە زنجیرە دەگێڕێتەوە، بۆ سەفەرەکەی ئەستۆنیا و ئۆکرانیاشی بەهەمانشێوە، هەروەها لە گەشتی نوێنەرانی کۆمەڵەی دۆستایەتی عێراق و سۆڤیەت بۆ ڕووسیا و ئەرمەنستان لە مایسی 1972. لە گێڕانەوەی یادداشتەکانی ساڵی 1983 لە وڵاتی جەزائیریش ڕۆژ و مانگەکان دەنووسێت، هەروەها لە گەشتەکانی بۆ ئیسپانیا و مەغریب ساڵی 1985، هەروەها لە ڕۆژی مردنی سەرۆکی جەزائیر دەنووسێت: ئێوارەی ڕۆژی 27/12/1978 لە دەفتەری یادداشت دا ئەمەم تۆمار کرد (ئەمڕۆ بەیانی لە جەزائیر ئەفسانەیێکی تری سیاسی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم کۆتایی هات، بوومیدیان مرد...).

هەندێک جار نووسینەوەی یادداشتەکانی دوای چەند ساڵێک بەسەر تێپەڕبوونی ڕووداوەکاندا نووسیویەتییەوە لە کۆتایی لاپەڕەکانی بەرگی پێنجەمدا باس لە یەکێتیی نووسەرانی کورد دەکات، ئاماژە بە نامەی دەستلەکارکێشانەوەی لەو یەکێتییە دەکات ساڵی 1973، دواتر باس لەوە دەکات لەو ڕۆژەوە تا نووسینی ئەم دێڕانە پەیوەندی پێیانەوە نەماوە بەروارەکەی نووسیوە شەممە 12/2/1994، کەواتە پێشتر بەشێکی ئەم بیرەوەرییانەی نووسیوە و ساڵی 2010 بڵاوی کردووەتەوە. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات دوکتۆر مارف خەزنەدار ڕۆژ لە دوای ڕۆژ یادداشتەکانی کاتی خۆی تۆمار کردووە و هەستی بە گرنگی یادداشتنووسین کردووە و لەلایەکی دیکەوە وای کردووە زۆر بە وردی بیانگێڕێتەوە و لە لەبیرچوونەوە بیانپارێزێت و بە ئەمانەتەوە بیانگێڕێتەوە.

دوکتۆر مارف خەزنەدار ئەندامی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد بووە لە ئەورووپا و لە ئەڵمانیا و ڕووسیادا بەشداری کۆنگرە و چالاکییەکانی کۆمەڵەکەی کردووە لە ڕووسیا و سەرچاوەی گرنگە بۆ هەر توێژەرێکی مێژوویی بیەوێت کۆڵینەوەی لەسەر بکات.

سەرەڕای ئەو ژیانەی لە ڕووسیادا بردوویەتییە سەر لە ماوەی هەشت ساڵدا ئەو گەشت و سەفەر و ڕابواردنانەی کردوویەتی سەرسامبوون و چێژبینینی لە سروشتی جوانی ئەو وڵاتە و دامەزراندنی لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی وای لێ نەکردووە بیری کوردستان نەکات، پێشنیاری دامەزراندنی بۆ دەکەن لە ئەمریکا و زانکۆی هارڤارد. لە چەند شوێنی یادداشتەکانی ئەم تامەزرۆیەی بۆ نیشتمان ناشارێتەوە، گەشت دەکات بۆ ئۆکرانیا و بەهۆی سروشتەکەیەوە و بوونی دارگوێزەوە خەیاڵ دەیباتەوە بۆ هەورامان!

دوکتۆر مارف خەزنەدار ڕەخنە لە هەندێک کورد و هاوڕێی خۆی دەگرێت کە چۆن لەو ڕۆژگارەدا بۆ ڕابواردنی خۆیان سیاسەتیان کردووە و خەریکی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بوون و پەتپەتێنیان دەکرد و ئەوەی خەمیان نەبووە فێربوون و خوێندن بووە، بەبێ ئەوەی ناویان بهێنێت هەندێکیان بەسەر بەرەی بارزانی و بەرەی فەهد دابەشببون و دوکتۆر مارف خەزنەدار پێیان دەڵێت: (کەم فام و هەڵەشە).

لە هەندێک شوێنی یادداشتەکانیدا لەسەر جۆری دونیابینی و هەڵوێست و ڕەفتار و نووسینی هەندێک هاوڕێ و دۆستی خۆی ڕەخنە دەگرێت یان لایەنی نەرێنیان باس دەکات بۆ نموونە لەوانە کاووس قەفتان، هەژاری موکریانی، هێمن و مومتاز حەیدەری، بە هێمن دەڵێت لە زۆر شتدا هۆشیار نەبوو یان باس لەوە دەکات هێمن قبووڵی نەبووە یەکێک تەمەنی بچووک بێت و لە تەمەنی کوڕی خۆی بێت ڕەخنەی لێبگرێت، بە دڵشا مەریوانی شاعیری وتووە، دڵشاد کێیە؟ دڵشاد چییە ڕەخنە لە من بگرێ! تا ئێرە ئاساییە، بەڵام ئەوەی ئاسایی نییە دوکتۆر

مارف خەزنەدار لە یادداشتەکانیدا هیچ رەخنە لە خۆگرتنێکی تێدا نییە، یان باس لە هیچ هەڵە و کەموکورتییەکی خۆی ناکات وەک مرۆڤێک کە ئەمە پێمان وایە یەکێک لە خاڵی لاوازی یادداشتەکانێتی.

دوکتۆر مارف خەزنەدار بۆ ماوەیەک لەگەڵ هاوڕێ کچەکەی پێکەوە بەیەکەوە دەبن دواتر و لە ساڵی 1964 بڕیاری هاوسەرگیری دەدەن و ساڵی 1965 منداڵێکی کوڕیان دەبێت ناوی دەنێت (زاگرۆس). جگە لە خێزانی ئافرەتێکی تر بە ناوی گالە یەکێک بووە لەو ئافرەتە رووسیانەی دوکتۆر مارف خەزنەداری زۆر خۆشویستووە، بەڵام دوکتۆر مارف خەزنەدار هیچ وەڵامدانەوەیەکی بۆی نەبووە. لە ساڵی 1968 کاتێک دەگەڕێتەوە هاوسەر و زاگرۆسی کوڕیشی بەجێدەهێڵێت و نایانبینێتەوە تا ئەو کاتەی لە مایسی 1972 لە گەشتی نوێنەرانی کۆمەڵەی دۆستایەتی عێراق و سۆڤیەت بۆ رووسیا و ئەرمەنستان و لە کۆتایی گەشتەکەیان و لە گەڕانەوەیاندا لە ئەرمەنستانەوە بۆ رووسیا و دواتر عێراق لە رۆژی 27/5/1972 دەرفەت دەقۆزێتەوە بۆ رۆژێک خێزانی دەبینێت، چونکە رۆژی دواتر دەگەڕێنەوە بەغداد زاگرۆسی کوڕی لەو یەکتر بینینەدا ئامادە نییە، دونیا پێچەوانە بووەتەوە، دوکتۆر مارف خەزنەدار پێش سەفەری بۆ رووسیا نەخۆشی زۆری بۆ دەهێنێت و واز لە جگەرەکێشان دەهێنێت، بەڵام خێزانی لەتاو دووری دوکتۆر مارف خەزنەدار بووە بە جگەرەکێش! ئیدی لەوێوە دەکەونە هەست و سۆزگۆڕینەوە و گێڕانەوە و گەڕانەوە بۆ یادەوەرییەکانیان.

لە رێگەی یادداشتەکانییەوە دەزانین چیرۆکی (ئەڵەمان کوردی) بیست ساڵ لە مێشکیدا بووە ئەوجار نووسیویەتی و بڵاوی کردووەتەوە، چیرۆکی (بووکەشووشە) سێ ساڵ لە مێشکیدا بووە ئەوجار دەستی کردووە بە نووسینی! لە رێگەی یادداشتەکانییەوە دەزانین چی نووسیوە و چۆنی نووسیوە و لە کوێدا بڵاوی کردۆتەوە.

دوای گەڕانەوەی بۆ کوردستان ئاشنا دەبێتەوە بەو شوێنانەی کە هەشت ساڵە هەمیشە لە بیرەوەریدا ئامادەییان هەبووە، کەسەکان و شوێنەکان گۆڕاون و شتەکان لە جێگەی خۆیان جولاون، بە تامەزرۆییەوە بۆنی ئەو شوێنانە دەکات کە یادەوەری لەگەڵیدا هەیە، پیاسە و گەڕان بەناو شار و شەقام و کوچە و کۆڵانەکانی دەبیەنەوە بۆ دونیای پێش سەفەکردنی بۆ رووسیا، مرۆڤ ئاوایە بۆ هەمیشە ناتوانێت لە رابردووی دابڕێت!

لە گەڕانەوەیدا دەست دەکات بە نووسین و بڵاوکردنەوە لە رۆژنامە و گۆڤارەکان، هەمیشە لە بۆچوونی لە یادداشتەکانی دوکتۆر مارف خەزنەداردا ئەوە دەخوێنیتەوە بەلایەوە هەوڵدانی فێربوون و توانا و خۆ پێگەیاندن لە بڕوانامە گرنگتر و بەرزترە، هەربۆیە لە ژیانی تایبەتی و پەیوەندییەکانیشیدا ئەوە بەڕوونی هەست پێدەکەیت کە ژمارەی ئەوانە کەم نەبوون کە بڕوانامەی بەرزیان نەبووە و دوکتۆر مارف خەزنەدار پەیوەندی تایبەتی لەگەڵیان هەبووە دژی ئەوانەبووە بەهۆی بڕوانامەوە تووشی لە خۆبایی و لووتبەرزی هاتوون، وەک دەردەکەوێت لە ژیانی خۆیدا زۆری بینیوە لەوانەی بڕوانامەی باڵایان هەبووە و ئەوەی چاوەڕوانیان لێکراوە ئەوە نەبوون بۆیە لە شوێنێکی یادداشتەکانیدا دەنووسێت: کێ دەڵێ خاوەن باوەڕنامەی بەرز دەبێ ژیر و زیرەک و زانا و دانا بێ! هەر لەوبارەیەوە ساڵی 1974 لەوکاتەی خۆی و دڵشاد مەریوانی شاعیر دەبنە مامۆستای بەشی کوردی لە زانکۆی سلێمانی، دڵشاد مەریوانی بڕوانامەی خوێندنی باڵای نەبووە و دوکتۆر مارف خەزنەدار بەراوردی دەکات لەگەڵ خاوەنبڕوانامە باڵاکان و دەنووسێت: دڵشاد دەرچووی بەشەکەی بەغدا بوو، باوەڕنامەی بەرزی نەبوو، بەڵام کاشکی هەندێ لەو مامۆستایانەی باوەڕنامەی بەرزیان هەبوو، ئەم میدالیە و نیشانەیان نەبوایە و پلەی زانستی دڵشادیان هەبوایە! هەروەها دەڵێت: قوتابییان بە چاوێکی بەرز تەماشایان دەکرد، زۆریان وایان دەزانی باوەڕنامەی بەرزی لە دەرەوەی وڵات وەرگرتووە.

لەنێوان رۆشنبیران و ئەکادیمیستانی کورد وەک خەڵکی ئاسایی هەمیشە رق و کینەی کەسێتی بەردەوام ئامادەیی هەبووە، دوکتۆر مارف خەزنەداریش بەهۆی هێنانی بڕوانامەی دوکتۆراوە زۆرێک ئیرەییان پێبردووە و دژایەتیان کردووە و هەندێکیش ویستوویانە



ئەم لەسەریان بنووسێت و وەسف و سەنای نووسینە لاواز و خراپەکانیان بکات و درۆ لەگەڵ خوێنەر بکات ئەمیش نەیکردووە و بێگومان ئەمەش بێ دژایەتی تێپەرنابێت!

ساڵی 1968 دوای گەڕانەوەی دوکتور مارف خەزنەدار دەبێتە مامۆستای کۆلێجی ئەدەبیات و لەوێوە بۆ یەکەمجار ژیانی وانەوتنەوەی لەناو زانکۆدا دەست پێ دەکات لە زانکۆی بەغدا، هەروەها هەر لێرەشەوە چالاکییە ڕۆشنبیریی و ئەدەبییەکانی بە چڕی دەست پێ دەکات، لەوانە بەشداری لە یەکێتیی نووسەرانی کورد و کۆڕی زانیاری کورد و کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی و... تاد.

دوکتور مارف خەزنەدار کەسێکی ئەکادیمی دابڕاو نەبووە لە ڕووداوە سیاسییەکان، بەڵکو لە یادداشتەکانیدا لەگەڵ باسکردنی لایەنی فەرهەنگی و ئەکادیمی و ڕۆشنبیری خۆی و دەوروبەری باسی ڕووداوە سیاسییەکان دەکات و پەیوەندیشی هەبووە لەگەڵ هەندێک لە سەرکردەکانی کورد و ئەمەش وای کردووە باسیان بکات یان ڕووداوێکی گرنگی سیاسی ڕووی دابێت لە سەردەمی ژیانی ئەودا ئاماژەی پێکردووە.

هەمیشە دەیەوێت ئەوە پیشان بدات وەک ئەکادیمیستێک و ڕۆشنبیرێک لە یادداشتەکانیدا کە لە ژیانیدا بە شێوەیەکی گشتی سەربەخۆ بووە و سەر بە حیزب و ئایدیۆلۆجیایەکی دۆگما نەبووە، بۆ ئەمەش دژایەتی و نەیاری زۆری بۆ دروست بووە، لە سەرەتای هەفتاکانی سەدەی ڕابردوو ڕەخنە لە ڕۆشنبیرانی کورد دەگرێت، کە بە هەموو ئاوازێک هەڵپەڕیون و بەمشێوەیە دەنووسێت: کەم کەس هەبوون لەناو ڕۆشنبیرانی کورد نانی بەیانی لەگەڵ کۆمۆنیست و نانی نیوەڕۆ لەگەڵ بەعس و نانی ئێوارە لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان نەخۆن. هەروەها تووڕەیی خۆی بەرانبەر بە کۆمەڵێک لە ڕۆشنبیرانی کورد ناشارێتەوە، بەهۆی ئەوەی بەو نیازەی کە دەچوونە شاخ یان خۆیان لە پارتەکان نزیک دەکردەوە بۆ ئەوەی پۆستێکیان پێبدرێت، یان ببنە مووچەخۆرێکی گەورە و مفت. بەهۆی هەڵوێست گۆڕین و دووڕووییانەوە ڕەخنەگرتن و بێزاربوونی دوکتور مارف خەزنەدار لە بەشێک لە ڕۆشنبیرانی کوردی لە چەندین شوێنی یادداشتەکانیدا ئامادەیی هەیە، تەنانەت لە شوێنێکدا پێیان دەڵێت مافیای ڕۆشنبیری! ناویان ناهێنێت، بەڵام لە شێوەی باسکردنیدا ناڕاستەوخۆ پێمان دەڵێت هەندێک لەو ڕۆشنبیرانە کێن و بە ئاسانی دەیانناسینەوە و هەندێک لەو ناوانە ناوی دیاری و ناسراوی کوردن و لە ململانێی توند بووە لەگەڵیان و ئەمەش وای کردووە هەمیشە بە نەیاری یەک بمێننەوە. لە شوێنێکدا دەنووسێت: هەندێ لە ڕۆشنبیران لە یەکتری بە بەهانە بوون، لە گفتوگۆی سیاسی و بازرگانی کردن بە پارتیایەتی قسەیان یەکتری نەدەگرتەوە، ئیتر تێک دەگیران، کارەسات دەگەیشتە ئەوەی بە تف، زللە، شەق و تێهەڵدان بەرانبەری یەکتری بوەستن... .

لە یادداشتەکانیدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە دەردەکورد و ناکۆکی و ڕقی کەسێتیی ڕۆشنبیرانی کورد، هەر تایبەت نییە بە باشووری کوردستان، ئەوەتا ساڵی 1972 لە گەشتێکدا لەگەڵ نوێنەرانی کۆمەڵەی دۆستایەتی عێراق و سۆڤیەت بۆ یەریڤان و ئەرمەنستان لە دانیشتن و کۆبوونەوەیەکدا لە یەریڤان عەرەبی شەمۆ و جاسمی جەلیلیش ئامادە دەبن، ئەم دوو کەسایەتییە ڕۆشنبیرە ناسراوە ناتوانن ڕق لە یەکبوونیان لەبەرچاوی میوانەکاندا بشارنەوە! دەڵێت: من بەڕاستی چاوم بڕی بووە عەرەبی شەمۆ و جاسمی جەلیل و کوڕی بچووکی جەلیلی جەلیل، دەمزانی لەبەر من بۆ ئەم کۆبوونەوەیە هات بوون. ئەم سێ کوردە لە نزیک یەکەوە نەبوون عەرەبی شەمۆ لە لایێک و جاسم و کوڕەکەی لە لایێکی تر دانیشت بوون، من دەمزانی ساردییێک لە نێوانیاندا هەیە، ئەویش لەبەر هیچ نا تەنیا دەردە کوردەکەیە، نووسەرێک یا زانایێک حەز بەوە ناکا یەکێکی تر لەو گەورەتر یا بە ناوتر هەبێ. بەرگی شەشەمی بە باسکردنی جووڵانەوەی سیاسی و خەباتی چەکداری کورد دەست پێ دەکات لەنێوان ساڵانی

1975-1961، کە ئەمەش لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەو ساڵەیە کە لە بەرگ و ناونیشانی کتێبەکە دیاری کردووە، کە بریتییە لە ساڵی 1983-1975، بۆیە دوکتۆر مارف خەزنەدار هەندێک جار پابەند و پەیوەست نەبووە بەو ساڵانەی دیاری کردووە، هەر بۆ نموونە لەم بەرگی شەشەمە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1961 و باسی شۆڕشی ئەیلوول دەکات، یان باسی زانکۆی سلێمانی دەکات لە ساڵی 1974، لە کاتێکدا ئەو ساڵانە ساڵانی پێش (1975) ە، کە وەک دەستپێکی کتێبەکە دایناوە!

جگە لە بارودۆخی ڕۆشنبیری بۆ ئاگاداربوون لە بارودۆخی سیاسی کوردستان و گەمەی هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی بەرانبەر دۆزی کورد لەنێوان ساڵانی 1975-1961، یادداشتەکانی دوکتۆر مارف خەزنەدار کۆمەکی باشمان دەکات، وەک شرۆڤەکارێکی سیاسی بارودۆخی ئەوکاتی کوردستان هەڵدەسەنگێنێت و ڕاڤەی دەکات. بارودۆخی ئەو ڕۆژگارە و هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول زۆر کاریگەری تێکردووە و خەم و پەژارەی قووڵ دایگرتووە.

یەکێک لە باسە تایبەتییەکانی یادداشتەکانی باسکردنە لە سەدام حوسێن، کە دیوێکی تری کەسێتیی سەدام و هەڵوێستی بەرانبەری کورد دەگێڕێتەوە، کە تاڕادەیەکی زۆر وێنەیەکی جیاوازە و ئەو وێنەیە نییە کە لە زیهنی زۆرینەدا هەیە بۆ سەدام حوسێن هەیە! دوکتۆر مارف خەزنەدار ڕۆژی سێ شەممە 10/6/1980 لە لایەن کۆشکی کۆمارییەوە ئاگادار دەکرێتەوە بۆ بینینی سەدام حوسێن، بۆ ئەوەی فێری زمانی کوردی بکات، بۆ ماوەیەک دەبێتە مامۆستای سەدام حوسێن پێنج شەش جار سەدامی بینیوە. لە یەکەم ڕۆژی وانەوتنەوەدا لە بینینێکدا لە کاتی وانەوتنەوەدا بە سەدام حوسێن عودەی کوڕی دێتە ژوورەوە و سەدام پێی دەڵێت وەرە گوێبگرە و فێری زمانی میللەتەکەمان ببە. زمانی کوردی بۆ ئێمە پێویستە! جارێکیان سەدام حوسێن باسی گرنگی کورد و زمانەکەی دەکات و دڵسۆزی و هەستی خۆی دەردەبڕیوە و گوتوویەتی: کوردی وا هەیە لە هەندێ شوێنی کوردستاندا داوایان کردووە قوتابخانە کوردییەکان دابخەین، بەڵام ئێمە بە قسەی ئەوانمان نەکردووە، هەروەها سەدام درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت: دوێنێ لە سەرۆکایەتیی پارتی بەعس بڕیارمان بۆ هەموو هاوڕێیانمان دەرکرد ئەوانەی لە کوردستاندا کاری حیزبایەتی دەکەن، ئەگەر لە ماوەی ئەو سێ ساڵەی بۆیان دانراوە فێری زمانی کوردی نەبن ناگوێزرێنەوە مەڵبەندی ژیان و جێی لەدایکبوونیان. سەدام حوسێن گوتوویەتی: ئێمە نیوەمان کوردە، شانازی بەوەوە دەکەین!

دوکتۆر مارف خەزنەدار دوای ئەوەی بە چەند خاڵێک باسی سەدام حوسێن دەکات و هەڵیدەسەنگێنێت، لە کۆتاییدا دەنووسێت: لە هەموو یەکتری بینینەکاندا کە دەچوومە ژوورەوە لەبەرم هەڵدەستا. لە کاتی وانەگوتنەوەدا هەڵسوکەوتی قوتابییانە بوو، بە ئوستاد قسەی لەگەڵمدا دەکرد و دەستی هەڵدەبڕی وەکو قوتابیان، هەندێ جاریش بە (جەنابت) قسەی لەگەڵمدا دەکرد. منیش لە کاتی وانەوتنەوە و گفتوگۆکردن قسەیێکی وام نەدەکرد پێویست بێ بڵێم سەرۆک یا جەنابت یا بەڕێزتان یا هەر لەقەبێکی گەورەی دیکە، کە دەرسیش تەواو دەبوو تا بەر دەرگای ماڵی خۆیان بەڕێی دەکردم و بە پیاوەکانی دەگوت: لە خزمەت مامۆستا بن.

بۆ ناسینی گۆران، ڕەفیق حیلمی، تۆفیق وەهبی، مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی، بەدر شاکر سەیاب، شێخ سەلامی شاعیر، حوسێن مەردان، ڕەوشەن بەدرخان، نەجمەدینی مەلا، مارف بەرزنجی، محەمەد ساڵەح دیلان، حەمید عوسمان، جەمال نەبەز، وریا ڕەواندزی، کاووس قەفتان، ڕەحیمی قازی، قەناتی کوردۆ، عسمەت شەریف وانلی، نەسرین فەخری، مینۆرسکی، کامەران بەدرخان، عەونی یووسف، قاسملوو، ئۆربێلی، جاسمی جەلیلی، عەلی گەلاوێژ، ڕەحیمی قازی، عەرەبی شەمۆ، عەلی قازی، ئاکووپۆڤ، خالفین، لازارێڤ و چەند زانا و پسۆڕێکی تری ڕووسی، عەبدوڵڵا پەشێو، مەحموود زامدار، ئیبراهیم ئەحمەد، میر حاج ئەحمەد، ساڵەح یووسفی، هەژاری موکریانی، مەلا مستەفا، محەمەد مەولوود(مەم)، هێمن، عەبدولخالیق مەعرووف، دڵشاد مەریوانی، عەبدولغەنی عەلی یەحیا، مستەفا ساڵەح کەریم، حەسەن



زیرەک، کە زۆرکات لە ماڵی دکتۆر مارف خەزنەدار ژیاوە، زۆر کەسایەتی تر، بۆ ناسین و ڕوانین و ژیانی ئەو کەسایەتییانە بیرەوەرییەکانی دوکتۆر مارف خەزنەدار سەرچاوەیەکی گرنگە، دۆستێکی نزیکی شێخ محەمەدی خاڵ بووە، لە باسکردنی ئەو کەسایەتییانە و پەیوەندی لەگەڵیان و کاریگەری و هەندێک کات باسکردنی ژیانی نهێنییان و ئەدەبیات و نووسینییان لەو تایبەتمەندییانەن لە یادداشتەکانیدا و بەشێکی گرنگی ئەوانەی دەیگێرێتەوە زانیارین و سوود بە خوێنەر دەیگەیەنن، کە لەوانەیە ئەو زانیارییانە لە هیچ بەڵگەنامەیەکدا یان توێژینەوەیەکدا نەیدۆزینەوە. ناسینی ئەو کەسایەتییانە هەریەکەیان بەپێی نزیکی و دووری، یان بەهۆی چالاکییەوە و بەگوێرەی ئەو پەیوەندییەی هەیبووە لەگەڵیان، قسەیان لەسەر دەکات و لەگەڵ بەشێکیان زۆری لەسەر نووسیوە و لەگەڵ هەندێکیتریان کەمتر.

(ئەو شار و وڵاتانەی بینیویەتی: سلێمانی، کەرکووک، بەغداد، موسڵ، کوت، کۆیە، عەمارە، بابل، سەلمان پاک، تاران، کرماشان، هەمەدان، خانەقین، دوکان، هەڵەبجە، ڤیەننا، ڕووسیا و داغستان، ئازربێجان، گورجستان، ئەدجاریا، ئەبخازیا، شارەکانی ڕۆستۆڤ و پیتیگۆرسک و کیسلۆڤۆدسک و مەحەج قەلا و باکۆ و تەفلیس و باتووم و سوخووم و گووداووتا و کاگرا و خوستە و ئەلەر و سۆچی، نۆڤگۆرود، ئەرمەنستان، لاتیڤیا، ئۆزبەکستان، ئۆکرانیا، ئەستۆنیا، لیتوانیا، ئەڵمانیا، مۆڵداڤیا، جەزائیر، فەرەنسا، بەریتانیا، وێڵز، ئیسپانیا، مەغریب، توونس... تاد). ڕۆیشتنەکانی لە هەرسێ ڕێگەی وشکانی و ئاوی و ئاسمانییەوە بووە، هەریەک لەو وڵات و شارانە چ خۆی بە گەشت و سەیران بۆی چووبێت چ لەگەڵ خێزان و مامۆستا و قوتابییەکانی هاوڕێی تێیدا مابێتەوە، یان بۆ خوێندن بۆیان چووبێت، یان بۆ وانەوتنەوە و وەک مامۆستا لێیان نیشتەجێ بووبێت بۆ ماوەیەکی درێژ دوکتۆر مارف خەزنەدار زۆر بە وردی هەموویان دەگێڕێتەوە، لە ناویانەوە بۆ مێژوویان و سروشتی جوگرافییان لە دابونەریتەوە بۆ کایەی کۆمەڵایەتی لەوێوە بۆ فەرهەنگ و هونەر و باسکردنی شاعیر و نووسەر و ئەدەبیات و سیاسەت و شۆڕشەکانیان و مۆزەخانە و زانستگا و کتێبخانە و شێوازی ژیان و شوێنی گەشتیاری و... تاد. بەپێی تایبەتمەندی هەر شار و وڵاتێک وەک خۆی، هەر شوێنێک سەرنجی ڕاکێشابێت و زانیبێتی شتێکی نوێی پێدەبەخشێت سەردانی کردووە.

لە بیرەوەرییەکانی باسی ژیانی تایبەتی و خێزانداری خۆی دەکات، ژیانی ڕۆشنبیری و نووسین و کتێبەکانی بەپێی قۆناغە جیاوازەکان دەگێڕێتەوە. باسی بەشی زمانی کوردی کۆلێجی ئەدەبیات دەکات، چالاکی لە کۆمەڵە ڕۆشنبیرییەکان. سیمینار و کۆڕی ڕۆشنبیرییەکانی باس دەکات. بە وردی جەنگی عێراق و ئێرانی ساڵی 1980 دەگێڕێتەوە. بە گێڕانەوەی ڕۆژانە یادداشتەکانی لەبارەی جەزائیر و زانکۆی عەننابەوە، کە تیایدا وانە دەڵێتەوە لە هەرسێ قۆناغی بەکالۆریۆس و ماستەر و دوکتۆرا ئاشنامان دەکات ئەو شوێنانەی سەردانی دەکات و ئەو کەسایەتییانەی دەیانناسێت دابونەریت و هەڵسوکەوت و دونیابینییان، وەک چۆن لە ڕووسیا بوو بیرەوەرییەکانی دەیانهێنایەوە کوردستان و بەغداد لە جەزائیریش بە هەمان شێوە بووە. دوکتۆر بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە ساڵی 1988-1983 لە جەزائیر دەبێت و دوای ئەوە دەگەڕێتەوە و دەبێت بە مامۆستای زانکۆی سەلاحەدین و بیرەوەرییەکانی بەو وشانە کۆتایی پێدێنێت: من بە تەنیا مامەوە، بەڵام تەنیاییم بەخۆمەوە نەدی، چونکە کلیلی کلۆمی سندووقی کتێبەکان بە دەستمەوەیە، دۆست و نزیکی ملیۆنان کەسم لەو ڕۆژەوە پەروەردگار تەبیعەت و ئادەمیزادی دروست کردووە تا ئەمڕۆ. تا دواهەناسە وا دەبم دەبێ کەسێکی تر لە ناو خەڵکی دا لە من بەختیارتر هەبێ؟!

***

## نامەکانی مارف خەزنەدار

ساڵی 2023 لەگەڵ چاپی دووەمی یادداشتەکانی، کتێبی (ئەرشیفی نامەکانی مارف خەزنەدار) بۆ یەکەمجار بڵاوبوویەوە، کتێبەکە (بنیاد خەزنەدار)ی کوڕی دوکتۆر مارف خەزنەدار کۆیکردووەتەوە و ئامادەی کردووە و پەراوێزی بۆنووسیوە. قەبارەی کتێبەکە (295)لاپەڕەیە و لەلایەن دەزگای فام لە هەولێر چاپ و بڵاوبووەتەوە.

کۆی نامەکانی کتێبەکە بریتییە لە (106) نامە، هەموو نامەکان بە زمانی کوردییە و یەک نامەی نەبێت بە زمانی عەرەبییە و لەلایەن (عەبدولفەتاح عەلی یەحیا) نووسراوە، دەستنووسی نامەکانیشی لەگەڵەدایە. نامەکان لە کەسی تایبەتمەند و ڕۆشنبیر و پسپۆڕی جیاوازەوە بۆی هاتووە، وەک کەسی (سیاسی، ئەکادیمیست، شاعیر، هونەرمەند، مێژوونووس، نووسەر، شوێنەوارناس، ڕۆماننووس)، نامەکان لە ساڵی جیاواز و لە شوێنی جیاوازەوە هاتووە، کۆنترین نامەیان نامەی ڕەفیق حیلمییە و بۆ ساڵی 1952 دەگەڕێتەوە، تازەترین نامەش نامەی عومەر مارف بەرزنجییە ساڵی 2007.

نامە لە ڕۆژگاری پێش پەیدابوون و بڵاوبوونەوەی مۆبایل و ئامێرەکانی تری ژیری دەستکرد گرنگی و بایەخی خۆی هەبووە، لە نامەکانی ئەو ڕۆژگارەدا تەنیا هەواڵپرسین و چاکوچۆنی نییە، بەڵکو لە نامەکاندا چەندین باسوخواس و هەواڵی ئەو ڕۆژگارانەش لەخۆ دەگرێت، کە دەکرێت وەک بەڵگەنامەیەکی گرنک خوێندنەوەی بۆ بکرێت و سوودی لێ ببینرێت.

ئەو نامانەی بۆ دوکتۆر مارف خەزنەدار هاتووە لە ڕووی قەبارەی نامە و باسەکانی ناوەڕۆکیانەوە هەریەکەیان لەوی تر جیاوازە و لەیەک ناچن، هەروەها هەندێکیان گرنگی خۆیان هەیە و بارودۆخی مێژووی سەردەمێکمان بۆ ڕوون دەکاتەوە لە بابەت و ڕەهەندی جیاوازەوە، بەتایبەت لەبارەی نووسین و کتێب و ڕۆشنبیرییەوە، بەڵام هەندێکیشیان ئاسایین و بۆ هەواڵپرسین و دەنگوباسە و هەست و سۆز دەربڕینن بۆ دوکتۆر مارف خەزنەدار، یان داوای نووسینیان لێ کردووە بۆ بڵاوکردنەوە لە بڵاوکراوەیەکدا، هەندێک لە نامەکان هەواڵی ناردنی کتێب لە خۆ دەگرێت بە دیاری، یان نامەی وای تێدایە کەسێک داوای لێکردووە وێنەی شاعیرێکی بۆ بنێرێت بە بۆچوونی ئێمە وەک تێبینی و سەرنج و ڕەخنەیەک لەم لایەنەوە ئەو جۆرە نامانە پێویست بە بڵاوکردنەوە ناکات، چونکە نە بۆ مەعریفە و هۆشیاری خوێنەر گرنگە نە هیچ نەوتراوێکیش دەڵێن لەبارەی دوکتۆر مارف خەزنەدار، یان هەر بابەتێکی تر ئەمە نموونەی ناوەڕۆکی یەکێک لە نامەکانە، کە جەودەت ئەحمەد ناجی بۆی ناردووە: (بۆ برای خۆشەویستم دکتۆر مەعرووف، نامەکەی پڕ لە برایەتی و دڵسۆزیت پێم گەیشت و زۆر خۆشحاڵ بووم، سوپاسی هەستی بەرزت ئەکەم وە ئومێدەوارم لەم نزیکانە بگەڕێیتەوە وە ببینێت شاد بین. هەمیشە دوعا و نزای خێرت بۆ دەکەین لە یەزدانی بەخشندە و میهرەبان داواکارم لە گشت ناخۆشییەک بتپارێزێ، ئیتر بژی.)!

بەشێک لە نامەکان بریتین لەو نامانەی کە دوکتۆر مارف خەزنەدار بۆ کەسی بەرانبەر ناردوویەتی و ئەوانیش وەڵامیان داوەتەوە، هەندێکی تریان نامەی بێبەرانبەرە و لەلایەن ئەوانیترەوە بۆی نێردراوە، هەموو نامەکان لە لایەن ڕەگەزی نێرەوە هاتوون تەنیا دوو نامەیان نەبێت کە لە ڕەگەزی مێینەوەیە، کە ئەوانیش بریتین لە شوکریە ڕەسووڵ و نەسرین فەخری.

لە ڕێگەی خوێندنەوەی نامەکانەوە کەسێتی هەندێ ناوداری کوردمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە باس لە تایبەتمەندی کەسێتیی خۆیان دەکەن، بارودۆخی دەرچوونی بڵاوکراوەیەکمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بۆ نموونە لەو نامەی کە ئازاد عەبدولواحید ساڵی 1992 لە سلێمانییەوە بۆی دەنێرێت دەربارەی دەرچوونی گۆڤارێک. لە نامەکانەوە هەواڵی چاپکردن و وەرگێڕانی کتێب و بارودۆخی ڕۆشنبیری خوێندەواری کورد تێدەگەین، وەرگێڕ (حەمەسەعید حەمە کەریم) ساڵی 1983 نامەیەکی ناردووە لە شارەزوورەوە باس لەوە دەکات کتێبی (کورد)ی مینۆرسکی، کە دوکتۆر مارف خەزنەدار وەریگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی و



ئەویش وەریگێڕاوە بۆ کوردی و 10 هەزار دانەی لێ چاپ کردووە! هەروەها دەڵێت کتێبی (یادداشتەکانی ڕۆژنامەنووسی) مەکسیم گۆرگێم وەرگێڕاوە، کە کەوتە بازاڕ لە ماوەی هەفتەیەکدا هەر هەمووی فرۆشرا و هیچی نەمایەوە! لە هەندێک نامەکانەوە هەڵسەنگاندن و هەڵوێستی چەند چەند کەسایەتییەک دەخوێنینەوە لەبارەی نووسین و کەسایەتیی دوکتور مارف خەزنەدارەوە.

لە ڕێگەی نامەیەکی ئەحمەد هەردی شاعیرەوە ململانێی یەکترشکاندنی نووسەر و ئەدیبانی ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو دەزانین، ساڵی 1983 ئەحمەد هەردی شاعیر نامەیەک بۆ دوکتور مارف خەزنەدار دەنووسێت، لە نامەکەدا بە حوزنەوە ئەوە باس دەکات کە ئەمە چەندەهەمین جارە نووسەران و ئەدیبان هەواڵی مەرگی بە ناڕاست بڵاو دەکەنەوە و دەیمرێنن!



# مارف خەزنەدار
# دوایین پیری "نالی"ناس

تەلعەت تاهیر



## ئەیماوە غەیری زیکرێکی یاسەبوور نالی

لە کۆتایی ساڵانی هەشتاکانی سەدەی رابردوو (قورسیشە منداڵی و هەراشیم بخرێتە سەدەی رابردووەوە)، بۆ یەکەم جار چوومە ماڵی دکتۆر مارف خەزنەدار، بە بێجامەیەکەوە سەرقاڵی باخچەی ماڵەکەی بوو، بۆ منی تازەهەراش، دانیشتن لەگەڵ پیاوێکی لە چەشنی دکتۆر مارفدا کە مەلەوانێکی شارەزای بەحری نالی و ناسراوترین رووناکبیری هەولێر و بەرگریکارێکی لەسەر هەقی "رەمزی نافیع" و کوردایەتی، کارێکی تا بڵێی مایەی کامەرانی بوو، دوای ئەوەی بەدەم قسەوە هەندێ بیلکاریمان لە باخچەکەی کرد، چوومە ژوورە پڕاوپڕ لە کتێبەکەی، هەر زوو سحری ئەو ژوورە دایگرتم. منێک لەگەڵ دوو برا و دوو خوشک لە ژوورێکدا دەخەوتین، زۆر جار لە حەوشەدا کتێبم دەخوێندەوە و زوو زووش باوکم لە کتێبەکەی دادەبراندم لەوەی کاسبییەک بکەم باشترە، لەپڕ کەوتمە ناو بەهەشتەکەی ئەلیجێری دانتی، کەوتمە ناو بۆنی کتێبان (کە دواتر زانیم بۆنی کتێبخانە زۆر لە بۆنی ناو کلێسا دەچێت).

من گەنج بووم و ئەویش لەوسەری هەموو بابەتەکان هاتبووەوە، من باسی شۆڤلێکم دەکرد کە پێویستە هەرچی ئەدەبی کوردە رایماڵێ، ئەویش خەمی ئەوەی بوو کە نالی چەند بەیتی مۆڵەمەعی هەیە، من پێم وابوو کورد پاکترین میللەتی مێژووە و ئەو پێی وابوو نەتەوە شەقاوێک ئەولاتری عەشیرەتە. من خوێنگەرم بووم و دەمویست لەناو شاعیرانی گەرەکی کوراندا یەکەمین بم و ئەو هێشتا سیحری جوانییەکانی سان پترسبۆرگ بەرینەدابوو. پێویستە بڵێم کە من زۆر قەرزاری "دکتۆر مارف"م، هەمیشە دەرگای ماڵەکەی بۆ من کراوە بووە، قەت رەزیلی نەکردووە لە وەڵامێک کە پرسیارەکەی خەوی لێ سەندووم. یەکەم کەس بووە دەستی گرتووم لە تێگەیشتنی کلاسیکی کوردی، لێکدانەوەی بەنرخ و ناوازەی هەبوو بۆ شیعری نوێی کوردیی سەردەمی عەبدوڵڵا گۆران و نەوەکەی. زۆر جار بەیەکەوە دەچووینە گەرەکەکانی تەعجیل و عەرەبان و بێریژیان و یەکە یەکە نەخشەی کۆنی هەولێری پێ دەناساندم. باسی شەتڵەخاسی لە شوێنانێک دەکرد کە ببووە کتێبخانە و پەنجەی بۆ کۆلانێک رادەکێشا کە کاتی خۆی کارێز بووە، ناوی ئەو ماڵە دەگمەنانەی پێ دەناساندم کە لە ساڵانی چلەکاندا بە کوردی لە ماڵەوە قسەیان دەکرد. باسی قوتابخانەی ئەدەبی سۆفیگەری و شیعری ئۆتوماتیکی سۆفییەکانی مێژووی ئیسلامیی بۆ دەکردم، کە پێش چەندین سەدە لە خۆرئاواییەکان نوێگەرییان داهێناوە (ئەو نوێگەرییەی کە لە سەدەی بیستدا خۆرئاواییەکان پێوەی دەنازن!) لە رێی ئەوەوە من کتێبی (عروج)ی محیدین بن عەرەبی و (الامتاع والموانسة)ی ئەبی حەبیانی تەوحیدی و (فن الهوا)ی ئۆڤید و (کۆمیدیای ئیلاهی)ی ئەلیجێری دانتیم خوێندووەتەوە. لە ماڵەکەیدا عەبدولخالق مەعروف و بەدیع باباجانم ناسی. هەردەم سفرەی خواردن و سفرەی زانست و سفرەی کتێب بۆ هەموان واڵا بوو. خانەوادەیەکی هەبوو لە ئاو پاکتر و لە حەڵوا نەرمتر. زۆر باسی نووسینەوەی یادداشتمان دەکرد، بیرمە هەندێ کتێبی یادداشتیشم بۆ برد کە پێم وابوو سوودیان دەبێ، لەوانە (راپۆرت بۆ گریگۆ)ی نیکۆس کازانزاکیس. دواتر بە هۆی کارێکەوە لێکدابراین، هەمیشەیش ددانم پێدا ناوە کە ئەو دابرانە ئەنجامی هەڵەیەکی کوشندەی من بوو، من خەتابارم لەوەی دوو کتێبی دکتۆر مارفم فەوتاند، گەنج بووم و هەر هێندە لە دنیا دەگەیشتم، دەربەست نەبووم بە دنیا و رەفیقایەتییەوە، دوو کتێبەکەم فرۆشت و کتێبی (فی ساعة النحس)ی گابریل گاریسا مارکیزم پێ کڕی (کە ئێستایش لای من خۆشەویستترین رۆمانە)، هەرچەندە ئەمە شەفاعەتم بۆ ناکات لە فەوتاندنی دوو بەشەکەی (تاریخ المانیا الهتلرية) و چەندین جاریش داوای لێبووردنم بۆ ناردووە و هەموو جارێکیش بە دڵە گەورەکەی پەیامی بۆ ناردووم و گوتبووی: "کتێب بە

قوربانی تەڵعەت بی، بەڵام با ببینم و بێتە لام و سەردانم بکات*. من بوومە مندارە سلێمانی و بەدیار ئەزمەڕەوە ڕۆژانم دەگوزەراند، ئەویش هەر لە ماڵە ڕووناکەکەی لە گەڕەکی ڕووناکیدا مایەوە. بۆ زیاتر لە پانزە ساڵ من لە قسە و زانست و کەسایەتیی دکتۆر مارف دوور بووم و ڕووم نەبوو چاوم بە چاوی بکەوێتەوە، بەڵام خەفەتم لەوەدایە کە مرد و پێم نەگوت چەندم خۆش ویستووە، مرد و وەکو پێویست داوای لێبووردنم لێ نەکرد، هیتلەر تەنیا جوولەکەکانی نەسووتاند، پەیوەندییە جوانەکەی من و دکتۆر مارفیشی سووتاند، مێژووی ئەڵمانیای هیتلەری، مێژووی نێوان من و دکتۆر مارفیشی کاول کرد، چەند حەز دەکەم ڕۆژگار بسوورێتەوە و دەست بۆ ئەو دوو کتێبە نەبەم. ڕۆژان بێتەوە و خاکەناسێک بگرم و لە باخچەکەیدا باسی جۆرەکانی شەراب و شیعری نالی و پەنجا فلسەکەی محەمەد مەولوود مەم بکەینەوە (ئەمجارەیان شەرتبێ قسە لە قسەی نەکەم تەنیا سەر ڕاوەشێنم).

# لە یەکەمین بینیندا؛
# دوکتۆر خەزنەدارێکی جیاواز

**دانا فایەق**



ناوەڕاستی ساڵی 2001 بوو، کە بۆ یەکەمین جار دوکتۆر مارف خەزنەدارم لە ماڵی خۆیان، لە نزیکەوە بینی و قسەم لەگەڵیدا کرد.

پێشتر لە ڕێی بەرهەم و نووسینەکانیەوە، کە هەندێکیانم خوێندبووەوە، دوور بە دوور ئەو زاتەم دەناسی، جگە لەوە گەلێک قسە و بۆچوونم سەبارەت بە دوکتۆر خەزنەدار بیستبوون، دەگوترا کەسێکی لەخۆبایی و لووتبەرزە، وشک و موعەقەدە و هەرگیز پێناکەنی، قسان ناکات و زۆر خۆی بە شت دەزانی، کەسێکی ڕووشکێنە و خەڵک تەریق دەکاتەوە... بیستبووشم کە (بەشیر موشیر- ئوستاد) گوتبووی: مارف خەزنەدار با نەیەت بۆ دوکانەکەم، عەبووسە، قسەڕەقە، شیوعییە!

هەموو ئەو قسانەی لەبارەی ئەو مرۆڤەوە و پێش یەکەمین یەکتربینین، بیستبوومن، دوودڵی و ترسێکی زۆریان لە لام دروست کردبوو و هەوڵم دەدا و لە دڵەوە دەمخواست هەرگیز ئەو یەکتربینینە ڕوو نەدات، بەڵام ڕاسپاردەیەکی مامۆستا عومەر مەعرووف بەرزنجی هەبوو، کە نامەیەک و کۆمەڵێک کتێب بوون، دەبوو لە سەفەرکردنم بۆ هەولێر بیانگەیەنمە دەستی دوکتۆر و لەویشەوە کۆمەڵێک کتێب هەبوون کە بۆ مامۆستا عومەری دانابوون، دەبوو بیانهێنمەوە بۆ سلێمانی، هەڵبەت لەبەر ئەوەی داواکارییەکە هی مامۆستا عومەر بوو، بە هیچ جۆرێک دەرفەتی نەچوون و خۆدزینەوەی ئەو دیدارەم نەبوو.

بە هەرحاڵ، شەوەکەی تەلەفۆنم بۆی کرد و خۆمم پێی ناساند، پێم گوت لە سلێمانییەوە کۆمەڵێک کتێبم بۆت هێناوە و نازانم چۆن بیگەیەنمە دەستت. دوای ئەوەی گوتم (کۆمەڵێک کتێبم بۆت هێناوە)، هەستم کرد تۆنی دەنگی گۆڕا و کەیفی ساز بوو، چونکە وەک خۆی لە بەرنامەی (باخی کتێب)ی کەناڵی کوردساتدا ئاماژەی پێ دا: (جوانترین دیاری بە لامەوە کتێبە و لە ژیانمدا ماستی هەولێر و گەزۆی سلێمانیی لێ دەرچێ، هیچ دیارییەکم لە کەس وەرنەگرتووە و قبووڵ نەکردووە، جگە لە کتێب...).

گوتی سبەی لە ماڵەوەم، هەر کاتێک هاتی بەخێر بێیت. ناونیشانی ماڵی خۆیانی پێ گوتم، سبەی بەرەو گەڕەکی ڕووناکی، بۆ ماڵیان بەڕێکەوتم.

لە ڕێگە ئەو هەستە ناخۆشەی پێشتر هەمبوو سەبارەت بە دوکتۆر خەزنەدار و ئەو قسانەی لەبارەیەوە بیستبووم، تەواوی مێشکمیان داگیر کردبوو و لە دڵەوە خۆزگەم بەو چرکەساتە دەخواست کە لە ماڵیان دێمە دەرێ و ڕزگارم دەبێ.

کاتێک گەیشتم بینیم دوکتۆر لە حەوشە، لەسەر قەنەفەیەکی قەدیمی دانیشتووە و چاوەڕێی گەیشتنی من دەکات. لەگەڵ یەکەمین بینین و دانیشتندا، سەرجەمی قسە و بۆچوونەکان لەبارەی دوکتۆر مارفەوە بە ناڕاست گەڕان و پووچەڵ بوونەوە. ئەو یەکسەر بە جۆرێک ڕەفتاری کرد، وەک ئەوەی دەمێک بێ یەکدی بناسین و هاوڕێی یەکتری بین. سەرەتا گوتی با کەمێک لێرە دانیشین و دواتر دەچینە ژوورەوە. پێشتر زۆرم لەبارەی ژووری کتێبخانەکەیەوە بیستبوو، بۆیە پەلەم بوو زوو بچینە ژوورەوە و بیبینم. دوکتۆر هەواڵی دۆخی سیاسی و ڕۆشنبیریی سلێمانیی پرسی و لەو کاتەدا کە سەرقاڵی ئەو باسە بووین، خاتوو (سەعدیە)ی خێزانی، سینییەک بە دەستیەوە، کە دوو پەرداخ ئاوی لەسەر بوو، هات بۆ لامان و زۆر بە گەرمی بەخێری هێنام. سەعدیە خانم لەو جۆرە ژنانەیە، هەر لە یەکەمین بینیندا هەست دەکەیت پەروەردەی بنەماڵەیەکی ڕێزدار و خانەدانە. هێندەی پێ نەچوو بە قوتوویەک شیرینی و دوو پیاڵە چاییەوە هاتەوە لامان. خاتوو سەعدیە بەو تەمەنەوە وەڕەز نەدەبوو لە خزمەتکردنی میوانەکانی خەزنەدار و جار لەدوای جار کە دەچووم زیاتر هەستم بە ڕێزداری و میهرەبانییەکەی دەکرد، بۆیە هەموو جارێک لە دڵی خۆمدا دەمگوت (ئەوەش یەکێکی ترە لە خۆشبەختییەکانی دوکتۆر خەزنەدار)، بە دڵنیاییەوە بەشێک لە ئازایەتی و پڕبەرهەمیی دوکتۆر خەزنەدار، دەگەڕێتەوە بۆ ماندووبوون و لەخۆبوردوویی ئەو خانمە.




ئەو کاتەی قسەم بۆ دوکتۆر دەکرد، دەمبینی زوو زوو سەیری عەلاگەکەی دەستم دەکات و هەستم دەکرد پەلەیەتی بزانێ ئەو کتێبانەی بۆی هاتوون چین؟! ئەو کاتەی عەلاگەکەم دایە دەستی، هەڵسایە سەر پێ و گوتی باشترە بچینە ژوورەوە. ئەو لە پێشەوە و

من بە دوایدا بەرەو ژووری کتێبخانەکەی... بەڵام چ ژوور و چ کتێبخانەیەک؟ زەحمەتە کەسێک هەبێت کە یەکەم هەنگاو دەچێتە ئەو ژوورەوە، شۆک نەبێت و سەری سوور نەمێنێ! ژوورێکی دووردرێژ، تا بنمیچ کتێب. جگە لەو مێزەی دوکتۆر شتی لەسەر دەنووسی و ئەو مێزەی بۆ خوێندنەوە کۆمەڵێک کورسی بە چواردەوریەوە بوون، پەیژەیەکیش لەولاوە داندرابوو، بەهۆی ئەو پەیژەیەوە نەبوایە زۆرێک لە کتێبەکان دەست نەیاندەگەیشتێ و دانەدەگیران.

من پێشتر هەرگیز بە خەیاڵیش وێنای کتێبخانەی لەو جۆرەم نەکردبوو و بە چاوی خۆم نەمبینیایە باوەڕم نەدەکرد کتێبخانەیەکی لەو جۆرە لە هیچ ماڵێکدا هەبێت. لەو کاتەدا (جاحز) و کتێبخانەکەیم بیر کەوتەوە. (ڕەنگە کتێبخانەکەی جاحزیش هەر هێندە دەوڵەمەند بووبێت کە کتێبەکان بەسەریدا ڕمان و لە ژێریاندا مرد. بڵێی دوکتۆر مارف نەترسی لەناکاو کتێبەکان بەسەریدا برمێن و لە ژێریاندا بمری؟) لە دڵی خۆمدا وام گوت!

دوکتۆر کتێبەکانی لەناو عەلاگەکەدا دەرهێنان و یەک یەک کەوتە سەیرکردنیان، دواتر لەسەر مێزەکەی بەردەمی دایدەنان. ئینجا زەرفی نامەکەی مامۆستا عومەری گرت بە دەستیەوە و زۆر بە وردی و دیقەتەوە هەڵیپچڕی، نامەکەی دەرهێنا و دەستی کرد بە خوێندنەوەی. دوای ئەوە هەر جارێک کە دەچووم بۆ ماڵی دوکتۆر خەزنەدار، ڕەفەیەکی کتێبخانەکەی لە هەموو شتەکان زیاتر سەرنجی ڕادەکێشام، ئەویش ئەو ڕەفەیە بوو کە کۆمەڵێکی زۆر زەرفی بەتاڵی نامەی تێدا بوو، هەموو زەرفەکان هیی ئەو نامانە بوون کە بۆی هاتبوون، دوکتۆر مارف تەنانەت زەرفە بەتاڵەکانیشی نەدەفەوتاندن و ئەرشیفی دەکردن!

دوای خوێندنەوەی نامەکەی مامۆستا عومەر، سەیرێکی کردم و گوتی: ئەم نامەیە پێویستی بە وەڵامە، هەروەها داوای چەند کتێبێکیشی کردووە کە دەبێت بۆی بنێرم. تۆ کەی دەگەڕێیتەوە؟ گوتم: سبەینێ پاشنیوەڕۆ. گوتی: زۆر باشە، بەر لەوەی بڕۆیتەوە دەتوانی سەرێکم لێ بدەیتەوە؟ گوتم: بەسەرچاو. پاشان دەستمان کرد بە گفتوگۆ و لەبارەی زۆر شتەوە قسەی بۆ کردم. هەستم دەکرد حەز دەکات لەو ماوە کەمەدا زۆرترین زانیاریم پێ ببەخشێ! دواتر زانیم کە ئەو تاقەتی موجامەلە و پێچوپەنای نییە، هەرچی هەیە ڕاستەوخۆ بە بەرامبەرەکەی دەڵێ، هەر ئەوە بوو وای لە کۆمەڵێک کەس کردبوو پێی بڵێن قسەڕەق و ڕووشکێن.

کاتێک داوای ئیزنم لێی کرد، دوکتۆر تا ناو دەرگای حەوشە لەگەڵمدا هات و دواتر گوتی سبەینێ بێیتەوە چاوەڕێم.

ئەو دیدارە تەواوی ئەو قسانەی لام بەتاڵ کردەوە کە لەبارەی لووتبەرزی و وشکی و خۆبەزلزانیی دوکتۆر مارفەوە بیستبوومن و ئەوەی بە چاوی خۆم بینیم دوکتۆر مارفێکی تر بوو. بۆیە هەر دوای ماڵئاوایی، وێنەی ئەو مرۆڤەم بە جۆرێکی تر لە مێشکی خۆمدا دارشتەوە، واتا وێنە ڕاستەقینەکەی خۆی.

بۆ سبەینێ جارێکی تر چوومەوە بۆ ماڵی دوکتۆر، (سەعدیە) خانم دەرگای لێ کردمەوە و بە هەمان میهرەبانییەکەی دوێنێ بەخێری هێنام. دوکتۆر لە ژوورەکەی خۆی بوو، سەعدیە خانم پێشم کەوت بۆ ئەوێ. هەر کە وەژوورکەوتم، دوکتۆر خەزنەدار بەرەو ڕووم و گوتی: بەخێر هاتی. ببوورە، ئەوەندە سەرقاڵ بووم کاتم نەبوو وەڵامی نامەکەی کاک عومەر بدەمەوە، دانیشە ئێستا بە پەلە چەند دێرێکی بۆ دەنووسم. دواتر کتێبێکی گەورەی لەسەر مێزەکەی خۆی هەڵگرت و دایە دەستم، گوتی: تا من نامەکە دەنووسم تۆ بۆخۆت سەیری ئەو ئەلبوومە بکە، ئەوە هاوڕێیەکم لە ئەمریکاوە بۆی ناردووم. ئەو ئەلبوومە پڕە لە وێنەت دانسقە و تایبەتی سەرکردە و کەسایەتییەکانی کورد و ناوچە کوردنشینەکان. خانمێکی ئەمریکی کۆی کردووەتەوە و چاپی کردووە. منیش زۆر هاوکاریم کردووە بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەلبوومەکە و کۆمەڵێک وێنەی دەگمەنم داوەتێ...

من هێشتا لە سەیرکردنی وێنەکان نەبووبوومەوە. ئەو دەستی لە نووسینی نامەکە هەڵگرت و نامەکەی خستە ناو زەرفێکەوە، دواتر لەگەڵ کۆمەڵێک کتێبدا دایە دەستم.

لەدوای ئەو یەکتربینینە ئیتر پەیوەندیی دوکتۆر مارف لەگەڵ مندا بەردەوام بوو و هەر جارێک کتێبێکی تازەی چاپ دەکرد، نوسخەی منی بیر نەدەچوو و منیش هەر جارێک دەچووم بۆ هەولێر، هەر ئەوەندەی کاتم ببوایە، دەبوو سەرێک لە دوکتۆر بدەم، هەموو جارێکیش زیاتر هەستم بە خاکەڕاییەکەی دەکرد و زیاتریش بە کتێبخانەکەی سەرسام دەبووم.

شتێکی تر کە لە دوکتۆر خەزنەداردا پێم خۆش بوو، لەو دانیشتنە و دانیشتنەکانی دواتریشدا، هەرگیز باسی نەیارەکانی و ئەو کەسانەی نەدەکرد کە بەردەوام وێنەی ئەویان دەشێواند، بەڵکو زیاتر باسی هاوڕێ و دۆست و کەسە نزیکەکانی دەکرد و یادی دەکردنەوە. (تۆفیق وەهبی بەگ، ئەحمەد هەردی، عەبدولخالق مەعرووف، دڵشاد مەریوانی و...) لەو زاتانە بوون کە دوکتۆر زیاتر باسی دەکردن.

لە سەردانێکیدا بۆ سلێمانی، کە دوکتۆر عەبدوڵڵا عەلیاوایی لەگەڵدا بوو، دوکتۆر مارف خۆی کرد بە کتێبخانەی سلێمانیدا و کتێبێکی کڕی. ئێستا بیرم نەماوە چ کتێبێکی بوو، بەڵام بیرمە کتێبێکی قەبارە گەورەی (350) لاپەڕەیی بەرەوژوور بوو. دوکتۆر مارف دەستی کرد بە سەیرکردنی کتێبەکە و لاپەڕە بە لاپەڕە هەڵیدەدایەوە، لەگەڵیدا سەیری ژمارەی لاپەڕەکانیشی دەکرد و دەیژماردن. سیامەند هادیی هاوڕێم دەمی لە گوێچکەم نزیک کردەوە و گوتی: (سەیری ئەو تاقەتە). دیمەنەکە بۆ منیش سەیر و جیاواز بوو. دوای ئەوەی زانیی کە کتێبەکە هیچ کەموکووڕی و نوقسانییەکی نییە، سەیرێکی کردین و گوتی: ببوورن؛ وا بزانم دوامخستن، بەڵام ناچار بووم وا بکەیم. کاکە من لێرە نیم و دوورم، وا بردمەوە بۆ هەولێر و لەوێ زانیم لاپەڕەیەکی نوقسانە، لەوێوە چۆن بیهێنمەوە و بیگۆڕمەوە؟ لێرەدا دەتوانین بڵێین، دوکتۆر مارف بە مانای وشە شەیدای کتێب بوو، خۆشەویستیی بۆ کتێب لە خوێنیدا بوو و بە دەمارەکانیدا دەگەڕا. هەموو خۆشی و چێژەکانی ژیانی لە کتێبدا دەبینییەوە، بۆیە ئەگەرچی تەمەنێکی باش توانیی خزمەت بە کتێب بکات و کتێبخانەی کوردی ئاوەدان بکاتەوە، بەڵام ئەگەر مەرگ لێبگەڕایە، بەو تەمەنەشەوە هێشتا دەیتوانی زیاتر لەنێو کتێب و نووسیندا بژیت و خزمەتی زیاتر بە کتێبخانەی کوردی بکات...

ڕۆحی ئاسوودە بێ.



# دوو وێستگەی پڕشکۆ لە دیداری د. مارف خەزنەدار

**کاوە حاجی عەزیز**


لە ڕاستەوە: کاوە حاجی عەزیز، د. مارف خەزنەدار، د. عوسمان دەشتی، د. ڕەووف عوسمان و سەلاحەدین ئاشتی

## ویستگەی یەکەم

لە پاییزی ساڵی ٢٠٠٥دا، هاوکات نۆیەمین فیستیڤاڵی گەلاوێژ بوو، دکتۆر مارف داوەتی ڕەسمیی فیستیڤاڵ بوو، وەک میوان لە یەکەمین ڕۆژدا بابەتێکی لەسەر شەهید دڵشاد مەریوانی پێشکەش کرد، وەک شایەتحاڵێک دەڵێم: ئەو مامۆستای دڵشاد مەریوانی بوو، بە جۆرێک سەرسامیی خۆی بەو دەردەبڕی کە نەتدەزانی کامیان مامۆستای کامیان بووە، چونکە سەرسامی هەر خوێندکار بە مامۆستای خۆی دەبێت، بە تایبەتی بەو جۆرەی کە دکتۆر مارف باسی لێوە دەکرد، ئەمەش گەورەیی ئەو دەردەخات، بە تایبەتی کە بینیم لە کاتی پێشکەشکردنی بابەتەکەیدا چاوەکانی نوقم بووبوون لە فرمێسکدا! هەر لەو فیستیڤاڵەدا هەندێ لەو نووسەرانەی شار کە چارەی ئێمەیان نەدەویست، لەبەر خۆشەویستیی دکتۆر مارف ئامادە بوون. هۆڵی سەنتەری گەنجان جمەی دەهات لەبەر مامۆستا و خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی جێ نەمابوو، بە تایبەت بەشی زمانی کوردی.

پێم سەیر بوو ئەوان هەموویان لەبەر ئەو زاتە هاتبوو، لەوە سەیرتر وێنەگرتن لەگەڵیدا هەر مەپرسە! هاوڕێیەکم هەبوو پێمی دەگوت: خۆزگە وێنەگری بوومایە، ئەمڕۆ قەپات دەبووم. ئەوەشم بیر نەچێ، ئۆخژنێکی خستبووە نێو دڵی نووسەران و شاعیرانی ڕۆژهەڵات، خۆیانناسا شاگەشکە بوون. مەخابن! دکتۆر مارف تەنها شەوێک مایەوە و بەیانییەکەی بەجێی هێشتین. داخەکەم بە هەموو تەمەنی ئەو فیستیڤاڵە تەنها ئەو جارە هاتبوو، مەحاڵە لەبیر بچێت.

## ویستگەی دووەم

ساڵی ٢٠٠٧، ئەو کاتەی کە ئەندامی دەستەی کارگێڕیی بنکەی گەلاوێژ بووم، بڕیارمان دا کۆڕێکی ڕێزلێنان بۆ نووسەر و چیرۆکنووس حسێن عارف ساز بکەین، بەنیاز بووین فیلمێکی دیکۆمێنتاری بۆ ئەو مەبەستە بەئەنجام بگەیەنین (خۆشبەختانە تا ئێستاش چەندین جار لە tv گەلی کوردستان پەخش دەکرێت)، یەکێک لە کارەکتەرەکانی نێو فیلمەکە، کە ئێمە مەبەستمان بوو تا بەشدار بێت، بەهەشتی دکتۆر مارف خەزنەدار بوو. لە ناوەڕاستی مانگی پێنجی هەمان ساڵدا گەیشتینە هەولێر- گەڕەکی ڕووناکی- سەعات دەی بەیانی بوو لە دەرگامان دا، چاک لەبیرمە ئەوەی دەرگاکەی لێ کردینەوە، دکتۆر سەباحی غالب بوو. گوتی ئێوە چۆن بەبێ مەوعید هاتوون؟ شتی وا چۆن دەبێ؟ دکتۆر کاتی نییە بتانبینێت. قسەکانی ڕاست بوون. ئەو تیمەی لەگەڵماندا بوون زۆر نیگەران بوون، پێم گوتن ئارام بن، حل دەبێ، یەکڕاست تەلەفۆنێکم بۆ مامۆستا عومەر مارف بەرزنجی لە سلێمانی کرد، تێم گەیاند لەبەر دڵسۆزیی کارەکەی خۆمان ئەو ئەتەکێتەمان فەرامۆش کردووە، بەڵکوو بە گەورەیی خۆت قسەیەک لەگەڵ دکتۆردا بکەیت.

مامۆستا عومەر فەرمووی لە بەردەرگا بوەستن ئێستا خۆم قسەی لەگەڵدا دەکەم، ئەوەندەی نەبرد ڕەحمەتی دکتۆر مارف خۆی هات و بە ڕوویەکی گەشەوە دەرگاکەی لێ کردینەوە و فەرمووی وەڵاهی یەکێک پێی گوتووم ناکرێ من پێشوازییتان لێ نەکەم، فەرموون وەرنە ژوورەوە. چووینە ژوورەوە. ئیدی من ناوی خۆم بیر چووەوە و خۆیشم نەمزانی بۆچی هاتووم. سەرەتا لە مەدخەلی ماڵەکەیەوە تا هۆڵی دانیشتن من هەر سەرنجی کتێبم دەدا، چووینە هۆڵێکی گەورە تا بنمیچەکە هەر کتێب بوو... زەردەخەنە و ڕووخۆشییەکەی دکتۆر لەولاوە وەستا بێ، سەرنج و نیگای من هەر لەسەر کتێبەکانی ناو ئەو ژوورانە بوون کە لێوانلێو بوون لە کتێب، کە سەرجەمیان سەرچاوەی مەعریفەیی بوون بە کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی و ڕووسی، زمانی تریشی تیابوو، بەڵام من هەر ئەوەندە بەئاگا بووم. پەیژەم بینی تا دەستی بە هەندێ لەو کتێبانە بگات کە دەست نایانگاتێ. سەیر بوو، من دەمزانی ژووری نوستنەکەشی پڕیەتی لە کتێب، کە نەشمبینیبوو، لێ کاتێک خۆی لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا گوتبووی: ئەگەر دیوانی نالی و گۆران لە ژوورسەرم نەبن، ناتوانم بخەوم. ئیدی گومانم نەما تەنیا حەمام و توالێت نەبێ،



ئەوا سووچ و پەنا و ڕێڕەوی ئەو ماڵە بە کتێب پیرۆز کراوە! بەڕاستی لەو تەمەنەی خۆمدا کتێبخانەیەکی گەورە و ناوازەم بینی، کە لە هیچ کتێبخانەیەکی ماڵاندا نەمبینیبوو!

رامام و لە خۆمم پرسی باشە ئەم هەموو نەهامەتی و ڕاکردن و ماڵوێرانییەی بەسەر ئەم میللەتەدا هاتووە، کە حەتمەن پشکی بەر دکتۆریش کەوتووە، چۆن ئەم کتێبخانەیە ئاوا بە شکۆیی ماوەتەوە؟ دڵنیام عەشق و خۆڕاگرییەک لەپشت ئەم کارە مەزنەوەیە، باوەڕێک هەیە کە دواڕۆژێکی پرشنگدار چاوەڕێیە نەک کاولبوون و نووتەک و تاریکی، ئیتر نازانم کێ ئەم کولتوورە مەزنە، ئەم کەلەپوورە گەورەیە دەپارێزێت؟



# پردی هاوڕێیانە: هەولێر ـ سلێمانی

## پەیوەندیی د. مارف خەزنەدار بە دوو نووسەرەوە

بەختیار حەمەسوور



پەیوەندیی نێوان نووسەران و هونەرمەندان لە دنیادا بابەتێکی بەرباسە، کەم نین ئەو نووسەر و هونەرمەندانەی کە بە ناوهێنانی یەکێکیان، یەکسەر ئەویتریان بەبیر دێتەوە و ناوی دەهێنرێت، بێگومان چیرۆکی سەیر و ناوازە لەو پەیوەندییانەدا رووی داوە، کە دواتر بەشێکیان بوون بە کتێب و بەشێکی تریشیان بەسەر زارانەوە، دەگێردرێنەوە. وەک چۆن هەندێک لەو پەیوەندییانە بە جیابوونەوە و دواتریش ناشیرینکردن و ناوی یەکتر زڕاندن کۆتایی هاتووە، زۆرێکیش لەو پەیوەندییانە بە شێوەیەکی جوان تاکو کۆتایی درێژەیان کێشاوە و بوون بە وانە و نموونەیەک بۆ نەوەکانی دواتر. لەنێو نووسەران و هونەرمەندانی کوردیشدا ئەم جۆرە پەیوەندییانە هەبوون و هەن، بەو جیاوازییەوە و بەداخەوە، کە کەمترین جار پێشهاتووە لە درێژە و بەردەوامی ئەو پەیوەندییەدا، بە هەمان رادەی جوانیی سەرەتا و دەستپێک، بەکۆتا بگات. ئەمە باسێکە دەکرێت هەم لە رووی کۆمەڵناسییەوە، هەم لە رووی فەرهەنگییەوە تاوتوێ بکرێت و ئەنجامی ورد و بەجێیش بەدەست بهێنرێت. بە هەرحاڵ، د. مارف خەزنەدار یەکێکە لەو کەسانەی ئاشنایەتییەکی زۆری لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا هەبووە، ئەگەر لە رێی یادداشتەکانیشییەوە بێت، کە لەژێر ناونیشانی "رۆژگاری من"دا چاپ کراوە، هەروەها ئەرشیفی بەشێک لە نامەکانی، کە بە ناوی "ئەرشیفی نامەکانی مارف خەزنەدار" لە لایەن بنیاد خەزنەداری کوڕیەوە بڵاوکراوەتەوە، ئەوا تێدەگەین و دەبینین چەند پەیوەندییەکی هەمەلایەن و بەربڵاوی هەبووە، چ لەگەڵ نووسەران، چ لەگەڵ سیاسی و کەسایەتییە ناسراو و تەنانەت گومناوەکانیشدا، ئەمەش بۆ پێگە و هەلکەوتەی ژیانی دەگەڕێتەوە، چ وەک ئەکادیمی و مامۆستای زانکۆ، چ وەک نووسەر و لێکۆڵەرێک، کە ئەرکی نووسینەوەی پرۆژەیەکی گەورە و گرانی وەک پرۆژەی "مێژووی ئەدەبی کوردی" خستووەتە سەرشان. لەگەڵ ئەوانەشدا د. خەزنەدار گەشتگەلێکی زۆری بۆ وڵاتە جیاوازەکان کردووە، هەندێ جار بە هۆکاری خوێندن یان وەزیفە، بۆ ماوەی درێژ ماوەتەوە و تێکەڵ بە چین و توێژە جیاوازەکان بووە و ئاشنای کولتوور و زمانەکەیان بووە. بێگومان رادە و تینی پەیوەندییەکانی د. مارف خەزنەدار لەگەڵ ئەو کەسانەی ناسیونی، وەکیەک نەبووە، تەنانەت هەندێ جار بە لێکتەکینەوەش دوایی هاتووە. لەم نووسینەدا، لە بازنەیەکی دیاریکراودا، لە پەیوەندیی د. مارف خەزنەدار بە هەریەک لە نووسەران عومەر مەعروف بەرزنجی و دڵشاد مەریوانییەوە دەدوێین.

***

## عومەر مەعروف بەرزنجی



**هەولێر ١٩٨٣/٩/٢٥**
**ماڵ و کتێبخانەی دکتۆر مارف خەزنەدار بە مەبەستی بەشداریکردن لە رێورەسمی بەڕێکردنی د. مارف خەزنەدار بۆ وڵاتی جەزائیر.**
**لە ڕاستەوە : ڕەووف حەسەن ، زاهیر ئەحمەد سەوز، عومەر مەعروف بەرزنجی ، د. مارف خەزنەدار ، ڕەووف عوسمان، منداڵەکەش (فارس فوئاد حەمید) هاوڕێ و هاوسێی منداڵی ماڵە.**

لە وەڵامی پرسیارێکدا بۆ هەڵسەنگاندنی د. مارف خەزنەدار، عومەر مەعروف بەرزنجی بەم جۆرە دەدوێت: «کەسێک لە دواژمارەکانی گۆڤاری گەلاوێژی ساڵی ١٩٤٩ بەدواوە قەڵەمی بە دەستەوە بێ و تا ئێستاش بەخششی نووسینی

بەردەوام بێ و ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێشەوە بڕوات، دەبێ چی بڵێم؟»(١) پەیوەندیی هەردوو نووسەر و لێکۆڵەر د. مارف خەزنەدار و عومەر مەعروف بەرزنجی نموونەی پەیوەندییەکی ڕاستگۆیانە و جوانبووە، کە لە ئێستادا ئەو جۆرە پەیوەندییە یان نییە، یان بەگجار دەگمەن و دانسقەیە. پەیوەندیی ئەو دوو مرۆڤە بەر لە هەر شت، لەسەر بنەمای ڕێز و خۆشەویستی دامەزراوە، دواتریش بۆ ناو نووسین و لێکۆڵینەوە شۆڕ بووەتەوە و لەوەشدا چەند بەرهەمی سەرکەوتووی لێکەوتووەتەوە. بێگومان چ وەک تەمەن و چ وەک ئەزموونیش، د. خەزنەدار دەیەیەک و پتر لە عومەر مەعروف بەرزنجی گەورەتر بووە، هەر بۆیە لە بواری نووسین و بڵاوکردنەوەدا بەرهەمی پێش ئەو کەوتووە، بەڵام دواجار نووسین لێکی نزیک خستوونەتەوە و پردی پەیوەندییەکەیان لە نێوان هەولێر و سلێمانیدا، تەخت و خۆشڕێ بووە.

سەرەتای ناسینی د. مارف و عومەر مەعروف بەرزنجی دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو، واتە تاکو مردنی د. مارف، نزیک بە چل ساڵ دەکات، وەک عومەر مەعروف دەربارەی ئەو مێژووە دەڵێت: «چل ساڵ تا ئەوپەڕی سنوور و مەبەست نزیک و جێی متمانەی یەکتربووین.»(٢) ڕۆژانە پەیوەندییەکەیان تۆکمە و بەهێزتر دەبێت، وێڕای سەردان و یەکتربینین، بەردەوام کتێب و نامە لە نێوانیان ئاڵوگۆڕ کراوە. لە لێدوانێکدا بۆ نووسەری ئەم دێڕانە، عومەر مەعروف گوتی کە لە ئەرشیفخانەکەیدا بەشی کتێبێک نامەی د. مارفم لایە کە بۆی ناردووم. لە نووسینێکدا کاوە حاجی عەزیز باس لەوە دەکات کە لە سلێمانییەوە بۆ تۆمارکردنی دیکۆمێنتەرییەک لەگەڵ ستافێکدا چوونەتە هەولێر و گەڕەکی ڕووناکی و بەردەم دەرگای ماڵی د. مارف خەزنەدار، لە دەرگا دەدەن، «ئەوەی دەرگاکەی لێ کردینەوە، دکتۆر سەباحی غالب بوو. گوتی ئێوە چۆن بەبێ مەوعید هاتوون؟ شتی وا چۆن دەبێ؟ دکتۆر کاتی نییە بتانبینێت. قسەکانی ڕاست بوون. ئەو تیمەی لەگەڵماندا بوون زۆر نیگەران بوون، پێم گوتن ئارام بن، حل دەبێ، یەکڕاست تەلەفونێکم بۆ مامۆستا عومەر مەعروف بەرزنجی لە سلێمانی کرد، تێم گەیاند لەبەر دڵسۆزیی کارەکەی خۆمان ئەو ئەتەکێتەمان فەرامۆش کردووە، بەڵکو بە گەورەیی خۆت قسەیەک لەگەڵ دکتۆردا بکەیت. مامۆستا عومەر فەرمووی لە بەردەرگا بوەستن ئێستا خۆم قسەی لەگەڵدا دەکەم، ئەوەندەی نەبرد ڕەحمەتی د. مارف خۆی هات و بە ڕوویەکی گەشەوە دەرگاکەی لێ کردینەوە و فەرمووی وەڵاهی یەکێک پێی گوتووم ناکرێ من پێشوازییتان لێ نەکەم، فەرموون وەرنە ژوورەوە.»(٣) دانا فایەق دەگێڕێتەوە: چەند جار کە لە سلێمانییەوە چووەتە هەولێر، لە زەرفدا نامە و کتێبی عومەر مەعروف بەرزنجی بردووە بۆ د. مارف و لەوسەریشەوە وەڵامی نامە و کتێبی د. مارفی بۆ عومەر مەعروف بەرزنجی هێناوەتەوە.(٤) عومەر مەعروف بەرزنجی لە چەندین نووسین و بەرهەمدا بۆ کارەکانی د. خەزنەدار گەڕاوەتەوە و دەربارەیان دواوە، بۆ نموونەی لە ئەوەڵین کتێبیدا: "لێکۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی (١٩٢٥ ـ ١٩٦٩)"، کە لە ١٩٧٨دا چاپ و بڵاوکراوەتەوە، لە چەند شوێندا بۆچوون و چیرۆکەکانی د. مارف خەزنەداری بەسەر کردووەتەوە. لە کتێبی "بەڵگەی زیندوو"یشدا، کە کۆمەڵێک بابەتە سەبارەت بە ئەدەب و مێژوو، عومەر مەعروف لە یەکێک لە وتارەکاندا بە ناوی "جەژنی ڕۆژنامەنووسیی کوردی"، بە ستایشەوە باس لە ئاشکراکردنی ڕۆژی دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی دەکات، کە لە لایەن د. مارف خەزنەدارەوە لە ١٩٦٨دا، لە هەردوو ڕۆژنامەی "التآخي" بە زمانی عەرەبی و "برایی" بە زمانی کوردی، ئەو ڕۆژەی دەستنیشان کردووە و وەک بابەتێک بڵاوی کردووەتەوە.

گرنگترین ئاوڕدانەوەی عومەر مەعروف بەرزنجی لە د. مارف خەزنەدار کتێبێکە بەم ناوە: "برایم ئەحمەد لە کارە زانستی و ئەدەبییەکانی پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەداردا"، ئەم کتێبە ٢٠٠٤ چاپ و بڵاو کراوەتەوە، یەکێکە لە کتێبە بەنرخ و جێسەرنجەکان، کتێبەکە پێکهاتووە لە چەند بابەتێک، کە تێکڕا دەرخەری ناوونیشانە سەرەکییەکەن، ئەویش شوێنپێهەڵگرتنی هەموو ئەو دێڕ، پاژ، نووسین، وەرگێران، نامە و کارە هاوبەشانەیە کە لە نێوان



برایم ئەحمەد و مارف خەزنەداردا هەبوون. وەک عومەر مەعروف خۆی دەنووسێت: «هۆی دانان و نووسینی ئەم کتێبە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە کاک ئەحمەد شەریف نامەیەکی ماستەری سەبارەت بە برایم ئەحمەد پێشکەش بە زانستگای سلێمانی کرد و دواتریش چاپی کرد، کتێبەکە بە قەوارە گەورەیە، بەڵام بە وشەیەک ناوی مارف خەزنەدار نەبراوە، کتێبەکەم خوێندەوە، سەبارەت بە د. خەزنەدار بڕیارم دا کە کتێبێکی لەسەر دابنێم، چونکە تا ئەو کاتەی کە ئەحمەد شەریف کتێبەکەی نووسیوە، کەس بەقەدەر د. خەزنەدار لە برایم ئەحمەدەوە نزیک نەبووە و شتی لە بارەوە نەنووسیوە.»(٥) بەرزنجی لەم کتێبەدا باس لە یەکەم وەرگێڕانی شیعرە بەناوبانگەکەی برایم ئەحمەد دەکات بە ناوی 'یادگار و هیوا'، کە مارف خەزنەدار بۆ سەر زمانی عەرەبی وەریگێڕاوە و ١٩٥٦ لە کتێبی 'آغانی کردستان'دا بڵاوی کردووەتەوە، هاوکات ئاماژە بە هەموو ئەو نووسراوانە دەکات کە د. مارف خەزنەدار نووسیونی و تێیاندا پێگە و شوێنی برایم ئەحمەد لە هەریەک لە کایەکانی: شیعر، پەخشان، چیرۆک، وتار، وەرگێڕان، ڕۆژنامەگەری و کایەی سیاسییدا دیاری دەکات، ئەوە جیا لە کاری هاوڕێیانە و هاوبەشانەیان لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری 'شەفەق' و ڕۆژنامەی 'خەبات'دا و وەرگێڕانی دوو چیرۆکی برایم ئەحمەد بۆ سەر زمانی ڕووسی. جێی ئاماژەبۆکردنە کە لە یادداشتەکانیشیدا، د. خەزنەدار بە وردی و درێژی دەربارەی برایم ئەحمەد نووسیویەتی و چەندان یادەوەریی لێ گێڕاوەتەوە.

لە خوێندنەوەی کتێبەکەی عومەر مەعروف بەرزنجیدا، کە کارێکی تەواو زانستییە و بەرهەمی نووسەرێکی کەمنووس و هەقبێژە، ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر پەنهانە، کە دەتوانین لە دێڕ بە دێڕی ئەم کتێبەدا بیخوێنینەوە: دەرخستن و دەرەوشانەوەی وەفاداریی بێدەنگانەی برایم ئەحمەد و د. مارف خەزنەدار بە پێنووسی عومەر مەعروف بەرزنجی.

***

## دڵشاد مەریوانی



**سەیرانی زانکۆ، ١٩٧٥ بەغدا**
**لە ڕاستەوە: دڵشاد مەریوانی، زەینەب (خوێندکاری بەشی کورد لە زانکۆی بەغدا)، مارف خەزنەدار**

دڵشاد محەمەدئەمین مەریوانی قوتابی د. مارف خەزنەدار بووە، لە بەغدا، لە کۆلێژی ئاداب، بەشی زمانی کوردی. د. خەزنەدار لە نووسینێکدا، بە شێوەیەکی درامی باس لە سەرەتای ئاشنایەتیی خۆی و دڵشاد مەریوانی دەکات؛ دەوامی ساڵی نوێی خوێندن دەکرێتەوە، پاش ماوەیەک، قوتابییەک دەنێرن بۆ هەمان بەش، مامۆستاکان بەردەوام لەو قوتابییانە بە گومان بوون، پێیان وابووە شایستە نین، چونکە چەند جار هەڵکەوتووە کە مەرجەکانی ئەو بەشە زانستییەیان تێدا نەبووبێت، یاخود بە واسیتە نێردرابن، دڵشاد مەریوانی ئەو قوتابییە دەبێت. سەرەتا د. مارف دڵشاد نەدیو دەگرێت، ئەمە ئازاری مەریوانی دەدات، ڕۆژێک دەبینێت د. مارف تەنیایە و لە ژوورەکەی دانیشتووە، لە دەرگا دەدات و دەڵێت: «'ڕێگە هەیە لە

خزمەتتدابم؟" گوتم: "بەڵێ." گوتی: "دوێنێ و پێرێ گەیشتمە ئەو ڕاستییەی تۆم زۆر خۆش دەوێ، بەڵام وا هەست دەکەم تۆ منت خۆش ناوێ!" گوتم: "سوپاست دەکەم بۆ ئەو خۆشەویستییەی تۆ بەرانبەر بە من، بەڵام نازانم چۆن بڕیاری وا دەدەی کە من تۆم خۆش ناوێ!" گوتی: "مامۆستا تۆ لە کاتی موحازەرەدا ڕوو دەکەیە هەموو قوتابییان، بە نۆرە یەکە یەکە تەماشایان دەکەی، تا دەگاتە ئەوەی هەندێ لەو زانیارییانەی لە دەمت دێنە دەرەوە، بۆ ئەو کەسەیە کە چاوت تێبڕیوە، بزە و زەردەخەنەت بۆ هەموو قوتابییانە تەنیا ڕوو لە من ناکەی!" گوتم: "ڕەنگە ئەمە لەوەوە هاتبێ تۆ ناناسم، لەگەڵ قوتابییانی دیکە دەمێکە بووم بە ناسیاو، وەکو لێت ئاشکرایە تۆ درەنگ هاتی بۆ ئەم دەستگا زانستییە." دڵشاد هەندێ بێدەنگ بوو. پاشان گوتی: "لەم دواییەدا بۆم دەرکەوت لە هەموو ڕوویەکەوە من لە تۆ نزیکم، لەبەر ئەوە تۆم خۆش دەوێ، لەوەش دڵنیام ڕۆژگار ڕاستی ئەم قسەیە بە هەردووکمان دەسەلمێنێ." ئیتر لەو ڕۆژەوە دڵشاد مەریوانی بوو بە یەکەمین قوتابیم، بوو بە هاوڕێی ژیانم.»(٦) د. خەزنەدار پەیوەندیی خۆی و دڵشاد، بە پەیوەندیی باوک و کوڕ دەچوێنێت، دڵشاد وەک یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکەی، وەک کوڕی ماڵەوە، ناو دەبات.

ئەم پەیوەندییە تەنیا لەسەر ئاستی نووسین ناوەستێت، بەڵکو بەرینتر دەبێتەوە و وەک شیرین. ک ی خێزانی دڵشاد مەریوانی لە چەند گفتوگۆدا لێی دواوە، هەرکات ڕێیان لە هەولێر کەوتبێت، لە ماڵە پڕکتێبەکەی د. خەزنەداردا ماونەتەوە. لە ئاستی نووسینیشدا کۆمەڵێک بەرهەم لەم هاوڕێیەتییە کەوتووەتەوە، کۆنترین و دوورترین نووسینێک کە دڵشاد مەریوانی لە شێوەی کتێبێکی چکۆلەدا لە ساڵی ١٩٧٣دا چاپ و بڵاوی کردووەتەوە، کتێبی "پێشوازیی خاوەنشکۆ و دوو چیرۆکنووس"، ئەم کتێبە کە میتۆدی بەراوردکارانەی بەکار هێناوە، تێیدا باس لە دوو چیرۆک دەکات کە مارف خەزنەدار و محەمەد مەولوود (مەم) نووسیویانە، هەردوو چیرۆکەکە لە ڕووی بابەتەوە هاوبەشن، ئەویش "هاتنی خاوەنشکۆ مەلیک فەیسەڵی دووەمە بۆ هەولێر و جۆری پێشوازیکردنیەتی لە لایەن خەڵکەوە"، د. خەزنەدار چیرۆکەکەی ناو ناوە "پێشوازیی خاوەنشکۆ" و محەمەد مەولوودیش ناوی "پێشوازی"

لە چیرۆکەکەی ناوە. دڵشاد مەریوانی بە شێوەیەکی بەراورد چەند دێڕ و پاژ لە هەردوو چیرۆکەکە دێنێتەوە و دواتریش لە ئەنجامێکی کورتدا، باسەکەی کۆتایی پێ دەهێنێت. بەسەرهاتی پشت ئەم لێکۆڵینەوەیە، وەک د. مارف دەیگێڕێتەوە، بەم شێوەیە بووە: «لە کورسێکدا، لەو پۆلەی ڕەخنەی ئەدەبیم دەگوتەوە، داوام لە قوتابیان کرد ئەوەی ئارەزوو دەکا، نەک هەموویان، بابەتێک هەڵبژێرن و لە ڕووی ڕەخنەی بەراوردکارییەوە هەڵیسەنگێنن. وابوو چەند قوتابییەک خۆشحاڵ بوون بەمە و هەریەکەیان هەڵبژارد و دەستی بەکار کرد. بۆ ئەم مەبەستە دڵشاد هاتە لام و گوتی دەیەوێ دەربارەی چیرۆکەکەی محەمەد مەولوود (مەم) و من بنووسێت.»(٧)

١٩٧٧ گۆڤاری "ڕۆژی کوردستان" لە کتێبێکدا، هەڵبژاردەیەک لەو شیعرانەی پێشتر لە گۆڤارەکەدا بڵاو بوونەتەوە، لە دووتوێی کتێبێکدا چاپ دەکات، لەگەڵیشیدا لە لایەن چەند نووسەرێکەوە خوێندنەوە بۆ دەقەکان دەکرێت، یەکێک لەو دەقانە شیعری "ماسی و کۆتر"ی دڵشاد مەریوانییە، کە لە لایەن د. مارف خەزنەدارەوە خوێندنەوەیەکی کورتی بۆ دەکرێت، ئەوەی کە بۆچی ئەو شیعرەی مەریوانی دەکەوێتە لای خەزنەدار، بێگومان بێهۆ نییە و هاوڕێیەتیی ئەو دووە پێکەوە، یەکەمین قسەی ڕاستودروستی ئەو وەڵامەیە.


دیوانی نالی
و
فەرهەنگی نالی

یەکێک لەو کتێبانەی وەک یادگار لە



کتێبخانە تایبەتەکەی دڵشاد مەریوانیدا هەیە، "دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی"یە، کە بەرهەمی د. خەزنەدارە، نوسخەیەک لەم کتێبە بە دەستخەتی د. مارف بەم شێوەیە پێشکەش بە مەریوانی کراوە: «بۆ برای خۆشەویستم شاعیر و ڕەخنەگری هەڵکەوتووی کورد دڵشاد محەمەدئەمین دیارییەکی دڵسۆزییە. بەغدا: ۱۹۷۸/۳/۳ برات: مارف خەزنەدار (واژوو)»

۱۹۸۰ دڵشاد محەمەدئەمین دیوانی "سەمفۆنیای وەنەوشە" چاپ دەکات. لە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی سەرەتای ئەم کتێبەدا چاومان بە پارچەیەک شیعری "گۆران" و سەرنجێکی کورت، بەڵام وردی، د. مارف خەزنەدار دەکەوێت بەم ناوەڕۆکەوە: «تا دڵداری بمێنێ، نووسین لەسەر دڵداری دەمێنێ. ئەگەر دڵداری نەما، ئادەمیزاد و ژیانیش نامێنێ. لە بابەت دڵدارییەوە زۆر وتراوە، بەڵام دەرگای داهێنان دانەخراوە. ئەگەرچی داهێنان لە هونەری دڵداریدا کارێکی قورسە، بەڵام دڵشاد محەمەدئەمین تیایدا سەرکەوتووە.»(۸)

نامەیەکی دڵشاد مەریوانی لە ۱۹۸۲دا جەختی زیادتر لەو دۆستایەتییە دەکاتەوە و نزیکایەتیی هەردوولا، بە خێزانیی، پێکەوە دەبەستێتەوە. نامەکە دەرخەری ئەو پەیوەندییە کراوە و خۆمانەییەی خەزنەدار و مەریوانییە، کە وێڕای باسکردنی ئەدەب و نوێترین بەرهەم، خەم بۆ زمانی کوردی و منداڵی کوردیش، لەو زەمەنەدا، زەمەنی دەسەڵاتی ڕژێمی بەعس، بۆ د. مارف دەردەبڕێت. لە بڕگەیەکدا دڵشاد دەنووسێت: «کە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم، سیڤا (ی کچم) دەڕوانێتە زنجیرەی یاقووتی تەلەفزیۆنی، خورپەیەک لە دڵمدایە. باشە وا ئێوەمانان بابەتی جوان و بەپێز بۆ ئێمەمانانی خوێندەوار و تەمەن گەورە دەنووسن، واتە ئێمە کامەران و بەختەوەرین، بەڵام دیسان مەسەلەی سیڤا و سیڤاکان دەمێنێتەوە، دیارە بنۆش (بنۆ: بنیادی کوڕی د. مارف) حەز دەکا وەکو سیڤا داوای کارتۆنی کوردی دەکا. مەخابن داواکەی ئەوان بەستراوە بە مەسەلەی کوردەوە، نەک مارف خەزنەدار و لانەی نوێ و داهێنانی نوێتر.»(۹)

"کوردیادە" داستانێکی شیعرئامێزی د. مارف خەزنەدارە، ۱۹۸۵ چاپ بووە. لە بەرگی پشتەوەی ئەم کتێبەدا هاتووە: «لە تەمموزی ۱۹۸۸ دانەیەک لە چاپی یەکەمی کوردیادە و پاکنووسی ئامادەکراو بۆ چاپی دووەم، پێشکەش بە قوتابی و هاوڕێی هەرە نزیک و خۆشەویستم دڵشاد مەریوانی کرد. بەم دێڕانە هەست و نەستی خۆی دەربڕی بەرانبەر کوردیادە:

"ئەم نووسینە شۆڕشێکی ئەدەبی و هونەری دەنێتەوە، چونکە بابەتێکی تازە و نوێیە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە، بۆ یەکەمجار وا دەزانی مانا دیار و ئاشکرا و بێ گرێیە، بەڵام لە دواییدا بۆت دەردەکەوێ قووڵ و قورس و تەماوییە. مەگەر مامۆستای گەورەم مارف خەزنەدار خۆی نهێنییەکانی ئاشکرا بکا، بەڵام ئەمە نەکا چاکترە. پیرۆزبایم بۆ خۆی و هەموو خوێنەرێکی کورد."»(۱۰)

لە پرۆژە گەورە و گرنگەکەیدا؛ "مێژووی ئەدەبی کوردی"، لە بەرگی حەوتەمدا، لەنێو ئەو شاعیرە نوێگەرانەی کە لە پاش "گۆران"ەوە دەستیان بە نووسین کردووە و جێپەنجەیان دیارە، د. مارف خەزنەدار چەند ناوێکی کەمی بەسەر کردووەتەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ بەرهەمەکانیان کردووە، یەکێک لەوانە دڵشاد مەریوانییە. بێگومان هەم هەڵبژاردنەکەی د. مارف و هەم ناوی دڵشادیش لەو پرۆژە گەورەیەدا، تەواو لە جێی شیاو و شایستەی خۆدان.

ڕەنگە یەکێک لەو کارە دانسقانەی زیادتر لە هەر شت پەیوەندیی هاوڕێیانەی ئەم دوو نووسەرە پێکەوە گرێ دەدات، ئەو کتێبە بێت کە لە ساڵی ۱۹۸۰دا و بە بۆنەی ئەوەی تەمەنی د. مارف خەزنەدار بووە بە پەنجا ساڵ، دڵشاد مەریوانی ئامادەی کردووە و نووسیویەتی و هێشتا بە چاپنەکراوی ماوەتەوە، بە وتەی عومەر مەعروف بەرزنجی کتێبەکە دەستنووسە و لای ئەو پارێزراوە، ناوەڕۆکەکەی پێکهاتووە لە کۆمەڵێک وتار دەربارەی ژیان و بەرهەمی د. مارف تاکو ئەو سەروەختە.

لەم نووسینەدا بە ڕێسای «مشت نموونەی خەروارە» کار کراوە و بەشێکی زۆر کەم لەو یادگار و نووسینانە بەسەر کراونەتەوە کە لە نێوان ئەم سێ نووسەرەدا ئاڵوگۆڕ کراون، مەبەستیش نەبووە کە هەڵسەنگاندن و لێکدانەوە بۆ هیچ کام لەو یادگار و نووسینانە بکرێن کە هاتوون، بەقەد ئەوەی کە هەوڵ دراوە لە ڕێی نووسین و هەندێک یادگار و یادەوەریی هاوبەشیانەوە، هاوڕێیەتیی نێوان د. مارف خەزنەدار بە هەریەک لە عومەر مەعروف بەرزنجی و دڵشاد مەریوانییەوە پێشان بدرێت، هاوڕێیەتییەک کە لەسەر بنەمای ڕاستگۆیی و خۆشەویستی ڕۆنراوە و بێدووڵی، سەرجەم ئەو نووسین و یادگار و یادەوەرییانەش کە لەم هاوڕێیەتییە بەجێماون، ڕادەی ڕاستگۆیی و خۆشەویستی دەردەخەن.

تشرینی دووەمی ٢٠٢٣


**سەرچاوە:**

**[١]: هەڤپەیڤینی ئازاد عەبدولواحید لەگەڵ عومەر مەعروف بەرزنجی، گۆڤاری ڕامان، ژمارە: ١٢٧، ٢٠٠٧/١٢/٥.**

**[٢]: زانای ئەدەبی کوردی... پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەدار، عومەر مەعروف بەرزنجی، بڵاوکراوەی ڕۆڤار، ژ: ٩٧.**

**[٣]: دوو وێستگەی پرشکۆ لە دیداری د. مارف خەزنەدار، کاوە حاجی عەزیز، بڵاوکراوەی ڕۆڤار، ژ: ٩٧.**

**[٤]لە یەکەم بینیندا! دوکتۆر خەزنەدارێکی جیاواز، دانا فایەق، بڵاوکراوەی ڕۆڤار، ژ: ٩٧.**

**[٥]: برایم ئەحمەد لە کارە زانستی و ئەدەبییەکانی پرۆفیسۆر د. مارف خەزنەداردا، عومەر مەعروف بەرزنجی، چاپخانەی شڤان، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٤.**

**[٦] :د. مارف خەزنەدار لە گۆڤاری ڕاماندا، ئامادەکردنی: ئازاد عەبدولواحید، بەرگی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠١٨.**

**[٧]: هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

**[٨]: سەمفۆنیای وەنەوشە، دڵشاد محەممەدئەمین، ١٩٨٠.**

**[٩]: ئەرشیفی نامەکانی مارف خەزنەدار، کۆکردنەوە و ئامادەکردن و پەراوێزنووسینی: بنیاد خەزنەدار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئام، چاپی یەکەم ٢٠٢٣.**

**[١٠]: کوردیادە، مارف خەزنەدار، چاپخانەی ڕۆشنبیری، چاپی دووەم، هەولێر ١٩٩٨.**



***سوپاس بۆ هەردوو بنەماڵەی د. مارف خەزنەدار و شەهید دڵشاد مەریوانی، سوپاس بۆ مامۆستا عومەر مەعروف بەرزنجی، کە لە دەستخستنی هەندێ لەو نووسین، وێنە و یادگارانەی لەم وتارەدا هاتوون، هاوکارییان کردم.**






# ماڵئاوا دکتۆری برا گەورەم ماڵئاوا

ئەحمەد حوسێن ئەحمەد



**سلێمانی ١٩٩١**
**دانیشتوان، لە ڕاستەوە: مەحموود تۆفیق، ئەحمەد حسێن، مارف خەزنەدار**
**ئەوانەی بەپێوەن، لە ڕاستەوە: بنیاد خەزنەدا، سیامەند هادی**

تەمەنی یەکترناسین و هاوڕێیەتیمان ٤٢ ساڵە. لەو دەمەوە جۆگەلەی خۆشەویستی نێوانمان بوو بە ڕووبار، ڕووباریش بوو بە دەریا، ئاوابوون نەیهێشت درێژە بەو تەمەنە بدرێت.

مامۆستا ئازاد عەبدولواحید ڕۆژی ٢٠١٠/١٠/٢٤ تەلەفۆنی بۆ کردم کە دکتۆر مارف خەزنەدار زۆر نەخۆشە و لەوانەیە هەڵنەسێتەوە، منیش بۆ بەیانی شەممە سەعات یەکوچارەکی دوانیوەڕۆ گەیشتمە شاری هەولێر و سەردانیم کرد، زۆر پێی خۆش بوو، نزیکەی سەعاتێک لەلای مامەوە، ڕوانیم قەڵەمێکی بەتەمەن و چالاک ڕاژەکانی کورد، لە دوولا کۆستی کەوتووە، خێزانە بەئەمەک و بەڕێزەکەی، کە هەمیشە خەمخۆری خۆی و کتێبخانە و کەس و میوانەکانی بوو، هۆشی بەسەر دنیاوە نەماوە و خۆیشی بەتەنیا لە ژوورێکدا لەسەر قەرەوێڵەیەک ڕاکشاوە و هێز و گڕوتینی تێدا نەماوە، تەنیا باوەشێنێکی بە دەستەوە بوو، هێواش هێواش دەموچاوی خۆی پێ فێنک دەکردەوە، لە دوورەوە فرمێسکم بۆ ڕشت، ماوەیەک دەستم لەناو دەستیا بوو، هەناسەی سارد بەر گوێم دەکەوت.

وتی باش بوو هاتیت، بیرم دەکردی، حەز ناکەم بڕۆیتەوە، ئێرە وەک دیوەخانی نووسەران و خۆشەویستان وایە، داخەکەم کارەساتی ئەم نەخۆشییە ڕەشە بێئامانە تەنگی پێ هەڵچنیوم، جووڵەم نەماوە، ناتوانم هەقی خۆی بە میوان بدەم.

منیش گەڵێک دڵم دایەوە، وتم: خۆت و بەرهەمەکانت هەمیشە بە زیندوویی و گەشییەوە لە دڵ و ویژدانی ئەهلی قەڵەمدا دەژین. وتی: کاکە هەر دەست و دەمم نەختێ کار دەکەن، هەست دەکەم ئەوانیش بەرەو سستی و خاوبوونەوە دەچن، وا دیارە فڕم بەسەر ژیانەوە نەماوە، ئەگەر ڕۆیشتیتەوە بۆ سلێمانی سڵاوی من بگەیەنە بەوەی دەمناسی و هەواڵم دەپرسی، بە هەموو نووسەران و شاعیران و ئەدەبدۆستان، مەمنوونی هەموو دڵسۆزێکی کورد و وشەی کوردیم.

ئینجا کاکە بنیاد خەزنەداری کوڕی ١٥٠ دانە لە کتێبی بیرەوەریی "ڕۆژگاری من" بەرگی پێنجەمی هێنا، دکتۆر فەرمووی بیانبە بۆ کتێبخانەی سلێمانی و رادەستی کاک عومەر عەبدولڕەحمانی بکە، دانەیەکیشی بە دیاری دا بە خۆم لەبری باوکی، بنیاد مۆری لێدا، دکتۆر توانای گرتنی قەڵەمی نەبوو، داوای لێبووردنی کرد. ئینجا دەورەیەک لە چاپی "مێژووی ئەدەبی کوردی" بۆ دانابووم



وەرمگرت، منیش دوای سوپاس هیوای چاکبوونەوە بۆ بەرێزی، لەگەڵ کاک بنیاددا بیرەوەرییەکانم خستە نێو سەیارەکەوە، ئەوێمان بەجێهێشت و بۆ سەعات چواروونیوی هەمان ڕۆژ کتێبەکانم گەیاندە کتێبخانەی سلێمانی و یەکسەر تەلەفۆنم بۆ کرد، کە کتێبەکان گەیشتوونەتە جێ و خراونەتە بەرچاوان. زۆر دڵخۆش بوو، ئافەرینی لێ کردم. منیش وتم: دکتۆر ئامادەم بۆ هەموو خزمەتێکت لەپێناوتا، خوا حەز بکا بەم زوانە سەردانت دەکەمەوە.

بەڵام بەداخەوە ئەو گەورەپیاوە، ئەو قەڵەمە هێمن و بەفەڕ و ڕانەوەستاوە، خاوەنی ئەو هەموو خەرمانە بەرهەمی ئەدەبی و فیکری و ڕووناکبیری و ئەرشیفە و خاوەنی ئەو زمانە پاراووە، خاوەنی ئەو هەستە گەرموگوڕە، شەوی ٢٠١٠/١٠/٢٥ دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت، کە هێشتا ئاواتەکانی بەتەواوی نەهاتبوونە دی، چەند مەڵۆیەکی تری هەمەجۆری نووسینی هەبوون بەچاپیان بگەیەنێ، مەرگ ڕێی پێ گرت، کۆچی دوایی کرد، بە جەستە بەجێی هێشتین بەڵام بە گیان میوانی هەموو نووسەر و شاعیر و دڵسۆزێکی ئەم نەتەوە دڵداخورپاوەیە، خوات لەگەڵ ئەی خۆشەویستی وشەی کوردی، گیانت بە بەهەشتی جاویدانی شادبێت.

### کسپەی سەرنانەوەیەك

چاوەڕوانم بووی هاتم تۆم بینی
تێگەییم دەنگت نەیماوە تینی
بەس باوەشێنێک ئاوەڵی تۆ بوو
وتم: زۆر قووڵە، ئەیب، برینی

***

بە کۆچکردنت دڵم داچڵەکی
پەیکەری شادی هەستم هەڵتەکی
گەلێ دەربەستبووی بۆ وشەی زیندوو
نیو سەدە پتر ژیای لەتەکی

***

قەڵەم و بەرهەم لە ڕاژەی گەلدا
لەگەڵ هەڵۆیستا زۆر سەریان هەڵدا
بوون بە سەرمایە بۆت لە ژیانا
لەلای ئاسۆدا، هەواریان هەڵدا

***

بنوو خەزنەدار، کەس پێت نالێ مرد
بەرهەمەکانت وەک تەمەنی کورد
بەرگی شانازی دەپۆشن خێرا
دەبنە ئاوێنە بۆ درشت و ورد

چیرۆکی(بووکەشووشە)ی مارف خەزنەدار، دوو گێڕانەوە یەکتر تەواو دەکەن، چەقی گێڕانەوەکە ڕووی لە نمایشێکە لە ئازار و دابڕان، خەمی نان و هەواڵی مەرگی ئازیزان، بە مانایەکی دیکە، خۆبەیانکردن و گوزارشتکردن لە ڕابردوو، پلۆتی چیرۆکەکە بەرە پێشەوە دەبات. دوو کارەکتەر هەریەکە و ژیانی تاڵی خۆی بۆ ئەوی دیکە باس دەکات، ئەم باسکردنە وەک هەڵدانەدەرەوەی ئازار وایە، وەک ئەوەی سایکۆلۆژیستەکان دوای جەنگ، بۆ هەلاتن لە کاریگەریی شۆک و تراژیدیا وەک چارەسەر بۆ نەخۆشەکانیان بەکاریان دەهێنا. ژیانی سەردەمی جەنگ و قاتوقڕی، سەردەمی مرۆڤخواردن، سەردەمی تاریکترین ڕۆژەکانی جەنگ بە درێژایی گێڕانەوەکە دەخرێتە ڕوو.

نووسەر و هونەرمەندان لە دوای جەنگی دووەمی جیهان، لە نووسین و کارە هونەرییەکانیاندا فۆکەسیان خستە سەر کێشە سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتییەکان، بابەتی ئەدەب و هونەر بووە گەڕانەوە بۆ ناو بازنەی گرفت و کێشەکانی تاک لە ناو خێزان و کۆمەڵگەدا. تراوما، وەک نەخۆشییەکی ترسناک و سێبەر لەگەڵ مرۆڤەکاندا مایەوە، چەقی پرسوباسی ڕۆژ، لە سیاسەت دوور کەوتەوە، ڕوانگەی ئێستاتیکی بۆ تێکست بایەخی زۆرتری پێدرا.

ئەدەبی دوای جەنگ، ئەدەبێکە گوزارشت لە ناوەوەی ئەو مرۆڤانە دەکات کە لە جەنگ گەڕاونەتەوە، باس لەو شارانە دەکات، کە جەنگ وێرانی کردن، چیرۆکی ئەو خێزان و کەسانە دەگێڕێتەوە، کە بەهۆی جەنگەوە دەربەدەر بوون. قسەکردن لەسەر پاشماوەکان، لەسەر ئەو کەلاوانەی وەک پێشەنگەیەکی ترسناک بوونە بەڵگە لەسەر بەربەرییەتی مرۆڤ، جەنگ لە دوای خۆی تراومایەکی فراوانی پەخشی ناو کۆمەڵگە کرد. بەشێک گێڕانەوەکان گوزارشتیان لە دۆخی خێزانە

لێک هەڵوەشاوەکان و تاکە سەرگەردان و لێکدابڕاوەکان دەکرد. کاریگەرییەکانی دوای جەنگ بۆ ماوەیەکی درێژ بە ڕوخساری مرۆڤایەتی مایەوە، هەروەک ئەوەی کارەکتەری سەرەکی (مادی) لە فیلمی (ئەڵماسی خوێن) دەڵێت: باوکم کە لە جەنگ گەڕایەوە، بیست ساڵی ویست تا ئاسایی بووەوە.

زەمەنی نووسینی چیرۆکەکە، هاوکاتە لەگەڵ کەمبوونەوە و کاڵبوونەوەی فشار و سانسۆڕی سەر نووسەرانی ڕووس بە گشتی، هەندێ لە توێژەران ئەم قۆناغە کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٠ دەست پێ دەکات، بە قۆناغی گۆڕانکاری و کرانەوە ناو دەبەن، چونکە ئەو بەربەست و لە قاڵبدانەی نووسەران بەرەو کەمبوونەوە چوون، بەتایبەت لەو قۆناغەی کە بە سەردەمی خرۆشۆف ناسراوە.

لە ڕوانگەی تەکنیکییەوە، گێڕانەوەکە بە پەرەگرافێکی گوتاریی دەست پێ دەکات، گوتار بە مانای پەیامێکی ڕاستەوخۆ لە دەرەوەی گێڕانەوەکە. لەو پەرەگرافەدا ئاماژەیەکی ڕوون هەیە، کە جەنگ کاری پیاوە، پیاو پیاو دەکوژێت، ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت، ژن و منداڵان دەبنە قوربانی، یان بڵێین خێزان دەبێتە قوربانی سەرکێشییەکانی پیاو. دەکرێ پیاوان لە جیاتی شەڕ و کوشتن، بە کارگەی دروستکردنی بووکەشووشە و عەترەوە سەرقاڵ بن. ئەم ئاماژەیە کە لە سەرەتای چیرۆکەکە هەیە، ڕاستەوخۆیە، دەکرا لە ڕێگەی چیرۆکەکەوە، لە ڕێگەی نیشاندانەوە ئەم پەیامەمان پێ بگات، نەک بە گوتنی ڕاستەخۆ، بەڵام ئەم فۆرمە لە چیرۆک، پێوەندی بە کات و شوێنی نووسینی چیرۆکەکەوە هەیە. باسکردن لە بووکەشووشە وەک مێتافۆر، لە زەمەنێکەوە بۆ زەمەنێکی دیکە، ئەو منداڵەی بەهۆی جەنگەوە بێبەش دەبێت لەوەی بووکەشووشەیەک لە باوەش بگرێت، لەگەڵ ئەو دایکەی بەهۆی جەنگەوە بێبەش دەبێت منداڵەکەی لە باوەش بگرێت، ئەو منداڵ و دایکە بە تێپەڕینی زەمەن، لەناوەوە تێکدەشکێن، ئیدی کە گەورە بوون، ئەو ساتانە نە دەگەڕێنەوە و نە جێی برینەکان سارێژ دەبێت. تاکە شتێک مرۆڤ پەنای بۆ دەبات، خۆدانە دەست هێزی خەیاڵ و سڕینەوەی ئەو یادەوەرییانەیە، ئەگەر ئەم هێزە جادووییەی خەیاڵ

نەبێت، مرۆڤ قاچی لە برینی ئەو یادەوەریانە گیر دەبێت و کۆتایی بە هەنگاوەکانی دێت.
چیرۆکەکە بە گێڕانەوەیەکی دراماتیکی دەچێتە پێشەوە، کە دیالۆگ ڕۆڵی گرنگی پێدراوە. گێڕانەوەکە دژ وەستانەوە نییە بەرانبەر بە واقیع و هیچ لادانێک و هەڵگەڕانەوەیەک نابینین، ئەو واقیعەی کە هەیە لە ڕووداو و بابەت درێژەی هەیە، ئەوە خاڵێکی گەش نییە بۆ گێڕانەوەی هونەری، ڕوون دیارە، نووسەر زیاتر بایەخی بە بابەت داوە. میتافۆرەکان زۆرن، زەقترینیان لە گۆکەوتنی منداڵێک لەسەردەمی جەنگدا و چاکبوونەوەی دوای کۆتاییهاتنی جەنگ. بووکەشووشە لە دوو زەمەنی جیاوازدا، ئاماژەیە بە پێوەندی نێوان کات و بەهایی ئەو شتانەی بۆمان گرنگن و مانایەک بە ژیانمان دەبەخشن.
دیارترین چیرۆکنووسی جیهان و ڕووسیا بە تایبەتی لە سەدەی نۆزدە، ئەنتۆن چیخۆفە، بێگومان سێبەر و کاریگەریی چیخوف بەسەر خەزنەدارەوە دیارە، گێڕانەوە فۆرمێکی نوێخوازانەی هەیە، ڕاستە چیرۆکەکە کرۆنۆلۆژیانە دەچێتە پێشەوە، بەڵام لە کۆتاییدا نووسەر بەهرەمەندانە مامەڵەی کردووە، دەکرێ بڵێین، خاڵی گەشی گێڕانەوەکە، کۆتایی چیرۆکەکەیە، کە کۆتایی کراوەیە. ئێمە هیچ لەبارەی کۆتایی ئەو پێوەندی و یەکترناسینەوە نازانین.
هەروەها هاوشێوەی زۆرینەی چیرۆکەکانی چیخۆف، زۆر شت لە چیرۆکەکە نەوتراوە و بۆ خوێنەر جێهێڵدراوە. هەروەها یارییەک لە نێوان ڕاناوەکان هەیە، کاتێ کچەکە و کوڕەکە قسە دەکەن، لە سەرەتاوە نازانین کامیانە، تا تەواو دەچینە قووڵایی ڕووداوەکان، ئینجا لە ڕێگەی ئاماژەکانەوە دەزانین گێڕەرەوە کێیە.
خەزنەدار لە ساڵی ١٩٦٤ لە لینینگردا، ئەو کاتەی قوتابی دکتۆرا بووە، چیرۆکەکەی نووسیوە، نووسەر لە سەرەتای تێکەڵبوونیدابووە لەگەڵ کولتوور و ئەدەبی ڕووسی. لەو سەردەمدا، نووسەر زۆر کاریگەربووە، بە ئەدەبی ڕووسی و ئەدەبی جیهانی بەگشتی، چیرۆکەکە هیچ ئاماژەیەکی تێدا نییە، تا ئێمە وا بزانین ئەمە کوردێک نووسیویەتی، هەرکات ئەو چیرۆکە وەرگێردرا بۆ زمانێکی دیکە، کە من وا هەست دەکەم چیرۆکەکە خۆی لە سەرەتادا بە ڕووسی نووسرابێت، چونکە ئێمە هەست ناکەین لە بەردەم چیرۆکێکی کوردیداین، یان بڵێن کوردێک ئەم چیرۆکەی نووسیوە، تەنانەت زمانی چیرۆکەکەش زۆرتر بە وەرگێڕان دەچێت. هەڵبەت من لەگەڵ ئەوەدام ئێمە برەو بە ئەدەبی ئینسانی بدەین و لە ئەدەبی ئایدۆلۆژی دوور بکەوینەوە. پرسیارەکە ئەوەیە ئایا خەزنەدار هەوڵی داوە چیرۆکێک بنووسێت کە ڕووسییەک خوێندییەوە، خۆی تێدا ببینێتەوە؟ ئایا نووسەر لەو سەردەمدا هەوڵی داوە جیهانیانە بنووسێت؟ ئاماژەکە ڕوونە، چونکە ئەو نەهامەتیانەی جەنگی دووەمی جیهانی بەم تۆخییە لە کوردستان ڕەنگدانەوەیان نەبووە، بۆیە ڕووی چیرۆک لە خوێنەری کورد نییە. جەنگ تێمایەکی گشتییە، بەڵام گێڕانەوە و میتافۆری ناو چیرۆکەکە، شوێن، کات و کارەکتەر هەموویان لە ڕووسیادان، کاریگەربوونی نووسەر بە سەرهات و کارەساتی کۆمەڵگە و خێزان و تاکی ڕووسی لە جەنگدا، وایان کردووە وەک ڕووسییەک هەست بە ئازار و نەهامەتییەکان بکات. ڕەنگە ئەگەر دەسکاری زەمەن بکەین و وای دابنێین، ئەم چیرۆکە دوای ڕاپەڕین نووسراوە، ئایا نووسەر باسی ئازاری ئەنفال و کیمیاباران و وێرانکردنی گوندەکانی کوردستانی دەکرد یان هی کۆمەڵگەی ڕووسی؟





۳۱ی مارتی ۱۹۸۰، هۆڵی وەرزشی سەندیکای کرێکاران لە سلێمانی، لە کۆبوونەوەیەکی ڕۆشنبیریدا
لە ڕاستەوە: ڕەووف بێگەرد، مارف خەزنەدار و شێرکۆ بێکەس.








۱۹٦۸/۷/۲٦ بەغدا
لە ڕاستەوە: محەمەد ساڵح دیلان، مەحموود زامدار و مارف خەزنەدار






بەندیخانەی ناوەندی بەغدا، ١٩٤٩

لای ڕاستەوە: مارف خەزنەدار، هونەرمەند حەمەی بەکر

حەمەی بەکر یەکێك بووە لە دەنگخۆش و گۆرانیبێژە میللەکانی شاری سلێمانی، وێڵی بیری نیشتمانی و کوردایەتی بوو. هەردووکیان لەسەر جموجووڵی سیاسی و بەشداری لە خۆپیشاندانـدا، دەستگیر کراون.



**سلێمانی، سەرچنار ١٩٧٠**

**لای ڕاستەوە: هێمن، محەممەد ساڵح دیلان، ئیحسان فواد، محەممەد مەولوود (مەم) و مارف خەزنەدار**








**جەمال خەزنەدار، عەبدوڵڵا پەشێو و مارف خەزنەدار**



لەگەڵ یەکتر دڕن چەشنی هەڵۆ
یەک دادەپاچن بۆ؟
لەبۆ غەیرە شێرن چەشنی پەڕۆ
وەک دەستەوقاچن بۆ؟
هەزارتیرە و لەک و هۆزن وەکو
دوژمنی لە یەک ناچن؟
ئەترسم ڕۆژێ لەم خاکە هەموو
تیا چن وەکو سمکۆ؟

بەشیر موشیر
٢٧ شوبات ١٩٨١




هەڵبەستێکی بەشیر موشیر بە دەستخەتی مارف خەزنەدار

ژمارەی داهاتووی ڕۆڤار تایبەتە بە:

# ئایشە شان

